# دیوانی

# شەریف وەزیر



## کۆی شیعرەکانی

(2015-1985)

# دیوانی

# شەریف وەزیر

## کۆی شیعرەکانی

(١٩٨٥ - ٢٠١٥)

١٤٣٧ کۆچی/ ٢٧١٥ کوردی/ ٢٠١٦ زایینی

# دیوانی

# شەریف وەرزێر

کۆی شیعرەکانی (١٩٨٥ ٢٠١٥)


- نووسەر: شەریف وەرزێر
- بابەت: شیعر
- تایپ: گۆران عوسمان، دانا ئەحمەد، پێشەوا حەمەد، شەریف وەرزێر
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ڕەوشت مەحەمەد
- خەت: نەوزاد کۆیی
- نۆرەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- شوێنی چاپ: چاپخانەی شڤان - سلێمانی
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن (٨٦١)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

## سوپاس و پێزانین

وێـڕای سوپاسـی شـایان و بـێ پایـان، بـۆ خـوای پـەروەردگاری میهرەبـان، پـڕ بـە دڵ سـوپاس و پێـزانینی خۆم، بۆ هەموو ئەو بەڕێزانە دەردەبڕم، کە: ئامۆژگـاریی و ڕێنومـایی، پێـشنیاز و ڕەخنـە، هانـدان و دەستخۆشـی، یاخود هاوکاری و دەسـتباربۆگرتن و زەحمەتکێـشانێکیان، لەو تەمەنە پڕ لـە هـەوراز و نـشێوەی ژیانمدا، لـە هەمبـەر بەنـدە و چـاپ و تۆمـار و بڵاوکردنـەوەی شـیعر و بەرهەمەکانمدا هەبووە و لە گـەورەیی و جـوامێریی و ڕێـز و دڵـسۆزیی خۆیانـەوە، دڵـسۆزیی و بەخەمـەوەبوون و پەرۆشیان نیشانداوە، خوای گەورە لە دنیـا و دوارۆژدا، بـە چـاکترین شـێوە پاداشـتیان بداتـەوە و، بیانخاتـە هـەواری بەختـەوەریی و نەجاتـەوە و، بـەردەوام دەرگاکـانی خێـر و خۆشییان بەڕوودا بکاتەوە.

## پێشکەش بێ بە:

* هەموو ئەوانەی لە سەر و خوار و هەوراز و نشێوەکانی ژیانمدا، شتێکیان لێوە فێربووم و پێیەوە هەنگاوێك بەرەو رۆشنایی و چاکە و خێر چووم.

* هەموو ئەو هاورێ و هاوسەنگەرانەی، رۆژە سەختەکانمان بە هاورێیەتی گیانی بەگیانی و رێز و وەفاوە، بەیەکەوە بەرێ کردوون، بە تایبەتی ئەوانەی شەهید بوون و بە رەحمەتی خوا چوون و مردوون.

* ئەوانەی هەمیشە لەگەڵ راستیی و رەوایی دا ژوان دەبەستن و، بەیادەی هەقیقەت مەستن و، تاسەر ئێسقان لە خراپە و خواریی پەستن و، ئەگەر توشی هەڵە و هەڵنگوتنیش بوون، بۆ پەشیمان بوونەوە و هەستانەوە، تێناوەستن.

* نەتەوەکەم، کە هەمیشە خزمەت پێکردن و پارێزگاری لێکردنی، بە خواپەرستی دەزانم.

* پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان.

* دایك و باوك و خوشك و برا و خزمانم.

* هاوسەر و منداڵەکانم (بەسەخانێ حاجی زودی رەحمەتی و رابوون و پەیرەو و راوێژ و خەلات و مەحەممەد) کە زۆرجار بەهۆی ئەرك و سەرقاڵیم بەم شیعر و بەرهەمانەوە، بەناچاری نازی پێویستم نەداونێ و نەمتوانیوە وەلامی هەموو خواست و پرسیارێکیان بدەمەوە، هەروەها (زەنوێر)ی کچی نۆبەرە و ساوای کۆچکردووم.

# پێشەکی
## بە قەڵەمی مامۆستا عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد ومن اهتدى بهداه

ئەمشەو ۲۹/۳۰ی ۱٤۳۷/۱ ک بەرانبەر ۱۲/۱۱ی ۲۰۱۵/۱۱ز کاک شەریف وەرزێر سەردانی کردم و لەبارەی چاپکردنی شیعرەکانیەوە کە بەشێکیان لەساڵی (۱۹۹۸)دا لەژێر ناوونیشانی (مەدالیای کوردستان)دا چاپ و بڵاوکراونەوە قسەو باسمانکرد و داوای لێکردم کە پێشەکییەک بۆ کۆی شیعرەکانی- کە لەژێر ناوونیشانی (دیوانی شەریف وەرزێر)دا چاپیان دەکات- بنووسم، دیارە منیش یەکسەر داواکەیم قبووڵکرد، هەرچەندە وەک گوتراوە: ((سەرێکە و هەزار سەودا)) چونکە کاک شەریف وەرزێر- وێڕای ئەوەی کە شیعرەکانیم زۆر بە دڵە و تام و چێژێکی تایبەتییان لێ دەکەم- مافی زۆریشی بەسەرمانەوە هەیە کە پێموایە گرنگترینیان ئەوەیە کە کاتی خۆی لە قۆناغی پێشمەرگایەتی و خەباتی شاخدا، فیداکارێکی ماندوویی نەناس و بێ دریغ و، مشوورخۆرێکی کارامە و لێزانی گەلێک ئیش و کارمان بوو. یەکی دیکەش ئەوەیە کە هەتا ئێستا لە دوو بەرگی گەورەدا، یەکەمیان لەگەڵ چەند برایەکی دیکەو دووەمیشان تەنها خۆی، لەژێر ناوونیشانی: (ئەستێرەکانی ترۆپکی سەروەریی)دا کورتەیەک لە پێناسە و سەرگوزشتەی (۳۵۰) کەسی لە شەهیدە سەربەرزەکان ئامادە و تۆمارکردووە، هەروەها گەلێک کار و چالاکی دیکەش کە هەرکامێکیان مایەی مافێکی گەورەیەتی لەسەر ڕابوونی ئیسلامیی بەگشتی و، کۆمەڵی ئیسلامیی بەتایبەت. دیارە

ویستیشم لەم پێشەکییەدا ئاماژە بە چەند شتێک بکەم، هەم لەبارەی شیعر و شاعیرانەوە بەگشتی و، هەم لەبارەی کاک شەریف وەرزێر و شیعرەکانییەوە، بە تایبەت، بەڵام کەزانیم ئەو پێشەکییەی کاتی خۆی لە: ١٠ی جەمادی دووەمی ١٤١٩ک بەرانبەر ٣٠ ی ئەیلوولی ١٩٩٨دا، بۆ مەدالیای کوردستان نووسیومە، لەم دیوانەشدا لەشوێنی خۆی دایدەنێتەوە، بەوەی لەوێ دا گووتومە، وازم هێنا، بۆیە لێرە هەر بە کورتی ئاماژە بۆ دوو مەسەلان دەکەم:

**یەکەم:** بێگومان قسە و هەڵوێست و ڕەفتاری مرۆڤ، هەڵقوڵاو و دەرهاویشتەی کەسایەتییەتی، چونکە: (گۆزەچی تێدابێ، هەر ئەوەی لێ دەڕژێ) بۆیە هەرکەس بیەوێ دەرهاویشتە و دەرەنجامی چاکی هەبن لە بواری دوان و کردەواندا، پێویستە مشووری بەهێز و پێزکردنی کەسایەتیی خۆی بخوات، لە ڕووی: ئیمانیی و فیکریی و ڕووحیی و ئاکاریی و ...هتدەوە.

**دووەم:** ئیسلام کە ئایین و بەرنامەی سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (صلی اللهعلیهم وسلم) بووە، لە ئادەمەوە هەتا خاتەم، دەتوانین بڵێین: بۆ هێنانەدی دوو ئامانجی مەزن هاتوە، کە یەکێکیان پەیوەندیی بەنێوان مرۆڤەکان و خوای بەرز و مەزنەوە هەیە، کە بریتییە لە: تەنیا پەرستنی خوا (توحید الله في عبادته) وەک خوا عزوجل فەرموویەتی: (**وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ**) الأنبياء -٢٥- واتە: وە لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە، کە بێجگە لەمن هیچ پەرستراوێک نییە، تەنیا من بپەرستن.

ئەوی دیکەشیان پەیوەندیی بەنێوان مرۆڤەکان خۆیانەوە هەیە، کەبریتییە لە: بەڕێوەچوون بە دادگەریی (القیام بالقسط) وەک خوای دادگەر فەرموویەتی: (**لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ** ...) الحدید -٢٥-، واتە: بە دڵنیایی سەرجەم پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوون و (کتێب) (بەرنامە)شمان لەگەڵ ناردوونەخوارێ، تاکو خەڵک بەدادگەریی بەڕێوەبچن... ئنجا بینا لەسەر

ئەوەی ڕابرد دەڵێم: پێویستە هەر مسوڵمانێک کە دەیەوێ قسە و لێدوان و شیعر و پەخشان و کردەوە و هەڵوێستەکانی، ڕەگ و ڕیشە و نەفەس و تام و چێژێکی ئیسلامییانەیان هەبێ، ئاگاداری ئەو دوو ئامانجە سەرەکییەی پەیام و بەرنامەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بێ و، لە بەرهەمەکەیدا ڕەنگ بدەنەوە، کە پێم وایە بەو پێوەر و تەرازووە، شیعرەکانی کاک شەریف وەرزێر تا ڕاددەیەکی باش ئیسلامییانە و ڕەسەنن. خوا ئەم بەرهەمەی کاک شەریف بە باشترین شێوە قبووڵ بفەرموێ و پاداشتی بداتەوە، کە بەرهەمی ماوەیەکی سی (٣٠) ساڵەیی تەمەنیەتی و هەرکام لە شیعرەکانی، هەڵقوڵاوی ئێش و ژان و موعاناتێکی تایبەتە، تەمەنیشی پڕ بەرەکەتتر بکات و بۆ کار و بەرهەمی باشتریش هاوکار و هیدایەتدەری بێ.

**سبحانک اللهم و بحمدک، أشهد أن لا اله الا أنت أستغفرک و أتوب الیک**

**عەلی باپیر**
**٣٠ی موحەڕڕەمی ١٤٣٧ک**
**١٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٥ ز**
**هەولێر**

# پەیڤێك
# بە قەڵەمی مامۆستا مستەفای سەید مینە

## بەناوی خواوەندی میری مەزن

لەکەس شاراوە نییە کە ئێستا شیعری کوردیی لە قەیرانێکی گەورە دایەو، بەو هۆیەشەوە تەواو لە خەڵک دابڕاوە.. تەنانەت زۆربەی شاعیران و ئەدەبدۆستان بەینیان دەگەڵی نییە، وای لێ هاتووە شاعیرێکی وەکوعەبدوڵڵا پەشێو، کە جێدەستی لە داهێنان و نوێکردنەوەی شیعری تازەدا دیارە، بڵێ: شیعری نوێ ناخوێنمەوە! ئاخر زۆربەی ئەو شتانەی ئەمڕۆ خۆیان دەئاخننە نێو جوغزی شیعرەوە، لەڕووی چەمک و نێوەڕۆکەوە لە بۆشییدا دەسوڕێنەوەو کەس تێیان ناگات، لەڕووی روخساریشەوە، دندووک و پەڕو باڵی کێش و سەروایان هەڵوەریوە و، وەکو حوشترمەل زەمینگیر بوو ون و ناتوانن بەرەو هەست و سۆزی خوێنەر بفڕن، کار گەیشتۆتە ئاستێک، (شیعر!)ی یەک ڕستەیی و، تەنانەت یەک وشەییش سەری هەڵداوە و، هەشە بەناوی نوێکارییەوە بە داهێنانی دەزانێت!

دیارە لەنێو دەقە بێ کێش و سەرواکاندا، هەندێکیان بەرز و تۆکمەن، بەڵام ئەوانە بەناوی شیعریشەوە بنووسرێن، پەخشانن و بەشیعر ناژمێررێن.

جا ئەگەر لە ڕەوشێکی ئاوادا، چەند دەقێک سەرهەڵدەن کە لەگەڵ سەلیقە و چەشەی ئەدەبی خوێنەردا بێنەوە، با لەڕووی هونەریشەوە سادە و ساکاربن، ئەوە دەبنە کوڕی تەنگانە و هەڵەمووتی نێو چیا و داربەڕووی نێوگیا و ، ئۆقرە و ئۆخژن و ڕووناکایی دڵ و چاوی ئەدەبدۆستان و، ئومێدی وەجاخڕوونیی شیعری کوردیی.

هەڵبەت ئەو دەقانە لە دوو سەرەوە ڕەسەن و بەجێن، لەلایەکەوە خۆیان لە لافاوی شلوێی چاولێکەریی لاداوە و، سەربەخۆ و باوەڕ بەخۆن، لەلایەکی دیکەشەوە، هەرچۆنێک بێت، گەیشتوونەتە هەواری شیعر و، شیعر ناس و ئەدەبدۆستان دڵی خۆیان بۆ دەکەنەوە.

شیعرەکانی کاک (شەریف وەرزێر)یش لەو دەقە ڕەسەن و دڵگیرانەن، کە هەر زوو سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن و بۆ خوێندنەوەیان پەلکێشی دەکەن، کە ئەوەش بۆ وێنەی هونەریی جوان و کێش و سەروای سوار و مەبەست و نێوەڕۆکی جێی بایەخی خەڵک دەگەڕێتەوە، ئەوە سەرباری وشە و دەربڕینی ڕەسەن و زمانی پاراوی سەرنج ڕاکێش، کە دەقەکانیان خەملاندوون و وایان کردووە هێندەی دی بە دڵەوە بنووسێن.

لەخوام داوایە خامەکەی هەر بەبڕشت بێت و، بەرهەمی جوانتری بەدوادابێت و، باخچەی ئەدەبی کوردییش بەردەوام بەوجۆرە گوڵانە برازێتەوە، شیعری کوردییش بە ڕاپسکان و تەکانی بەگوڕ، خۆی لەوگێژاوە قوتارکات و، وەکو جاران تاجی سەروەریی لەسەرنێت.

**مستەفای سەید مینە**

**٢٠١٥/١١/١٣**

**سەنگەسەر**

## چەند سەرەقەڵەمێك لە بارەی خۆمەوە

* نێوم (عوسمان)ی کوڕی (مەلا سەلیم)ی کوڕی (مەحەممەد)ی کوڕی (مامە شێخە)یەو دایکیشم نێوی (فاتیمە ئەحمەد خدر)ە، نازناوم (شەریف وەرزێر)ە، (شەریف)م لەگەڵ دەستپێکردنی ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە ١٩٨٧و (وەرزێر)یشم - کە بە مانای جوتیار، جوتێر دێت - وەك نازناوی شاعیریی هەر لە ١٩٨٧ بۆخۆ داناون و دواتر هەردوکیانم لێکداون.
* ساڵی ١٩٦٩ لە گوندی (قندۆڵ)ی سەر بە ناحیەی (ئیسێوە)ی قەزای قەڵادزێ و پشدەری هاوسنوور لەگەڵ ناوچەی (ئالان)ی سەردەشت، لە دایکبووم.
* تا پێنجی سەرەتاییم لە گوندی گەناو و شەشی سەرەتایی لە کۆمەڵگەی توەسووران و ناوەندیم لە سەنگەسەر و ئامادەیی پیشەسازیم لە ١٩٨٥-١٩٨٦ لە سلێمانی و پاشان دوای تەمەنێکی زۆر، بەشی شەریعەی کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی بەغدام لە ٢٠٠٧-٢٠٠٨ تەواوکردووە.
* لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری خۆپیشاندانی یادی ٢٤ /٤ ی قەڵادزێم کردووە و لە ١٩٨٣ شەوە لەگەڵ کاری ئیسلامییدا کەوتوومە گروگاڵ و لە

سـاڵی ١٩٨٧یـشەوە لەکۆمـەڵگای زۆرەملێـی (توووەسـووران)ەوە، رووم کردۆتە چیا و بوومە پێشمەرگە.

* لە ساڵی ١٩٨٢ەوە دەستم بەنووسینی شیعر کردووە، بەڵام لەزووربـەی شـیعرەکانی ئـەو سـەرەتایە تـا نزیکـی ١٩٨٤ رازی نـەبووم و ناچـار دەستبەرداری یەکتر بووین.
* ١٩٩١ لە (خدراوا)ی (میراوا)ی رۆژهـەڵاتی کوردسـتان، خێـزانم پێکـەوە ناوە و ئێستا (٢٠١٥) خاوەنی پێنج منداڵم.
* لە راپەڕینی ئازاری ١٩٩١دا لە پێشمەگایەتیەوە گەڕاومەوە کوردسـتان و بەشـداری راپـەڕینم کـردووە و لـە ٢٠٠٤ یـشەوە ئەنـدامی سـەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانم.
* دەگەڵ چەرمەسەرییەکانی ژیـان و ئـاوارەیی دا هێناومـە و لەرۆژهـەڵاتی کوردستان و هەولێر و خەلیفان و شوێنی تریش، ماڵم بە عەرزێدا داوە و پرێـسکەم لـێ کردوونـەوە و جـاری واش بـووە بـێ پرێـسکە سـەرم ناوەتەوە، شوێنی نیشتەجێبوونی سەرەکیشم لـە دوای راپەڕینـەوە تـا ئێـستا کـە (ناوەڕاسـتی مـانگی دوازدەی ٢٠١٥)یـە، رانیـەی دەروازەی راپەڕینە و بە قەولی پشدەریان: بەر دەربەند بووم!.

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانم لە پێش راپەڕین دا:

* تۆمارکردنی کۆمەڵە شیعرێك لە مانگی ١٢ی ١٩٨٧ لە قەڵاتووکان لەسەر کاسێتی تەسجیل لە رۆژانی پێشمەگایەتیدا.
* تۆمارکردنی کۆمەڵە شیعرێکی تر بەخوێندنەوە و بە سروودگوتنیان لە ساڵی ١٩٨٩ لەگەڵ (تیپی سروودی باوەڕ) لەسەر کاسێتی تەسجیل.
* چاپ و بڵاوکردنەوەی یەکەم بەرهەمم بەناوی (مەشخەڵی بەرەنگاری) لە (چاپخانەی شەهیدانی گردی رەمکان)ی هێزی (حەمزە) لە ساڵی ١٩٨٩.
* خوێندنەوە و بەسروود گوتنی بەشێکی بەرچاوی شیعرەکانم لە بۆنە جۆراوجۆرەکاندا، هەر لە ١٩٨٧ لە قەڵاتووکانەوە تا ١٩٩١ لەلایەن خۆم و (تیپی سروودی باوەڕ)ەوە.

## بەرهەمە چاپکراوەکانم لە دوای راپەڕین:

* بڵاوکرانەوەی چەندشیعرێکم لە نامیلکەی (شاعیرانی ناوسەنگەر) لە ئابی ١٩٩١ کە لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی راگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەوکات بوو و هەروەها بڵاوکرانەوەی چەندان دەقی شیعری و بابەتی جۆراوجۆر لە ژمارەیەك گۆڤار و رۆژنامەدا، وەکو: دەنگی باوەڕ، جەماوەر، سنوور، هەڵوێست، کۆمەڵ، مەشخەڵی راپەڕین.
* مەدالیای کوردستان – شیعر، ١٩٩٨– لە چاپخانەی سیما لە سلێمانی.
* جەولەیەك بەقوڵایی خاکی نیشتیماندا– مێژوویی (گێڕانەوەیەکی پێشمەرگانەیە) – ٢٠٠٩– چاپخانەی سیما لە سلێمانی، بەیەکەوە لەگەڵ بەڕێز(م. مەحەممەد زەرزی).

* کورتەیەك لە مێژووی یەکەمین کەناڵی تەلەفزیۆنی ئیسلامیی لە کوردستاندا – ٢٠٠٩ – سلێمانی.
* خۆشەویستیی خۆشەویست – شیعر– ٢٠٠٩ – لە نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە لە هەولێر.
* بەرگی دووەمی ئەستێرەکانی ترۆپکی سەروەریی، ٢٠٠٩ – لە چاپخانەی کوردستان لە سلێمانی، هەروەها بەشداریکردن لە بەرگی یەکەمیدا لە ساڵی ٢٠٠٧– لەگەڵ بەڕێزان (م. تۆفیق کەریم، ئارام عەلی سەعید، بارام مەحەممەد عەلی).
* راپەڕین و سەروەریی – مێژوویی – ٢٠١٠– لە چاپخانەی شڤان لە سلێمانی.
* رادیۆ و رادیۆی کوردی– مێژوویی و بابەتی – ٢٠١٠ – لە چاپخانەی چوارچرا لە سلێمانی.
* قەڵادزێ و تراژیدیا و هەرەسی دیکتاتۆریەت – شیعر – ٢٠١٢ – لە چاپخانەی کوردستان لە سلێمانی.
* کتێبی دیداری کۆساری، لێکۆڵینەوە – ٢٠١٤ – لە چاپخانەی کوردستان لە سلێمانی.

جگە لەمانە کۆمەڵێك شیعری منداڵانیشم ئامادەی چاپن.

# چەند سەرنجێکی پێویست

**یەکەم:** بێگومان لەگەڵ ئەو شیعرانەدا، کە هی ساڵانی (١٩٨٥–٢٠١٥)ن، واتە: خەرمانی (٣٠) ساڵ تەمەنن، بیرەوەریی تاڵ و شیرین و دژواریی و سەروخواری زۆر، پێکەوە کۆمان دەکەنەوە و گەلێك رۆژگار و رووداوم بیر دەخەنەوە و بۆلای زۆر خۆشەویست و شوێن و کات و سات دەمبەنەوە و پەردە لەسەر زۆر تابلۆی تەمەن هەڵدەدەنەوە، بۆیە هەموویانم خۆش دەوێن و نالی گوتەنی: بە (جگەرگۆشە)ی خۆمیان دەزانم.

**دووەم:** لە هەر شوێن و دێڕ و وشە و دەربڕینێکدا، هەڵەم کردبێ و نەمپێکابێ (کە دڵنیام بێ هەڵە و کەم و کورتی نین) داوای لێخۆشبوون لە خوای پەروەردگاری مەزن دەکەم و تکام وایە خوێنەری بەڕێزیش لوتف بفەرموێ و ئاگادارم بکاتەوە و، بەو دیاری یەوە، ئاوری دڵسۆزانەم لێداتەوە.

**سێیەم:** شیعرەکانم، چ ئەوانەی لەمەوپێش چاپیان بە چاوان بینیوە و چ ئەوانەی زەقەی چاوانیان بووە! دیارە کەم و زۆر لە بۆنە و کۆڕو ئاهەنگی جۆراوجۆردا، لە هەردوولایانم خوێندوونەوە و کەم کەمە تۆمارکراون، یاخود لە هەندێك گۆڤار و رۆژنامەدا بڵاوبوونەوە، بۆیە بە پێویستی دەزانم ئەوە بخەمە پێش چاوی خوێنەری بەڕێز، کە سەرچاوەی سەرەکی و راست و دروستی کۆی شیعرەکانم، ئیدی ئەم دیوانەیە.

**چوارەم:** لەرابردوودا بەشێك لە شیعرەکانم چاپ و بڵاوکراونەوە، بۆیە لەم دیوانەدا ناو و پێشەکی و ریزبەندی شیعرەکانی نێو ئەو بەرهەمە چاپکراوانەم، (جگە لە زیادکردنی پەراوێزەکان و هەندێك وردە دەسکاریی سادەی چەند شوێنێك) وەك خۆیان هێناونەوە و نەمتوانی دەستبەرداریان بم و ئەو رابردووە فەرامۆش بکەم و لەبیر خۆمی ببەمەوە.

**پێنجەم:** گرنگی تایبەتیم بە پەراوێزەکانی نێو ئەم دیوانە داوە و هەندێکم خۆ پێوە ماندووکردوون و ویستوومە لە بارەیانەوە کەمێك زانیاری بدەمە خوێنەری بەڕێز، هەر لەو روانگەشەوە فەرهەنگۆکم بۆداناوە.

**شەشەم:** دیارە لەمەوپێش بەشێکی ئەم شیعرانە، لەلایەن چەند هونەرمەند و تیپێکەوە، ئاوازیان بۆ دانراوە و گوتراون، یاخود خوێنراونەوە و دەستاودەستیان پێکراوە و لێرەولەوێ بڵاوبوونەوە، سوپاسیان دەکەم و دەستیان خۆش بێ، بێگومان بۆ لەمەودواش لەم رووەوە ئەم شیعرانە موڵکی گشتین و گرنگ ئەوەیە وەك خۆیان وەربگێردرێن و نەشەمزێنرێن و لە دوعای خێریش بێ بەشم نەکەن.

**حەوتەم:** لەم دیوانەدا و بەتایبەتی لە بەشی (مەدالیای کوردستان)دا، زۆر جار وشەکانی (جیهاد و موجاهید) کە بەمانای ( تێکۆشان و تێکۆشەر) دێن، دەکەونە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز، بێگومان ئەمە جگە لەوەی وەك هەقیقەت و بنچینەیەکی ئیسلامیی، مەسەلەی تێکۆشان بۆ بەگژداچوونەوەی ستەم و ستەمکاران حاشاهەڵنەگرە، بۆ ئەوساش واتە: پێش ڕاپەڕین کە ئەم شیعرانەی تێدا نووسراون، ساتە پیرۆزەکانی شۆڕش و خەبات و بەرەنگاریی بوون دژ بە ڕژێمی گۆڕبەگۆڕی بەعس و خۆشم پێشمەرگە بووم و بە گیانی پێشمەرگانە و بەرەنگاریی و تێکۆشانەوە شیعرم نووسیون و هەر ئەمەش وای لێکردووم یەکەم بەرهەمی چاپکراوم لە ساڵی ١٩٨٩ بە ناوی (مەشخەڵی بەرەنگاری)یەوە بڵاوبکەمەوە.

بێگومان ئەم گیانی تێکۆشان و بەرەنگارییەش جگە لەوەی بۆ هەموو نەتەوەیەکی ستەم لێکراو لە نان و ئاو و هەوا پێویسترە، بۆ ئێستای ئێمەی کوردیش زۆر پێویستە، با بڕوانین ئەگەر تێکۆشان و بەرگریی ئێستای پێشمەرگە قارەمان و تێکۆشەرەکانی کوردستان نەبایە، چ دەقەوما ! ؟.

لەلایەکی دیکەوە، وەك ستەملێکراوێك بۆ هاودەنگی لەگەڵ ستەملێکراوان – جا لە هەر زمان و نەتەوەیەك بن– جارجارە هەناسەی شیعرم تێکەڵی ئاهو ناسۆر و هەناسەی چەوساوەکان کردووە و ئەم هەستەشم لە شیعری (گەر وانەبووم)دا ڕانواندووە و قسەی دڵی خۆم لەوبارەوە لەوێدا، کورد گوتەنی: وەك گۆشتی سەر چەپەرێ، خستۆتەڕوو.

**هەشتەم:** پێویستە ئەو ڕاستییە بڵێم: نابێ هەرگیز مەسەلەی جیهاد و تێکۆشان لەگەڵ توندڕەوی و تیرۆر و ڕەشەکوژی و تۆبزی و تۆقاندن ، تێکەڵاو بکەین و ئەم دوانە نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە، بەندە تا سەر ئێسقان دژی توندڕەوی و تەتەڕڕوفم بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەی بەناوی (ئیسلام)یشەوە دەکرێ، بەر لەهەر کەسێك، یەك دنیا بە زیانی خودی ئیسلام و مسوڵمانان دەشکێتەوە و پێموایە دەبێ بەر لەهەر کەسێك مسوڵمانان دژی توندڕەوی و تیرۆر بوەستنەوە و قەت ڕازی نەبن ئەم بەڵاو دنیا تاریك و قەڵب و قێزەونە، بەئاییی (ئیسلام)ی پڕ لە ڕەحمەت و جوانیی و مرۆڤدۆستیی و میهرەبانییەوە، ببەسترێنەوە.

## گەر وانەبووم!

منی مەزڵووم
ناشێ لەناڵەی مەزڵوومان حاڵی نەبم
تا دووچاری کوێریی و کەڕیی و لاڵیی نەبم!
هەتا زیندووم...
چاوم لەسەر کارەساتیان ستار دەگرێ
گوێم هاوار و ناڵە و گریانیان دەبیستێ
دڵم لەگەڵ دڵی بەکوڵیان لێدەدا
جەرگم لەگەڵ جەرگی سوتاویان ژان دەکا
زمانم سروود و پەیامیان دەڵێتەوە
گەر وانەبووم...!
ئەی نیشتمان!!
حاشام لێ کەو سەرم بخە ژێرپێتەوە

***

هەر نیشتمانێ، هەر شوێنێ
دەستی ستەم
کارەساتی بەسەر دێنێ
شوێنی منە
یاخود هەر دڵۆپە خوێنێ

دەستی ستەم
لە هەر مەزڵومێك دەیڕژێنێ
خوێنی منە
دەیلێمەوە...
زمانم سروود و پەیامی،
چەوساوەکان دەڵێتەوە
گەر وانەبووم...!
ئەی نیشتمان!!
حاشام لێ کەو
سەرم بخە ژێرپێتەوە.

# من کوردستانم

نیشتیمانێکی سەربەخۆم
کەس ناتوانێ
تەونی شوناسێکی ساختە،
بڕێسێ بۆم
لە بەرامبەر هەر ناوێکی داسەپێنراو
هەر نەخشەیەکی داتاشراو
باز و هەڵۆم
درێشە و داسم
بروسکە و چەخماخە و ئەڵماسم
تورکیا و عێراق، سوریا و ئێران
نە هەرگیز دەبنە پێناسم
نە تاهەتایە نەخشیەیان،
هەڵدەواسم
با هەموو دنیا گوێی لێ بێ
هەر ناوی خۆم بە ڕاست و فەرمی دەناسم
لەهەر شوێنێکی سەر زەوی
لەهەر ئاسۆیەکی ئاسمان
بە هەموو زمانێکی جیهان
من کوردستانم، کوردستان!!!

# دەنگی جەماوەر

دەشێ دەستێك
دەستێکی رەش
یا مەبەستێك
مەبەستێکی پڕ فێڵ و غەش
وەرزێك ببێتە خەزانی،
نیشتیمانێکی سەوز و گەش
..........
دەشێ هێز و دەسەڵاتێ
بۆ چەند ساڵێ
بۆ چەند ساتێ
وا مل داتێ
جیهانی واڵا و پان و پۆڕ
لە پەپوولە و پاساری و پۆڕ
بکاتە تۆڕ
بکاتە گۆڕ
..........
دەشێ گورگێ
بۆ چەند ساتێکی بتوانێ
خۆی لە شێوەی مەڕێك ڕانێ

یا ببێته شوانی (ڕان)یَ
داگیرکەرێك،
خۆی به دەستی ئاوەدانیی و
رزگارکەری ولاّت دانیَ! !
.........
بەلاّم هەرگیز
نەهیچ دەست
نەهیچ دەسەلاّت
نەهیچ گورگ و هیچ داگیرکەر
له هیچ ولاّت
ناتوانن نەهێڵن تا سەر
دەنگی زولاّڵی جەماوەر،
بەڕوویاندا کڵپه نەکاو
نەیێته دەر! !

# پیاسەیەك بە هاوڕێیەتی پەپوولە

٢٠٠٧ رانیە

فەرموو

نیگایەك لە ئاسۆ

سەرنجێك لە خۆر

هەستێك لە شەماڵ

بۆنێك لە خۆشەویستیی

پیاسەیەك بە هاوڕێیەتی پەپوولە

تۆ هێشتا هەر لەگەڵ وەنەوزدا ئاوێزانی

بروسکەیە و ڕۆشنایی نابینی

هەورە تریشقەیە و داناچڵەکێی

بارانەیە و دڵت لە شاخ دەچێ

گیا سەوز دەبێ و تۆ هیچ

دار چرۆ دەکا و تۆ هیچ

هەموو باڵندەکان بە ئاسمانەوە...

تۆ شەمشەمەکوێرەی پشتیرو بنمیچ

........

فەرموو، با دەست بخەینە دەستی نەسیم
تا رەشەبا لولمان نەدا
ژوانێك لەگەڵ كانیی دا، بگرین
تا دەریا هەڵمان نەلوشێ
وەفا، بخەینە دەستی كێڵگە
تا نەبینە سەپانی پوشێ
وانەكان بە مەرەكەبی سپی بنووسینەوە
تا هەرگیز سپات نەبنەوە
گەرومان بە ئاوی ئاسوودەیی تەڕكەین
تا هەرگیز وشكارۆ نەبێتەوە
ژوانێك لەگەڵ نەمریی دا، بگرین
تا سەر، خەم و خۆشەویستی مەرحەبای یەكتر نەكەنەوە
ئەمەن نەكەینە مەزادی سەڕاب
تا هەقیقەت نەمانداتە دادگا
لەودیو چاویلكەی رەشەوە نەڕوانینە نێرگز
تا جوانیی لێمان نەڕەنجێ
چیتر پیاسە بە كۆڵانەكانی گوناهدا نەكەین
تا غەفڵت نەمانكاتە رەژوو
قالۆچە لە پیسیی و ئێمە لە پاكییەوە هاتووین
كەچی دەڵێی لە داوێنی خەتاوە،
لە دایك بووین!

ئەو دادەچێنین و

پاڵەی پەرێزەکانی ئەوین

جۆخینێك لە هەڵدێر

خەرمانێك لە وەهم

جەواڵێك لە زیوان

باراشێك لە دەرد

نانێك لە قەڵداسوو

پارووبەك لە بەرد

پێشمان وایە جوتیاری (دەشتی قەراج)[1]ین!!

........

هەمیشە، لە پەنای زەینی بێ زەین و هەڵگەڕاو،

خەڕەند...

لە خۆپەرستیی دا،

سەقەر...

لە هەلپەرستیی دا،

دۆڕان...

فاتیحە لە پرسەی خەونە ئەڕخەوانیەکانماندا دادەن!

دێم ڕۆمانی گریان دەخوێنمەوەو

لە حیکایەتی پێکەنین تێناگەم

---

[1] سەر بە قەزای مەخمورە و دەشتی قەراج و کەندیناوە بەناوبانگن و بەیەکەوە بەسەدان هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵیان هەیە.

گویێ نادەمە تریقانەوەی لافیتە
گوڵەگەنم لە پەرێزەکاندا کۆدەکەمەوەو
لە کۆڵەپشتی حەمباڵەکاندا بۆی ناگەڕێم!
لە چاوی پەنجەرەی ڤێللاوە دۆزیومەتەوە
لە سوعبەتی دێوجامەی پۆست حاڵیم!!
راوی پاسارییەکانی نیشتیمان دەکا
پشتی تابلۆی باڵەخانەکەم خوێندۆتەوە!
نووسراوە:
کۆمپانیای جەربەزە !!!

# ئێوارەیەکی تووش[1]

٨/١/ ١٩٩٣ رانیە

له ئێوارەیەکی تووشا
بە دەستڕێژی نارەسەنێك
مامۆستایەکی شۆڕشگێر

---

[1] بەبۆنــەی تیرۆرکرانــی زانــا و پێــشمەرگەی دێــرین، (مامۆســتا ئەحمــەدی سینەمۆکی)یەوە نووسراوە، ئەم شیعرە و هەواڵی تیرۆرکرانی مامۆستای ناوبراو، لە گۆڤاری دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)ی ساڵی پێنجەم، لە کانوونی دووەمی ١٩٩٣ دا بڵاوکراوەتەوە، مامۆستا ئەحمەدی سینەمۆکی زانایەکی تێکۆشەری نێو کاروانی رابوونی ئیسلامیی کوردستان بوو و شەوی ٨/٧ی ١٩٩٣/١ دوای نوێژی خەوتنان و گەڕانەوەی لە مزگەوتەوە بۆ ماڵەوە، لەبەردەرگای ماڵی خۆیان لە کەشێکی باراناوی و تۆف دا لە چوارقوڕنە، لەلایەن دەستێکی رەشەوە، دەستڕێژی لێ کرا و نامەردانە تیرۆرکرا، پاشان هەر لە چوارقوڕنە لە مەراسیمێکدا بەخاك سپێردرا و تاوانەکەش لەلایەن زانایان و جەماوەری کوردستانەوە بە توندی ریسوا و مەحکوم کرا.

ناوبراو ساڵی ١٩٥٤لە گوندی (سینەمۆکە)ی بناری قەندیل لە دایکبووە، چۆتە بەر خوێندن و بۆ وەدەستهێنانی زانستەکان، چەندان شوێن گەڕاوە، ساڵی ١٩٧٨ لەلایەن مامۆستا مەلا عومەری خدرانەوە، ئیجازەی مەلایەتی پێدراوە، ساڵی ١٩٨٨ رێگای شۆڕش و پێشمەرگایەتی دەگرێتەبەر و لە هێزی ئازادی بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوو دەبێتە پێشمەرگە و وەك مامۆستا و فەرماندەیەك درێژە بە خزمەتی خۆی دەدات، بەشداری راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ و ئازادکردنی کوردستان دەکات، لە کاری بانگەواز و بێدارکردنەوە و چارەسەری کێشەی هاووڵاتیان و ئاشتیی کۆمەڵایەتیی و خزمەتی ئاین و گەل و نیشتیمانەکەیدا، رۆڵی بەرچاو دەگێڕێ و تا ساتی شەهیدبوونی بەردەوام دەبێت.

سینەی رووشا

لەبەردەمی دەروازەیەکی دنیایی

بەدەعوەتێکی خودایی

ماڵئاوایی لەماڵ کرد و وەڕێکەوت

بۆ بەهەشتی رازاوەی هەتاهەتایی

هۆ خوانەناسی ستەمکار!

بەستەزمانە!

ئەوەی تۆ خۆت لەقەرەدا

ئەوە کاروانی ئیمانە

بۆ نابینی، بێ بینایی!

قافڵەی کاروان،

کاروانی پەیامی خوایی

دەرو برە و چەند خۆشڕۆیە

دەستەملان و دەستەودامێنی ئاسۆیە

پەتی سێدارەی بیردۆزە و

رێچکەی پوچەڵ و نامۆیە

چقڵی چاوی کوێر و دڵی، رەش و رەقی،

هەزارانی وەکو تۆیە!

# ئاسن و ژەنگ[1]

١٩٩٣ رانیە

کاتێك ئاسن ژەنگی هێنا
رەنگی گۆڕا
(خۆرکە) دەستی لە گەروێ نا
سەنگی دەڕوا و دێ بەلادا
گریمان پارچە ئاسنێکی تریان لێ نا
ژەنگەکەیان لەسەر رادا!
سوودی دەبێ!؟
نەخێر هەرگیز پینە و پەڕۆ
دادی نادا
راستە روخسارێکی بەرچاو پەیدا دەکا
دەکرێ کورتبین و سووکەڵە
یا بەستەزمان و چوکەڵە

[1] ئەم شیعرە لە گۆڤاری رابەر ژمارە ١٤ ی زولقەعدەی ١٤١٣ ك – مایسی١٩٩٣ دا بڵاوکراوەتەوە و بەو هۆیەشەوە لەو فەوتان و فەرهودەی بەهۆی گێچەڵی شەڕی ناوخۆییەوە تەواوی ماڵەکەمی بەزووربەی شیعرەکانی ئەو سەردەمەشمەوە، لە سەرئەشکەوتان لە ٢٦/١٢/ ١٩٩٣ گرتەوە، پارێزراو بوو!

هەست بە تێداچوونی نەکا

بەڵام راستیی

بەهۆی دەستەویەخەبوونی، بورکانی بێ ئامانی ژەنگ

تا دوا ئاستی

دادەڕزێ، هەڵدەوەرێ

بەستەزمانە!

هەزار بەرگی پۆڵایینی بکەیە بەرێ

دادی نادا

ئەجەل دەیباو

رۆژی پێ ناچێتە سەرێ

رۆژی پێ ناچێتە سەرێ

## مەستی بیٚ هەست[1]

۱۹۹۳ سەرئەشکەوتان

کە مەستی هەستیی بیٚ هەستیی
بەڕووی پەستیی
سەراپا (بوون)ی (پیٚ بوون)ی
لە قوژبنی تاریکایی گوێی گا، پەستیی !
ئەلەوێڕا مەستی بیٚ هەست
نامۆ دەبیٚ لە ڕۆشنایی
بۆ سۆراغی تروسکایی
پەڵە هەوری پێش گەڕی (با)
سیمای سەڕاب و تارمایی
هێندەی هێزی دەبەردایە،
بە خێرایی
لە بیابانی وشکارۆی بەزمی گومڕایی
بەونەزمە رادەوەشێنیٚ
دەسرۆکەی سەرچۆپی شایی...... !

[1] ئەم شیعرە لە شەڕ و گێچەڵی ناوخۆیی مانگی ۱۲ی ۱۹۹۳ لە ماڵەکەمدا لە سەرئەشکەوتان، لەگەڵ بەشێکی شیعرەکانی ئەو کاتەم بەر شاڵاوی تاڵان کەوت و فەوتا و تەنها ئەوەندەم لەبەرمابوو.

# حەیف و تەما[1]

١٩٩٧

هۆ چاوی من!
ساتێ بە میهرەبانیی خوا
تەم و تەڵخی لەپێش چاوانم ڕەویەوە
هەرچەند تازە وەك دانەوێڵەی دوا پەڵە
وەشێنرابووی بە زەویەوە
ئەمما تۆم لەنێو دنیایەك
کێڵگەی جیاجیادا، دۆزیەوە
........
هەرلەوساتە خۆشەویستیت
خێرا و سێنا
ڕۆچوو بەناو ناخ و مۆخ و ڕەگ و خوێنا
ئامێزی متمانە و تەمام
بۆ خزمەتی پەیامی پیرۆزی ئیسلام
لە بەژنی چیاییت وەرێنا

[1] ئەم شیعرە وەك هاوارێکی دڵسۆزانە، لەبارەی دەرد و نەخۆشی و کێشە بێرەزاکانی ئەوکاتەی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) پێشوو، نووسراوە.

هەر لەو ساتە،  پۆل پۆل زانای بەهەڵوێست و
لاوی  دڵ پڕ لە حەماسە،
لە دەیان مەڵبەند و شوێنا
بەسیمایەکی نوورانی و
نیازێکی پاك و خاوێنا
گیان لەسەر دەست
بۆ یەك مەبەست
لێبڕاوانە بۆ دەورت تەشریفیان هێنا
بەڵام کێڵگەی تاسە و هیواکانی دوێنێم!
حەیف ئێستا
بەهۆی شوفێری ناشێوە
هێندەت کەم و کورتی و زەبری،
هەڵدێران و تەقڵە، پێوە !!
هەروا بەحاڵ
ئەویش بە پاڵ
وای بەڕێوە!!!

# نەشتەرگەری[1]

٢٣/ی شەعبانی ١٤١٨ – ١٩٩٧/١٢/٢٣

ئەی نێرگزە شەمزاوەکەی
نێوان پەنجە بزۆزەکان!
پەپوولە باڵ پڕوزاوەکەی
نێو دوکەڵی گزۆزەکان!
ئەی ئاوازە ناوازەکەی
کۆرسی دەنگە ئاڵۆزەکان!
دەمێکە گەرەکمە لەگەڵ،
ئازاری زامەکانتدا ژوانێك بگرم
سوپاس بۆ زاتی بەتوانا و دانا و زانا
وا بەرلەوەی لەنێو پێخەفی خەفەت و
لەسەر تەختێکی سەقەت و

---

[1] ئەم شیعرەش هەر وەك هاوارێکی دڵسۆزانە، لەبارەی دەرد و نەخۆشییە سەخت و کێشە قوڵەکانی ئەوسای (بزووتنەوەی ئیسلامیی)پێشوو نووسراوە و هەمان رۆژیش لە مونتەمەری حەوتەمیدا کە رۆژی سێهەمی بوو، لە هەڵەبجە خوێندرایەوە.

شایانی باسە ئەو کێشانە هەر لە ساڵی لە ١٩٨٧ەوە لە بازنەی رابەرایەتی و سەرکردایەتیدا سەریان هەڵدابوو و رۆژ بۆ رۆژێ قوڵ و دژوارتر دەبوون و ئاسۆکانی چارەسەر و هیوا، زیاتر تەم و تاریکیان بەسەر دەکشاو هەوڵەکانی چاکسازیی و خەمی دڵسۆزان بێ ئاکام دەمانەوە، تا مەخابن لە ئەنجامدا دەرد و کێشەکان تخێڵیان کرد و بە یەکجاری برستیان لێ بڕی!!

بەدەروونێکی شەکەت و

دڵی لەت لەتەوە، بمرم

هاتووم و بەهیوای میهر و سۆزی شاف و

شیفای کاف

سەرم خستوویە سەر سەرو

کاڵا و بەرگی نەشتەرگەریم

بۆ چارەت کردۆتە بەرو

ئیتر هەنووکە وادەیە

هەر ئالێرە پڕ بەگەروو

بڵێ: توخوا بەسە و چیتر

مەبنە زێڵوو لەو زامانەو

لە خوێنیشمدا بە زەروو

بەسە و ئیتر من بیمارم

گیرۆدەی ژان و ئازارم

دەسا توخوا لە ئێوەش چارو تیمارو

بوار و دەروو! !

........

دەسا توخوا مەگەر ئێوە

لەشکایەتی شەهیدانی بێ سۆراغی بابەگوڕگوڕ[1] داوەڵ ناکەن! ؟

---

[1] ئامارەیە بۆ ئەو پۆلە پێشمەرگەیەی ، کە لە رۆژی ١٩٩١/٣/٢٨ لە بەرپەرچدانەوەی هێرشی رژێمی بەعس بۆ سەر کەرکووك و کوردستانی ئازادکراو لە راپەڕیندا، شەهید بوون و تا ئێستاش گڵکۆکەیان بێ سۆراغەو بریتی بوون لەشەهیدان: (سەمیر نورەدین عەلی – مەلا یوسف کەرکووکی، نەوزاد هەولێری، خدر حەمەدەمین

**مەگەر ئێوە**

**دەتوانن لەدەستی نزای دایکی شەهیدانمان ڕاکەن! ؟**

**توخوا بەسە و بەقسەی خواکەن، بەقسەی خواکەن!**

**زیاتر خوناوە و شەونمی،**

**بەرەبەیانی لێبڕان و دڵسۆزیتان**

**بەژێر خاکی ئەم نێرگزە پاکەدا کەن**

**........**

**ئێوە ئەی ئەشخەڵەکانی،**

**بناری بیروباوەڕ و خواپەرستی!**

**هاتوون هەتا**

**پێشگیری کەن لە زریان و خەزان و تاوان و خەتا**

**تا لە تۆغیان و هەڕەتی،**

**تین و خەڵفاژۆ و تاقەتا**

**پرشکی ئاگری خەتای ستەمکاریێ**

**بەرنەبێتە لێرەواریێ و**

**لێتان بێتە بەڵا و پەتا**

**هاتووین هەتا**

**ئەی ئەوانەی براگەورەن و لەسەر کورسین!**

**بەراشکاوی لێتان پرسین:**

---

**فەقێ عومەر– خدر فەللاح، ئەحمەد مەحەممەد عەبدوڵڵا –هۆشیار، حەسەن ئەحمەد نەبیەسوور– فەقێ حەسەن، ئەحمەد مەحمود ئیبراهیم – شاخەوان، ئیبراهیم حوسێن ئەحمەد، رزگار نەجمەدین نوورەدین، عادل حەمە حەمە رەشید،...).**

شەمزاندنی ئەم نێرگزە

حتی متی.... حتی متی! ؟

هاتووین هەتا

هیچ کەس لەژێر سایە و ناوی پەیامی بەرزی و عیززەتا

لە غەفلەت و ئیسراحەتا

رۆنەنیشێ و پارووی چەور

خەڵکیش لەنێو گێژەلۆکەی ژان و ناسۆر و خەفەتا

........

هاتووین و هەرکەسێ بروسکەی

دڵۆپە خوێنی شەهیدێکی لەدەستایە

هاتووین هەرکەس دەریایەك

هیوای بۆ ئایندەیەکی گەش و رووناك

لە هەستایە هاتووین و بەدڵ و بەکوڵ

دەپاڕێینەوە، خودایە!

کانیی زەین و دڵمان روون و

هەموولامان خزمەتکاری دین و بزاڤ و رابوون و

بە پەیژەی تەقوا و لێبڕانا

نەك بە پەیژەیەی

غەیبەت و رق لێبوونەوەی ئیماندار و دڵسۆزانا

سەرمان بخەی هەتا ئاستی

دەستەملانیی سێرەی دڵ و

زمان و چاو و چەك و قەڵەمی تێکڕامان

لەگەڵ راستیی!

# زامێك هەموو ( شازدەی سێ )یەك دەكولێتەوە

(با)یەك لە خەزان
لە هەناوی شێتییەوە هەڵی كرد
رێژنەیەك لە ریسوایی
لە هەورەكانی رقەوە باری
دۆزەخێك بە ئەستێ و بەردی (نەمرود)و
(ئەسحابول ئوخدوود)[1] داگیرسا
ئافاتێك لە زەمهەریری عەفلەقیەت و
سندانی عروبەو
سەقەری سەركەشییەوە
بەقورگی نیشتیماندا كرا
چرۆی هەنار
جریوەی پاساری
پرچە زیوینیەكانی گزنگ
بوخچەی بوكێنی بەهار
بزە نەپشكوتوەكانی بەرائەت
ترپەی دڵ و چپەی پێ و

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئایەتی ( قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ * النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ) سورەتی البروج– ئایەتی(٤ و٥)، واتە: بەكوشت چن ئەوانەی چاڵیان هەڵكەند و پاشان ئاگریان تێداكردنەوە و باوەڕدارانیان تێدا دەسوتاندن.

حەیران و لاوکە حەزینەکانی پێنج هەزار ڕێبوار

لە (شازدەی سێ)یەک دا

لە باوەشی (عومەری خاوەر)[1] دا، خەوتن!

لەوێوە شار گەڕیدەیەکەو

بە کۆڵێك غوربەت

لافاوێك نەفرەت

مشتێك نزا

مەملەکەتێکی خاپوورو

لوێچێك خاك و خۆڵی سووری شارەزوورەوە

سەر بە کەلاوەکانی ویژداندا دەکات

---

[1] ناوی تەواوی (عومەر حەمە صاڵح)ە و لەداکبووی (١٩٣٤)ە، بەناوی دایکیەوە پێی گوتراوە (عومەری خاوەر)، خێزاندار بووە و هاوسەرەکەی ناوی (سامیە) بووە، ٧ کچ و کوڕێکی هەبوون و کوڕەکەی بە منداڵی مردووە و زۆری پەرۆش دەبێت، خوای گەورە دوو کوڕی بەیەکەوە پێ دەبەخشێت و ناویان دەنێ (مەحەممەد و ئەحمەد)، ١٩٨٨/٣/١٦ بەهۆی کیمیایی بارانی هەڵەبجە و دەورو بەری لەلایەن ڕژێمی خوێنڕێژی بەعسی گۆڕبەگۆڕەوە، لەبەردەمی ماڵی خۆیان لە هەڵەبجە لەگەڵ یەکێك لەکوڕەکانیدا شەهید دەبێت و دواتر لەلایەن وێنەگرێکی تورکی بەناوی (ڕەمەزان حەمید ئۆزتورك) وێنەی دەگیرێت، شایانی باسە ناوبراو لە جەلسەیەکی دادگاییکردنی عەلی کیمیایی و سوڵتان هاشم و دوو کەسی تردا لە بەغدا لەبەردەم دادوەر (محمد عريبي) ئامادە دەبێ و ئیفادە لەسەر ئەو تاوانە دەدات، دەڵێ: من ١٩٨٨/٣/١٨ چومە هەڵەبجە و زیاتر لە ١٠٠ وێنەم گرتووە.

شایانی باسە ئەم وێنەیەی عومەری خاوەر و کوڕەکەی، کە بە کەوتوویی لە باوەشیدایە، دەبێتە وێنەیەکی جیهانیی و شوناسی هەڵەبجەی شەهید و مەزلومیەتی کورد.

لە هۆڵەکاندا کۆڕ دەگێڕێ

پێشانگا دەکاتەوە

لە تەلەفزیۆنەکانەوە رادەنوێنرێ

لە پشتی مایکرۆفۆنەکانەوە

تراژیدیاکانی سەفەری خنکان دەگێڕێتەوە

لە دەمی موبارەکی سوڵتانەکانەوە

دەبێتە دەستڕێژی بەڵێن

لە شەقامەکاندا

پێنج دەقیقە وەستان

لە رۆژنامەکانیشەوە

مانشێت

ساڵە و ساڵ

بەهەنیسکەوە رادەکێشرێتە ناو ئاپۆڕای ڤیستیڤاڵ

..........

(شازدەی سێ)کان، لێك ناچن

یەکەم: خاك سوور و بەری ئاسۆ رەش

دووەم و سێ یەم: خاك رەش و بەری ئاسۆ سوور

چوارەم: خاك بورکانێکی رق ئەستوور

لە پێنجەمیشەوە تا ئێستا

خاك سپاردەیەکە

لە قوژبنی گیرفانی فەرامۆشییەوە نوزەی دێ

شەهیدێکە

دەستی لە ژێر چەناگەی خەمەو

پەنجەکانی لەناو دەمەو
هێدی هێدی
تەمی نائومێدی
بۆ ئاسمانی چاوەکانی دەکشێ
تابلۆیەکە
لە پشتی (کڵاو قاسم)[1]ەکانەوە نابینرێ
سروودێکە
لە ڤێللاکانەوە نابیسترێ
ئەندازیارێکە
سەری لە مەسخەرەی تەندەری پرۆژەکان سوڕماوە
باڵندەیەکە
بەسەر مەزاری پۆلە شەهیدێکەوە هەڵکورماوەو
لە مۆنۆمێنتەکە دەڕوانێ!
غەریبەیەکەو
بە دەوری گۆی زەویدا دەخولێتەوە
زامێکە...
هەموو (شازدەی سێ)یەك دەکولێتەوە!!

[1] لوتکە شاخێکە دەکەوێتە نێوان شەقڵاوە و بالیسان، لە شەڕی ناوخۆیی نێوان پارتی و یەکێتی دا، هاوتای (کەپکی حەمەداغا و مامەرووتە) ناوبانگێکی گەلێك شومی دەرکردبوو و زۆر تێکهەڵچوونی قورسی بەخۆوە بینیوە و خوێنی دەیان رۆڵەی کوردی بە ناهەق لەسەر رژاوە!

## ڕێگا

دەشێ هەموو ببینە گوڵی گوڵزارێك
دەشێ هەموو ببینە داری نزارێك
لەکۆچێکا، هەموو ببینە ڕەوەندی نێو دەوارێك
لە یەك ڕێوە
ببن بە پۆلە ڕێبوارێك
سەدان زام و
دنیایەك هیوا و مەرام و
ڕێگە چارێك!

## ڕێبوارێکم

ڕێبوارێکم
خەمێکی گەورەم لە هەگبەدایە
بۆ فرمێسکەکان، فرمێسك دەڕێژێ
جەستەیەکم
دڵێك لە قەفەزی سینەمدا
بۆ ژانی زامەکان، ئازار دەچێژێ
کۆرسێکم لەسەر تەختەی شانۆی ژیانە
سروودی هەوڵ و سەرکەوتن دەبێژێ
جوتیارێکم لەنێو کێڵگەی ڕەنج دایە
نەمامی داد و ئازادیی و برایەتیی و یەکبوون، دەنێژێ

# کۆچی غوربەت

٢٠/٥/١٩٩٩ هەولێر

ئەی مامۆستا !

ڕاستە چاوەکانت لێکناو

کتێب و دەفتەرەکەت وێکناو

بۆ سەفەرێکی ئەبەدی، بارگەت تێکناو

دڵی پاکی پڕ عەشقی خواییت ڕاوەستا[1]

---

[1] بەبۆنەی کۆچی دوایی (مامۆستا مەلا عوسمان هەڵەبجەیی)ەوە نووسراوە، مامۆستا ناوی تەواوی (عوسمان عەبدولعەزیز مەحەممەد)ە، ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی (پریسی سەروو)ی سەر بە هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە، لە منداڵیەوە لای مەلا عەزیزی باوکی و پاشان لای مامۆستا مەلا صالحی گەورە، دەستی بە خوێندنی زانستەکان کردووە، ساڵی ١٩٥٤ چۆتە ڕیزی(برایانی مسوڵمان)ەوە، ٢٧ی ڕەمەزانی ١٩٥٩ بە بڕیاری عەبدولکەریم قاسم دەگیرێ و لەناوچەکە دوور دەخرێتەوە، جارێکی تر و لە ساڵی ١٩٧٦ دەگیرێتەوە و بۆ ماوەی ١٠ مانگ بۆ سەماوە و ڕومێسە دوور دەخرێتەوە، دوای ڕێپێوانەکەی هەڵەبجە لە مانگی ٥ی ١٩٨٧ کە بە هۆیەوە ڕژێمی بەعس گەڕەکی کانی عاشقانی بەتەواوی خاپوور کرد، مامۆستا مەلا عوسمان لەگەڵ چەندان زانا و سەدان لاوی ئیسلامخوازدا هیجرەت دەکات و ڕێگای خەبات دەگرێتەبەر و لەلایەن بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامییەوە پێشوازی گەرمیان لێ دەکرێ، پاشان لە کۆبوونەوەیەکدا لە ماڵی مامۆستا شێخ مەحەممەدی بەرزنجی لە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە حوزەیرانی ١٩٨٧ لەجێی (مامۆستا شێخ عەبدول لەتیفی واژەیی) بەرابەری سێهەمی بزووتنەوەکە هەڵدەبژێرێ و وشەی (پەیوەندی)یش لەناوی حیزبەکە لادەبرێ و بەم قوناغەش بزووتنەوەکە گۆڕانکاری و پێشکەوتنی هەمەجۆرو گەورە بەخۆوە دەبینێ، مامۆستا لەپاڵ ئەو ئەرکانەشدا تەفسیری قورئانی پیرۆز لە ١٥ بەرگدا بەزمانی کوردی دەکات و بە زانستە قوڵەکەی خزمەتی ئاین و گەل و نیشتیمانەکەی دەکات، دواجار مامۆستای زاناو موجاهید بەهۆی نەخۆشیەوە لە ڕۆژی ١٢/٥/١٩٩٩ لە وڵاتی غەریبی و لە دیمەشقی پایتەختی سوریا

بەڵام مادام
کاروانی پەیامی ئیسلام
رەوڕەوەی رابوون بەردەوام
شەپۆل دەدا لە مەیدان و دڵ و هەستا
تۆش و ئێمەش
کوردستان و هەڵگورد و سەفینی سەرکەش
پڕ بەدڵ و دەروون و گیان و جەستە و لەش
بەختیارین و
دەستەملانێن لەگەڵ ئاییندەیەکی گەش.
......
ئەی مامۆستا!
زانای دڵسۆز و موجاهید

---

کۆچی دوایی کرد و ١٢/١٤ش تەرمەکەی هێنرایەوە کوردستان و لە پێشوازی و بەشداریەکی ناوازەی جەماوەرییدا لە گۆڕستانی (گوڵان)ی هەڵەبجەی شەهید بە خاك سپێردرا، بەم پێ یە مامۆستای زانا و موجاهید کە لە ١٩٩٨ەوە هەڵەبجەی جێهێشت بە هۆی ئەرکی تایبەتی و هەروەها سەفەر و نەخۆشیەوە، نەیتوانی بۆی بگەڕێتەوە تا سەفەری جاویدانی و کۆچی دوایی بەسەردا هات و بەیەکجاری ماڵئاوایی لە هەڵەبجە و شارەزوور و کوردستان کرد.
شایانی باسە مامۆستا مەلا عوسمان لە حوزەیرانی ١٩٨٧ ەوە تا نزیك بە مانگێك دوای مۆتەمەری حەوتەم کە لە (٢١-٢٦)ی ١٩٩٧/١٢ لە (هەڵەبجە و سەرگەت و خورماڵ) بەسترا، رابەری گشتی بوو، ئیتر لە یەکەم کۆبوونەوەی دوای مۆتەمەرەکە، کە لە رۆژانی (٥-٧)ی ١٩٩٨/٢ لە هەڵەبجە کرا، مامۆستا عەلی عەبدولعەزیزی برای مامۆستای رەحمەتی، بوو بە چوارەم رابەری بزووتنەوەکە و جێگەی ئەوی گرتەوە، بێگومان ئەمەش لەئەنجامی ئەو قەیرانە قوڵانەدا بوو کە لەمێژبوو لەسەر یەك کەڵەکە ببوون و هەوڵەکانی گۆڕانکاریی و چاکسازیی لە ئاستیاندا بێ ئاکام مابوونەوە.

ئەی رابەر و هاوڕێی سەدەها مامۆستا و لاوی شەهید
چ فەخرێکە !
ئێستا حیلەی ئەسپە شێکەی مامۆستا دێ
لە ترۆپکی دوندی هیجرەت و جیهادێ
ئێستا دەنگی بانگی بەرزی جیهادەکەی بۆ گشت لادێ
تەماشاکەن !
وا لێك لێك برووسکەی تایبەتییش
بۆ زانایانی واریسی پێغەمبەری پێشەوا دێ
وریای خۆتان و میللەت بن
دژی لادان و زیللەت بن
چونکە ئێوەی زانا و چاوساغ
بە شۆڕشێکی نوورانیی و بە پەیامی ئاوەدانیی
ئەم نیشتیمانە سوتماکە، دەکەن بە چراخان و باغ
چونکە ئێوەی زانا و چاوساغ
بە راستیی و رەسەنی و پاکی و بە چاونەترسی و بێ باکی
شیری هۆش و بیری خەڵك
دەکەن بە سەرتوێژ و قەیماغ
بەڵێ ئێوە
میراتگری ئەرکێکی مەزن و پیرۆزن
میراتگری رەحمەت و پەرۆش و سۆزن
میراتگری پێشڕەوی و رابەرایەتین
میراتگری ئازایەتی و مەردایەتین
میراتگری هەوڵ و هیجرەت و جیهادن

میراتگری زانست و جوامێریی و دادن

میراتگری دینێکی هەق و موبینن

میراتگری بەرخودان و راچەنینن

میراتگری تەوحید و رەندی و جورئەتن

میراتگری دین و دەوڵەت و سیاسەتن.

.....

ئەی مامۆستا، کێ دەیزانی!

رۆژێ دێ قامیشلو لەپڕ

هەواڵ دەداتە هەولێر و سلێمانی

هەواڵ دەداتە هەڵەبجە و نالی و سالم و بێسارانی

کە سەفەرێکی چەند رۆژەت لە شام و غەریبایەتیی

دەکەیتە سەفەری هەمیشەیی و جاویدانی

کە تەفسیر و شەرحی (صەحیحی بوخاری)یت

ئیتر دەبنە وەقفی کورد و نەوەکانی.

......

ئەی مامۆستا!

بەڵێ راستە لەنێو غوربەتا کۆچت کرد

بەڵام دیمان چۆن گەلی کورد

درشت و ورد

تەرمی پاکتی

بە دەرونێکی داگیرساو

تا گۆڕستانی (گولان)ی هەڵەبجەی مەحزون و گریاو

نایە سەر پەنجەی دڵ و چاو.

# پەیامەکەم

مانگی ٨ ی ١٩٩٩

پەیامەکەم
زانستخوازێکی زیتەڵ و بە دیقەتە
هەنگی دەوری شیلەی گوڵی هەقیقەتە
یەك بەیەکی پەنجەکانی،
ئامێزی گەرمی پێنووسە
پەیامەکەم مینبەرێکە...
دژی وتەی بێ کردارو
کەسایەتی کەودەن و بێ بەندوبارو
زمان لووسە
.........
پەیامەکەم
رازی ئاشتیی و هاواری پێکەوەژیانە
تێکۆشەرێکی سەرڕاست و ئازا و جوامێر و جەسوورە
هەڵمەتی بنیاتنانەوە و ئاوەدانیی،
شار و دێهاتی وێران و دەروونی کاول و خاپوورە
چاوی هیوا و ژیانەوەیە

هێز و وره و هەنگاوی هەستانەوەیە

دەریای هەست و جۆش و خرۆش و مشووره

بینایی چاو،

پڕشنگی تاو

ڕەونەقی ئاو

ڕەنگی لە ڕەنگی کافووره

پەیامەکەم

گیانی ژیان و

ژیانی گیان و

باڵەی زیانی کێڵگەی ژیانی سەرەوژێر و سەرەوژووره

پەیامەکەم مەشخەڵێکە

بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بۆ باکوور و بۆ باشووره

بۆ تاك و کۆ، گەوره و گچکەو

نێر و مێ و نزیك و دووره

پەیامەکەم

سەراپا ڕەحمەت و نووره

# هەرکات

مانگی ٨ ی ١٩٩٩

خۆشەویستان!
هەرکات دڵەکانمان بەدڵ
بۆ بیروباوەڕ بێنە کوڵ!
چیا دەبێتە بیابان و
بەردیش بەگڵ
خەزان دەبێتە بەهاری کوردستان و
ژینیش بە گوڵ!
.......
هەردەمێکیش بە گەوهەری حیکمەتەوە
بۆ پەیامی هەق بێینە جۆش!
دەبینە رقی پیرۆزی ڕامالینی،
شەو و بیری گەندەڵ و بۆش
دەبینە گوڵزاری بزەو
شەمالی بەختیاریی و پەرۆش
دەبینە هێمای یەکبوون و
برایەتی و داد و کرد و کۆش
دەبینە گڕ

بۆ سەڵتەنەتی زۆرداران

دەبینە هەڵمەتی بەگوڕ

بۆسەر ئۆردووی ستەمکاران

دەبینە دار و بەرد و قوڕ

بۆ کاولەخانووی هەژاران

دەبینە هەڵۆی بەرزەفڕ

بۆ هەموو لوتکە و کۆساران

بۆ ئاوەدانی نیشتیمان

دەبینە دەستی خێر و پڕ،

نمەی باران

# کاتێك لە ئیسلامم پرسی

مانگی ٨ ی ١٩٩٩

کاتێك لە ئیسلامم پرسی
وتی: یەکبوون
فەرمانێکە بێ چەندوچوون
گەورەترە
لە تێکڕای سامانی دنیا و پایە و کورسی
بەهێزترە...
لە کۆی پیلان و مەترسی
وتم: کەواتە ئەی یەکبوون!
تۆ ئەرکێکی یەکجارگرنگ و بنەڕەتی و سەنگین و قورسی
بۆیە تاکو شیری یەکبوون هەڵنەگەڕێ
رەوڕەوەکەی وەرنەگەڕێ و
لە راستەڕێ هەتڵە نەبێ
حەتمەن دەبێ
لە پشت هەر یەکبوونێکەوە
پاکی و بڕوا
برایەتی و دادگەری و تەقوا،
خۆشەویستیی و ڕاستیی و ڕێزو
ویست و ورە و وردی و متمانە و هێز، هەبێ!

# سرروودەکانی دڵنیایی

٢٠٠٠/١/٢٦ ـ رانیە

لەگەڵ خول و خولانەوەی ئەم خڕۆکەیەدا
بە دەوری ڕووگەی ڕۆشنا دەخولێمەوە
بەسەر دوندی ئارامییەوە ڕۆنیشتووم و
سرروودەکانی دڵنیایی دەڵێمەوە
لەنێو کوێستان و هەواری هۆشیاریی دا،
ڕەشماڵی کۆچم هەڵداوەو
وەک بەفری سپی
بەسەر نیازێکی بێ گەرد و سەدەفی دا
دەتوێمەوە

لەگەڵ خول و خولانەوەی ئەم خڕۆکەیەدا
وێنەی جوتیار
تۆوی ئومێدە بەرزەکان
لە کێڵگە بە پیتەکاندا دەوەشێنم
وێنەی بەهار
بەبارانی فرمێسک و ئارەقە و خوێنم
ئەم سەرزەمینە بێ نازە، دەنەخشێنم
وەک دڵسۆزێکی فیداکار
مژدەی ئایندەیەکی گەش
ڕەوینەوەی شەوگاری ڕەش

بۆ گوڵ و چیا و کانیی دێنم
وەکو ڕێبوار
ڕێبوراێکی بیَ باك لە هەڵەت و ئازار
ڕێگا و مەنزڵ
مەرام و دڵ
دەست لەنێو دەست، ڕادەنوێنم

ئەم ڕێگایە
شەختە و سەختی هەموو کۆسپێك
لەبەردەمی دا، (کەرسەك)ە
هەموو چەکدارێك بیَ چەکە
هەموو داڵاشێك لەك لەکە
هەموو تەونێك داوە دەزوێکی خوناوەو
هەموو داو و تەڵە و خەونێك
بلَقی ئاوە
ڕێگایەکە کاروانی میهرو پەرۆشی لە ئامێزە
سەراپا ڕووناکی و ڕێزە
یەکجار قەڵس،
چاو دەستەمۆی چاوپێچك بیَ
دڵ دیلی،
شەوگارو شك بیَ
مرۆڤ میلی،
سەعاتی هەوەس و سك بیَ!!

# وەرن برابن، تەبابن

٢٠٠٢/١/٧

وەرن برابن، تەبابن
مەردی خوابن
لەگەڵ یەك پاك و چابن
تاکو مابن
رق و بوغزوکینە لابەن لەنێو دڵ
لەگەڵ یەکتر ڕووتان گەش بێ، وەکو گوڵ

****

دەست گرۆیی و هاوکاریی
کارگوزاریی
دەبنە مایەی بەختیاریی
کوردەواری
ئاگاداری هەژاران بن زیاتر
بەشداری کەن لە شین و شادی یەکتر

***

بەزم و فیتنە و هەراو شەڕ
گێچەڵ و گەڕ

دەسوتێنن وشك و تەڕ

هەم باڵ و پەڕ

تا نەسوتێ خەرمانی ژین و شادی

ڕیشەكێش كەن هەرا و فیتنە و فەسادی

***

دوو زمانی و غەیبەت و درۆ

بۆ تاكو كۆ

گوناهبارین، شیوەن و ڕۆ

هەوری ئاسۆ

دەخیل گوفتارو كرداری بەد و پیس

بەلاوەنێن، مەكەونە داوی ئیبلیس

# رازی سەرکەوتن

٢٠٠٢/٣/٥

دەتەوێ ئامێز لە کێلی،
دوندی سەرکەوتن وەرێنی ! ؟
مرواریی و گەوهەری دەریای
رەنج و تێکۆشان دەرێنی ! ؟
خاکەلێوەی بەهاری ژینت بخەملێ و
تابلۆی دوارۆژت بنەخشێ ! ؟
هەتلە نەبی و
پێت لەراستەڕێ نەلەخشێ ! ؟
باهەردەم مەشخەڵی بڕوا و ورە و هیوات،
لەنێو دڵ بێ
ئارەقە و فرمێسك و خوێنت،
شەونمی سەر پەڕەی گوڵ بێ

# بایەقوش

٢٠٠٣/٣/٧ رانیە

ئێوارەیەو
کەچی لە جیاتی زەردەپەڕ
بایەقوشی وێرانی و شەڕ
لە نزیك دەروازەی شاری (شێخ مەحمود)دا
پێکۆڵ دەکا
لە هەنگاوێکی شێتانە و شورەیی دا
لەگەڵ ئیبلیسی نەگریسا
یەکدەگریٚ و قۆڵ لە قۆڵ دەکا
لە بەردەمی ئەزمرو پیرەمەگرونا
بەبەرچاوی ئازادییەوە،
رەوە کۆترێك، خەڵتانی خوێن و خۆڵ دەکا
........
ئێوارەیەو
خۆر...
رێبواری سەفەری ئاوابوونە
لە چاو ون بوو
ئۆتۆمبیلێك...
رێبواری بەرەو ماڵ چوونە

کەچی توشی کارەساتێکی مەزن بوو
لەناوی دا
بەهاڵاوی هەناوی رەشی بایەقوش
چەپکێك نێرگز
دەبێتە پوش
......
بەڵام بۆن و بەرامەی،
ئەم چەپکە نێرگزە جوانە
ئێستاکە، پەخش بۆتەوە
بۆ گشت سوچ و ماڵێکی ئەم نیشتیمانە
......
ئێستاکە چڵەنێرگزە خوێناوییەکان
وەکو نێرگزی دەرودەشت
جوان و گەشن
ئێستاکە، چڵەنێرگزە خەماوییەکان
بەویستی خوا، لەنێو بەهەشت
خاوەنی چاکترین بەشن
ئێستاکە چڵەنێرگزە تەماوییەکان
چقڵی هەموو چاو و دەست و دڵ و دەروونێکی رەشن
......
ئێوارەیەو
لەجیات باران
خوێن باریوە

لەجیات بزە و فەرمووی جاران
(بازگەی تاسلۆجە)[1] زمانی خۆی،
بۆ رق و گولله گۆڕیوە
جەستەی( مامۆستا عەبدوڵلا و چوار هاوەڵی)[2]

[1] ئەم بازگەیەیە کە مامۆستا عەبدوڵلای قەصریێ و چوار هاوەڵەکەی تێدا تیرۆر کران، دیارە ئەم بازگەیە ئێستا لەم شوێنە نەماوە، ئەوسا بازگەی سەرەکی ئەو خەتەی دەروازەی شاری سلێمانی بوو.

[2] (عەبدوڵلا رەسوڵ ئەحمەد) ناسراو بە (مامۆستا عەبدوڵلای قەصریێ) لە ئێوارەی رۆژی ٢٠٠٣/٣/٤ لەگەڵ چوار هاوەڵیدا بە ناوەکانی (دلێر حەسەن ئیسماعیل- شێخ توانا، مەحەممەد ئەمین مەحەممەد رەسوڵ - سیروان، ئەحمەد حەسەن ئەحمەد - مەلا ئەحمەد، عەبدولجەبار مەحەممەد پیرۆت - عەبدولجەبار پیرانی) لە کاتی گەڕانەوەیان لە سلێمانیەوە بەرەو رانیە لە ناو ئۆتۆمبێلێکی جۆری لاندکرۆزەردا، کرانە ئامانجی دەستێکی رەش و ناجوامێرانە تیرۆرکران.

مامۆستا عەبدوڵلای قەصریێ، بەپێی تۆماری نفوس لەدایکبووی ١٩٧٠یە، بەڵام لە راستی دا ساڵی ١٩٦٨ لە گوندی (نێوخان)ی دۆڵی (باڵەییان)ی سەر بە شارۆچکەی قەصرێی هەولێر لەدایکبووە، (دیارە گوندی (نێوخان) لەگەڵ گوندەکانی (زێوکان و بەستێ و کاولان) پێکەوە و بە هەر چواریان دەگوترێ (سەرکان) لە دۆڵی باڵەییان.
١٩٨٧ لەلایەن بەعسەوە گوندەکەیان راگوێزراوە بۆ کۆمەڵگەی شاوەیس، گرنگی بەخوێندن و فێربوونی زانستەکان داوەو لە ١٩٨٥ - ١٩٩١ قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، ١٩٩٠ پەیوەندی بە کاری ئیسلامییەوە کردووەو لە راپەڕیندا بەشدار بووە، ١٩٩٤بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە، کۆمەڵێك بەرپرسیارێتی پێ سپێردراون، ٢٠٠١ لە کۆمەڵی ئیسلامییدا دەبێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ساڵی ٢٠٠٢ کۆلێژی شەریعەی دهۆکی تەواوکردووە، مامۆستا کەسایەتیەکی بە ویقار و سەنگین و زانا و تێکۆشەر بوو، وتاربێژێکی زۆر کارامە و کاریگەر و سەرکەوتوو بوو، بە پەرۆش بوو بۆ گەلەکەی و لای خەڵك و جەماوەریش زۆر خۆشەویست بوو، هەموو کوردێکی رەسەن و

به دەستڕێژی تیرۆریست و خراپەکاران

خوێناوی و سڕو تەزیوە

.....

خوێنی ( مامۆستا عەبدوڵڵا و هاوەڵانی)

بارانەیە...

خاکەلێوە دەخەملێنێ

سوتەمەنییە...

کورەی خەبات و تێکۆشان دەجۆشێنێ

تەتەرێکە...

مژدەی نوێبوونەوە دێنێ

هەواڵێکە...

دڵ و هۆش رادەچڵەکێنێ

پەیامێکە...

هەموو ویژدانێك دەدوێنێ

ئاوێنەیەو...

هەڵوێستەکان رادەنوێنێ

........

تەزووی سەرما لەسەروبەندی بەهارا

سەیرە هێندە دژی چەکەرە و چرۆ بێ!

---

دڵسۆز، کە مامۆستای ناسیبێ، بەچاوی رێز و حورمەت و خۆشەویستییەوە لێی دەڕوانی.

کوردێك لە پێشوازی (کۆچ)[1] و ساڵڕۆژی (پێنجی ئازار)[2]ا

سەیرە هێندە دژی نیشتیمانی خۆ بێ!

سەیرە هێندە تیرۆریست و

گێژ و خوێنرێژ و گەلحۆ بێ

ئەرێ (مامۆستا عەبدوڵلا)!

ئەوە چ بنیادەمێکە بەو رقەوە

تینۆی خوێنی پاکی تۆ بێ!؟

چ کەسێکی خەڵەفاوە!

هێندە رقی لە خۆر و خەندە و ئاسۆ بێ

چ فس فس پاڵەوانێکە!

لە ئاست پۆلێك پەپوولەی جواندا (رامبۆ) بێ!

دەسا خوایە

هاناو هێزو

پیت و پێزو

سەرکەوتن و پشتیوانی تۆمان بۆ بێ.

---

[1] ئەوکاتە سەروبەندی سەری ساڵی نوێی کۆچی بوو.

[2] هەروەها سەروبەندی یادی راپەرین و پێنجی ئازار بوو.

# سێ هەناسەی تورەی شیعر[1]

مانگی ٧ی ٢٠٠٤

---

[1] بەبۆنەی یەکەم ساڵرۆژی گیرانی مامۆستا عەلی باپیرو هاورێکانیەوە نووسراوە، کە لەدوانیوەرۆی پێنجشەممە(١١/٥/١٤٢٤ی کۆچی – ١٠/٧/٢٠٠٣ز لە نزیك گوندی (قەمچوغە)ی دوکان لەلایەن بۆسەیەکی هێزە ئەمریکیەکانەوە، لە کاتێکدا مامۆستا عەلی باپیر بەسەرۆکایەتی وەفدێکی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان، لەسەر مەوعیدێکی رەسمی لە سلێمانیەوە بەرەو دوکان دەچوون بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئەمریکیەکاندا، نامەردانە دەستگیرکران و سەرەنجام دوای نزیك بە ٢٢ مانگ مانەوەی بە زوڵم و ناهەق لە زیندانەکانی ئەمریکادا لە عێراق و پوچەڵکردنەوەی هەموو تۆمەتە پوچ و درۆیین و بێ بنەماکانیان، لە سەعات(٥)ی هاوینەی رۆژی پێنجشەممە ٢٨/٤/٢٠٠٥ لە بەغدا سەربەرزانە ئازادکراو رۆژی ٤/٢٩ لە ناوچەی (چیمەن)ی کەرکوك، لە کەرنەڤاڵێکی جەماوەریی گەورەدا پێشوازیان لێکرا.

شایانی باسە لە ماوەی گیرانەکەیدا کە (٦٠٩) رۆژ لە بەندیخانەدا بوو، زۆر نارەزایی و چالاکی هەمەجۆر لە هەموو ئاستەکاندا بەرێوەچوون، بۆ نموونە: رێپێوانی جەماوەریی فراوان بۆ ئازادکرانی خۆیی و هاورێکانی لە ٢١/٧/٢٠٠٣ لە هەولێر و٢/٨/٢٠٠٣ لە سلێمانی و ٧/٨/٢٠٠٣ لە لەندەن و ٧/٧/٢٠٠٣ کۆکردنەوەی ئیمزای رۆشنبیران و ١٢/٧/٢٠٠٧ کۆنگرەی پشتیوانی، کە لە شاری سلێمانی بەستراو...هتد، ئەنجام دران.

ئەو مامۆستا و برایانەی لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیردا گیران، بە گشتی بە مامۆستاشەوە (١٥) کەس بوون و بریتی بوون لە: (تۆفیق کەریم صالح، حاجی عەبدەلرەحمان سان ئەحمەد، دارا مەحەممەد ئەمین –ئەندامانی سەرکردایەتی، ئەحمەد حەسەن حەسەن – لوقمان، بورهان عەباس عەبدوڵلا – ئەبو صوهەیب، زوبێر کەمال حەسەن، سیروان باپیر رەحیم، والی یاسین، مستەفا وسوو ئیبراهیم هەڵشۆیی، هەژار حەبیب، ئیبراهیم باپیر وەتمان، عەلی عەبدوڵلا شەریف، هاوکار عەبدولحەمید سەعید، مەحەممەد ئیبراهیم حەمەد رەسول).

## یەکەم: خامە

ئێستا خامە
خەمێکی قوڵ، دایگرتووە
لەسەر پشتی بەرگی دەفتەرێك کەوتووە
مەرەکەبی گەرم بووەو
کەوتۆتە جۆش
لە چاوی ئەشك دەڕژێت و
لەیەك ساتا، لە هەناویشی نەفرەت و سۆز و پەرۆش
چاوەڕوانە
نووسەرێکی بە بیر و هۆش
لە دەست و پەنجەی بگرێت و
پێی بنووسێ...
لە کوێی ئەم دنیا فراوانە
بەندیخانە
پاداشتی شۆڕشگێڕانە
جەنابی (بۆش)[1]!!!؟

---

[1] ئەوکاتە جۆرج بۆشی کوڕ سەرۆکی ئەمریکا بوو.

## دووەم: سەنگەر

ئێستا سەنگەر...
بە ئەندازەی بەرزی و قورسی ئەم کێوانە
باری خەم و بێزاریی لەسەر لێوانە
ئێستا سەنگەر...
دوچاری رق و توورەیی و شڵەژان و شین و شێوانە
ئێستا سەنگەر...
واقی وڕماوە لەم یاسا و ڕێسا و پێوەر و پێوانە
خەباتگێڕێك، لەگەڵ هەزاران بەعسی دا
کە لە پاکی و چاکی و تاوان و نەخسی دا
ئاسمان و ڕێسمان نێوانە
کەچی دەمڕاست و مامۆستای،
دروشمەکانی ئازادیی و مافی مرۆڤ و دێموکڕاسی!!
لەیەك ئانا
بۆ (ئەو) خەڵاتی زیندان و
بۆ ئەوانیش
گەڕانەوە بۆ سەر کار و پۆست و بەرپرسیاریی دانا !!

## سێهەم: ئازادیی و مافی مرۆڤ

ئێستا ئازادیی و مافی مرۆڤ...
پیشە و کاریان
هاوار و شیوەن و رۆیە
لەحەیفانا، لەشەرم و ناسۆر و ژانا
گەرویان پڕ لە هاڵاو و گڕ و تاڵاو و بۆسۆیە
ئێستا ئازادیی و مافی مرۆڤ...
روویان لەشەو، روویان لەشەڕ
پشتیان لەخۆر و ئاسۆیە
ئێستا ئازادیی و مافی مرۆڤ...
دڵیان رەش و
شەرمەزارییان بۆتە بەش و
ژانی سەختیان کەوتۆتە ناو گیان و لەش و
رقیان لە سێبەری خۆیە
ئێستا ئازادیی و مافی مرۆڤ...
لە بەردەمی (کۆشکی سپی) دا
بەجووت پەتی سێدارەیان لە ئەستۆیە
هاوار دەکەن
(سیاسەتی دوو فاقە) دەڵێ:
زیندان دەڵێ:
ئەوەی ناوی دیموکڕاسی و ئازادیی و مافی مرۆیە
هەمووی درۆیە !!!

# وڕێنە

مانگی ٤ی ۲۰۰۳

ویستیان (کانی)ی کوێرکەنەوە
فوو لە خۆر کەن
ڕێ لە کاروانی نوور بگرن
خۆیان تەنیا بمێننەوەو
پەپوولەکان لە دۆزەخی کینەیاندا
پۆل پۆل بمرن!
نەیانزانی
پیلانگێڕیی و خەون و تەونیان
پێکەنینی ساویلکەیە
تراویلکەیە
بڵقی ئاوە
وڕێنە و خەیاڵی خاوە
سێبەری پێش خۆرەتاوە
مایەپووچن
لینگە و قوچن
کەڕەگەڵن بەدەم باوە

بۆ هەمیشەو

هەتا گیانیان دەبەرماوە

بەڕووی زەرد و دەروونی پڕ لە ئاهو دەرد

هەڵدەکێشن هەناسەی سەرد

سەری خۆیان لە جیات جاریٚ،

هەزاران جار، دەدەن لە بەرد!!

# فایل [١]

جاران فایل
زاراوەیەك بوو ئاسایی
نەکەس هەبوو لێی بپرسێ و
نەکەس هەبوو لێی بترسێ و
نە کەس دەیویست بەخۆڕایی
نەکەسیش دەیویست بە پارە
بەڵام ئێستا ناوێکی بێزەزا و دیارە
دەزانن بۆ ؟!
چونکە فایل
ئێستا ناسنامەی سەرکردەی خیانەتکارە !
دەخیل فایل!
هەرچەندی لێت ورد دەبمەوە
مایەی ئەبڵەق بوونی چاو و
گوشینی جەرگ و هەناو و
وەستانی ئەندێشە و بیری
زللەی وڕبوونی پێشمەرگەو

---

[١] دوای روخانی رژێم لە ٢٠٠٣/٤/٩، بەهۆی دەستبەسەرداگرتنی بەڵگەنامەکانەوە، نهێنی پەیوەندی ژێربەژێری چەندان بەرپرسی جۆراوجۆری نێو هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی کوردستان و عێراق ئاشکرابوون، بێگومان لە پاڵ ئەمەشدا هەندێك جار لە پێناو لێدان و ناشیرن کردنی کەسانی تردا، ناحەزانە فایلی تەزویریان بۆ کەسانێکی پەرێز پاك هەڵدەبەست، کە گوایە ئەمانەش پەیوەندیان بە رژێمەوە هەبووە! بەڵام بێگومان ئەمانە هەوڵی نەزۆك و موغریزانە بوون و تەنها بەمەبەستی ناشیرن کردن و تێکەڵاوکردنی پاك و پیس و ئەوراقەکان، دەکران!!.

سەرسوڕمانی مرۆی ژیری
ئامارژەیەکی بچکۆلەی
(يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ)ی[1]
ئای چ کەتنێکی گەورەیە!
لە سەرەوە بەرپرسی باڵای شۆڕشی و
لە ژێرەوەش
جاسوس و وابەستەی میریی!!
......
ئێستا فایل
ئارەقەی شەرمەزاریی، نێوچاوانێکی تاریکە
لیچ داژەنینی سەرێکی پۆز و شۆڕو
ملێکی نزم و باریکە
ئێستا فایل
لە هەرادانی هەبوونی دەستێکی ناپاك و گولە
بۆ سەربڕینی شەهیدان
کێردێکی ژەنگاوی و کولە
کۆڵەپشتی شۆڕشگێڕێکی وابەستەو
خائین و ڕێشمە لە ملە
بروسکە و چەخماخەی هەواڵی،
ئاشکرابوونی خیانەت و تاوانێکی زۆر و زلە!!

---

[1] سورەتی الطارق – ئایەتی (٩) واتە: ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژەیە کە نهێنیەکانی تێدا ئاشکرا دەکرێن و چاك و خراپ لێك جویَ دەکرێنەوە

# خەندەی دڵ

٢٠٠٤/٧/٢٦

با لە ناخ و قوڵایی دڵ
بە رەنگ و بۆن و نازی گوڵ
ماناکانی خۆشەویستیی
خەڵك دۆستیی
بنووسینەوە
......
وێنە و تابلۆ شێواوەکان
دەربڕینە بێزراوەکان
لە نێو زەین و دەروونمانا
لە بوونمانا
بسڕینەوە
........
ئەوین و سۆز و وەفا و رێز
بکەینە خاڵی ژیریی و هێز
رەگی رق و کینە و هەڵچوون
لە نێو دەروون
ببڕینەوە

خوێن شیرین و سەر و رووخۆش

بە دەریایەك میهر و پەرۆش

بەخەندەی دڵ، بە گیانی گیان

ئامێز بۆ ژیان

بگرینەوە

.......

بە یەکرێزیی و ئاشتیی و یەکبوون

سەرکەوتن و دواڕۆژی روون

هەڵاڵەی شکۆ و سەروەری

بەختەوەری

بچنینەوە

# سایکس بیکۆ[1]

٢٠٠٦/٤/٢٦

زریانێکەو

وەیشومەیە

لە هەناوی رەشی خواساختەکانەوە هەڵی کردووە

تووڕە و تۆسن

رێك وەك کوللە و بەرازو سن

---

[1] سەرەتای ئەم پەیمانە شوومە لە ١٩ی مارتی ١٩١٦دا لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسادا دەستی پێکرد، نوێنەری بەریتانیا (مارك سایکس) و نوێنەری فەرەنساش (جۆرج پیکۆ) بووە، پاشان هەموو ئەنجامەکانی گفتوگۆی بەریتانیاو فەرەنسا خرانە بەرچاوی روسیا، روسیاش دوای بێنەوبەرەو مشتومڕێکی زۆر قایل بوو کە پەیمانی گۆرین مۆربکات، دوایی لە رۆژی ٢٦ی نیسانی ١٩١٦دا، فەرەنسا و روسیا رێککەوتنێکی تایبەتیان دەربارەی دابەشکردنی ناوچە ئاسیاییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی مۆر کرد، دوای ماوەیەکی کەم بەریتانیاش رەزامەندی خۆی بەانبەر بەو رێکەوتنەی هاوپەیمانەکانی پێشاندا، لە رۆژانی ٩ و ١٦ ی مایسی هەمان ساڵدا، رێکەوتنێکی دیکەی لەو جۆرە لە نێوان بەریتانیا و فەرەنساشدا مۆرکرا و بەم جۆرە پەیمانی گڵاوی نهێنی (سایکس پیکۆ) لە دایکبوو! بە پێی ئەم پەیمانە شوومە گەلی کورد و خاکی کوردستان بەسەر وڵاتانی تورکیاو عێراق و ئێران و سووریادا دابەشکران و وەك گۆشتی خێرێ بەشرانەوە و لەوێوە گەردەلوولی مەینەتیەکانی گەلی کورد هەڵی کرد و دەستی پێکرد!!

وەك چەنگ و نینۆكی دوژمن
بەنێو دەغڵ و رەزو بێستانی نیشتمانی پەپوولەدا،
رابردووە
دڵی هەمووانی شەق كردووە
شاخی هێندەی تر رەق كردووە
چاوی خۆری ئەبڵەق كردووە
ئەم كائینە ویژدان مردووە
بەقەد دنیا
خۆی دووچاری ناهەق كردووە
.....
سایكس بیكۆ!
هەوری غەزەب
بارانی خوێن
خەزانی گیان
دۆزەخی ژیان
دووپشك و ئەژدیهای ژێر نوێن
كێردی گەردنی كوردستان
مەرگی نەتەوە و نیشتمان
پشت لە خودا و روو لە شەیتان
....
سایكس بیكۆ!
لەناو قەسابخانەی زەینی تاریكی تۆ
مەلی هیواكانم سەربڕان

لەناو تەونی پیلانی تۆ
کورد کەوتە بەر شالاّوی قڕان
لەناو چەنگی، شەوەزەنگی
پڕ ئاشوب و شەڕ و جەنگی،
دەستی پڕ لە تاوانی تۆ
مێشکەکان پژان
خوێنەکان ڕژان
لەکارخانەی ماکی ناپاکی تۆوە بوو
دەیان (سەددام)
بوونە توجاڕی، بازاڕی
سەرو ماڵ و شەرەفی کوردی بێ تاوان
بوونە نووکی ڕم و نێزە و زەرگی چاوان
بوونە داڵی چاو و دڵ و جەرگی لاوان
بوونە ژەهری مەرگی هەزاران زارۆك و
پیر و گەنج و ژنان و پیاوان
وێنەی ئەبوو جەهلەکانی سەردەمی جەهل و تاریکیی
بوونەوە بە پاڵەوانی،
مەیدانی تراژیدیاکانی زیندەبەچاڵ
زیندەبەچاڵی بە کۆمەڵ، نەوەکو تاك
زیندەبەچاڵی ڕۆژانە
نەوەك بە ساڵ
زیندەبەچاڵی خوشك و کاك
زیندەبەچاڵی باب و داك

نەنك و باپیرە و مام و خاڵ

نەك هەر منداڵ!!

زیندەبەچاڵی کەزی سپی و

ریشی بەفرین، لۆچی هەنیەو

پشتی کووڕ و ئەژنۆی تەزیو

نەك بە تەنیا دارەدارە و، کەنو و گاگۆڵکە و گڕوگاڵ

زیندەبەچاڵی گۆچان و

چاویلکە و داردەست و گۆپاڵ

نەك هەر مەمکەمژە و بێشکە و

ڕەوڕەوە و شەقشەقە و خڕخاڵ!!!

........

پڕی دەفتەرێك زەمەن و

درێژی رووبارێك تەمەنە

گریانی من

بەرد دەکاتە خۆڵەمێش و

خۆڵەمیش دێنێتە گریان

لەوساتەوە

لەگەڵ وادەی تروکانی ئەم ئافاتەوە

بەخوڕ فرمێسکی چاوانم دێنە خوڕای

بەسەر دڵ و جەرگی شەق و داخکراوما

دادەباری و

چڕەدووکەڵ و بۆسۆ دەکشی بەرەو ئاسمان

پڕی دەفتەرێك زەمەن و

درێژی ڕووبارێك تەمەنە
هەرگریان و
سووتان و ناسۆر و ژان و لەخۆدانە
دەنگ و باسمان
........
سایکس بیکۆ!
ئەم سووتانە
هی جەستەم بوو
ئەم گریانە
هی ئەم ناسۆر و هەستەم بوو
پڕبوون لە جەوهەری ورەو
ژیلەمۆی گەشی متمانە و بۆنی هیوا
دەنگی زوڵاڵ
ڕەنگی ئاسۆ
سیمای ساماڵ
هەستی شەماڵ
خشخشەی کەروێشکەی گەنم و جۆ
رقی پیرۆز
عەشقی بەسۆز
عەشقی بەسۆزی گەل و هۆز
بۆیە، یەك تۆز و یەك مسقاڵ
نەچوومە ناو پێخەفی دەستەپاچەیی و
نەمهێشت چاوم سەرخەوێکی نائومێدی بشکێنێت و

دەست لە ئەژنۆ وەرێنێت و
پەلی لە کراس دەرێنێت و
نەبوو ساتێك دڵی ورەم
وانەی بەزین بخوێنێت و
دەستەمۆ بیّ و
بەندایەتی بۆ بەندەکان بنوێنێت و
کڕنووش بۆ داگیرکەر بەریّ! !
........
گلانم دیوەو
ژەم لە دوای ژەم
تاڵاوی ژینم نۆشیوە
بست بە بستی نیشتمانم
لوتکە و بنار
دەشت و کۆسار
کانیی و رووبار
باخ و نزار
دێهات و شار
جار لەدوای جار
بەرگی ماتەمی پۆشیوە
بەڵام هەرگیز
هیچ کامێکیان لەناخەوە
نەبەزیوەو
بە ئاخەوە،

دەم و لێوی خۆی گەزیوە
لە هەر هەلێ و چۆنی لەخۆڕابینیوە
بەڕووی لەشکری وێرانیی و
ئافاتی ئاوەدانیی دا
ڕاچەنیوە و
ڕاپەڕیوە
.......
سەیری مێژوو
خۆم و خاکم
خاکی لەت لەت و سوتماکم
لەودەمەوە
لەگەڵ ساتی سەرهەڵدانی
ئەم ستەم و، تەم و، تەم تەم و
خەمە قوڵ و ئەستەمەوە
پێشمەرگەین و
بەڕووی ترس و
بارودۆخی نوتەك و ئاڵۆزو قورس و
دەمی ژەنگاوی ساتۆرا
بە رووی داو و تەڵە و پیلان و ناسۆرا
بەڕووی حەزیای حەزی شێتانەی خوێنخۆرا
بەڕووی بتی دیکتاتۆرا
یاخی بووین و
بەرەو لووتکە تێ هەڵچووین و

بەرەو ئاسۆ سەرکەوتووین و
لە چاوی گەشی ئاسۆوە دەرکەوتووین
ئاخر ئێمەش
ئێمەی کوردی بەناهەق بەش بەش و بێ بەش
ئێمەی کوردی،
نێچیری تاپۆ و تیری پیلانی رەش
میللەتێکی خواکردین و
کوردستانیین و کوردین و
خوشك و برای قەندیل و (جودی)ی و
پیرەمەگرون و هەلگوردین
ناتوانین لە یەك دابرێین
ناتوانین بێ یەك بژێین
قاچ و پێین
پەردە و گوێین
دەنگ و ژێین
کانی و دێین
تام و خوێین
بەیەکەوە دەژین، دەمرین
دەڕۆین، دێین، دەسوتێین
دروستکراوی دەستی یەك زات و
هەڵقوڵاوی سۆزی یەك سەرچاوە و جێین
بەیەکەوە
بۆسەر ترۆپکی سەربەخۆیی تێدەکشێین

بەیەکەوە و بەیەك گەروو
رووبەڕووی دنیا دەڵێین:
ئێمەش دەبێ
ئەم هەق و مافەمان هەبێ
وەك میللەتان و وڵاتان
سەربەخۆ بین
لە دەوری یەك ئاڵا، کۆ بین
دەست لەناو دەستی ئاسۆ بین
بەسەو ئیتر تاکەی بە یەکتر نامۆ بین
تاکەی ئەسیری پیلان و ڕاو تەگبیری
دێوەزمەی سایکس بیکۆ بین
سایکس بیکۆ!
بە ئیزنی خوای خاوەن شکۆ
ئەگەر هەموومان نغرۆ بین
هەردەبێ دەستەملانی،
ژوانی دەستەملان بوونەوەی بەشەکان و
ڕەوینەوەی شەوە تووش و ڕەشەکان و
زەماوەندی تێداچوون و گۆڕبەگۆڕبوونی
یەجگاریی تەونی تۆ بین!!

# پەپوولەی دوعا[1]

٢٠٠٧/٤/٩

پەپوولەیەك
بەخێرایی
بەرەو ڕوخساری ڕۆشنیایی
بەرەو باوەشی دڵنیایی
لەنێو کڵی سەرلێشێواویی و شەڕەوە
پەرواز دەکاو
خۆی لە سەڕاب دەرباز دەکاو
بەسەر چڵی باوەڕەوە،

---

[1] (دوعا خەلیل ئەسوەد) ئافرەتێکی یەزیدی (١٧) ساڵان بوو، دوای مسوڵمانبوونی، لەلایەن خەڵکانێکی یەزیدیەوە، بەشێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە و بێ ویژدانانە و بێ ڕێزی و بێ لەزەتیەوە، لە ڕۆژی شەممە ٢٠٠٧/٤/٧ لە گوندی (بەعزانی) سەر بە (بەعشیقە) کوژرا، ئەم تاوانە قێزەون و گەورەیەش دەنگدانەوەیەکی فراوانی جەماوەریی و جیهانیی لێکەوتەوە و بەتوندی ریسوا و شەرمەزار کرا. تەنانەت چەند کەسایەتییەکی یەزیدی ناوحکومەتیش کە بریتی بوون لە د. دەخیل سەعید و محەمەد عیدۆ، وەزیرانی هەرێم، عیدۆ بابەشێخ ڕاوێژکاری سەرککۆماری عێراق و د. مەمۆ فەرحان لە دیوانی سەرکایەتی هەرێم لەو کاتەدا بەیاننامەیەکیان بە ئیمزای خۆیان بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتووە: هەرچەندە ئەو کچە لایداوە لە بیروباوەڕی ئێزدایەتی و ڕێنما کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام دەمانەوێ بە هەموو جیهانی ڕابگەیەنین کە ئەو تاوانە دژ بەو ئافرەتە کراوە لە گوندی (بەعزانی) تاوانێکە دژ بە مافەکانی مرۆڤ لە جیهاندا.

ئۆقرە دەگرێ
کەچی لە پڕ
لە نێو گەرمەی بازاڕی دروشمەکان و
لەبەردەم ویژدانێکی سڕ
دەکەوێتە بەر شالاوی
پۆلێك خەرتەل،
رەوێك بنیادەمی دڕ و وڕ و ملهوڕ
هەرچی رقی دەبەنگ و کەودەنیان هەیە
لەمست و شەق
لە بلۆك و بەرد
لە زمانی شڕ
دەیڕێژنە سەر
بەلام پێش ئەوەی پەپوولە
مێشکی بپژێ
خوێنی بڕژێ
گیانی لە لاشە بێتە دەر!
لەنێو کوڵ و هاوار و ئاهو نزوولە
دەبێتە یەك پارچە دوعاو
دەڵێ: خوایە!
لەگەڵ (خاتوو سومەییە)دا
ببمە هاوەڵی پێغەمبەر
دوعا وتی: خۆ بینیتان!
بلۆك، لە بەردەم باوەڕی من

وەکو کەرسەك دەتوایەوە

جیهان، لە ئاستی مافی ژن

خەجاڵەتی بۆ مایەوەو

سەری شۆڕی بەردایەوە

(دوعا)ش: بە مشتێ دوعاوە

بە سەربەرزی و ڕووسوریەوە

بەرەو قاپی خودای تۆڵەستێن و مەزن

گەڕایەوە...

(دوعا) وتی:

دەستە خوشکە ئازیزەکان!!

فەرموون لە ئاوی سازگاری کوێستانی باوەڕ بنۆشن

کاڵاو بەرگی مەرگی جاهیلیەت بپۆشن

ئەی نەتانبیست!!

مێشکی پژاوم

خوێنی رژاوم

کاتێك دڵی بەردیان هەژاند!

بێ پەردە و ئاشکرا و رۆشن

رایانگەیاند:

راستە دروشمەکان جوانن!

راستە بەڵێنەکان خۆشن!

بەڵام...

بۆشن!!!

# قەڵەمێکی کەڵەگەت

٢٠٠٧/٦/٢٨

دیارە لە دوور
قەڵەمێکی کەڵەگەتەو
دەروون کافوور
بە کانیاوێك مەرەکەبی میهرو مشوور
بەپیت،
وەك دەشتی شارەزوور
لە ئامێزی...
پەنجەی پڕ لەسۆز و رێزی
قوتابیەکی زرینگ و جەسوور
لەگەڵ زریکەی
نیشتیمانێکی خوێناوی و ژێرپێ و خاپوور
وەك پێشمەرگە
هاتە حزوور

لە وێڕا هات
کەشکۆڵێکەو
پڕە لە تراژیدیای وڵات
تریفەی باوەڕ،
بۆنی خاك و

هەناسەی گەرمی سەنگەرو
سروەی هیوای گوڕی خەبات
شیلەی زانست
هۆش و پەرۆشی مامۆستاو
جۆش و خرۆشی لاوانی
هۆشیارو دڵ پڕ لە ئاوات
لە بۆتەی خۆشەویستیی دا
لە چاوی گزنگی خۆرا
وەك چەپکە گوڵ
وەك نامەیەکی دکتۆرا
بۆ نیشتیمان
دەکاتە جوانترین خەڵات
.......
لە سیماوە دەیناسمەوە
هەموو تاوێ
پرشنگ داوێ
لێم بینیوە
لێم بیستووە
تەنیا جوانیی و فڕینی بۆ لوتکە ویستووە
نزمیی ناوێ
نایەوێ کەس خۆی لە گێژاو و زۆنگاوی
پەستیی باوێ
گەرەکیەتی

ببێته قەڵەمی نێوان پەنجەکانی هەموو لاوێ
لەم بیابانی غوربەتی و سەرابستانە
بۆ ڕێبواران
ببێته سێبەری دارو
شنەی نەسیمی بەهارو
هاژە و قەڵبەزەی رووبارو
ڕۆشنایی چاوی کانیاوێ
........
ئەو، پاکیی دەخوێنێتەوە
لە هەر گەشتێك
لە هەر بنار و پێ دەشتێك
چەپکە نێرگز دێنێتەوە
هەلاڵەی ژیان دەچنێتەوە
.........
لە هیواوە دەیناسمەوە
هەمیشە شۆخ
هەمیشە تۆخ
هەمیشە خاکەلێوەیەو
پڕ لە خونچە
لە چرۆ
لە پۆخ
هەمیشە نوێ
هەمیشە جوێ

بە تام و خوێ

هەگبەی پڕە

لە نەخشەی ڕێ

لە پلان

لە داهێنان

لە مۆخ

پڕ لە هەڵوێستی پڕ بە پێست

بە پێی قۆناغ و بارودۆخ

......

لێی بڕوانن!

بۆخۆی قەشەنگ

پەنجەکانی دەورو پشتی چەندە جوانن

ڕازەکانی...

هەموو ڕازی پێشکەوتن و داهێنانن

دێڕەکانی...

مەرەکەبی میهرەبانیی و

شیلەی هەنگوینی ئیمانن

چاوەکانی...

دەڵێی ڕەونەقی ئاسمانن

فرمێسکی...

نمەی بارانن

خەمەکانی...

هەموو هەنیسکی گریانی زامەکانی نیشتیمانن

لێی بڕوانن
ئای کە دڵێکی زیندووە ! !
لەگەڵ بەفردا باریوەو
ساردیی و گەرمیی زۆری دیوە
ئاشنای قوڵایی مێژووە
پێناسێکە
لە قەندیلەوە دەرچووە
.......
قەندیل وتی:
ئەم قەڵەمە
تا پێناسی منی پێ بێ
لەگەڵ تاڤگەدا هاوڕازو
لەگەڵ لوتکەدا هاوڕێ بێ!
گوێتان لێ بێ!
خۆشم دەوێ و
خۆشتان بوێ و
با هەمیشە
گوڵدانی دڵی هەموانی
لانەو جێ بێ

# چیای پێشمەرگە

قەندیل و پیرەمەگروون و سەفین و سوورێن و ماکۆك
بۆ دادپەروەریی و چاکسازیی،
پێشمەرگەن و دێنە سەرچۆك
کێوەڕەش و (کلکەی کۆلێن) و (حاجیلە)
وەك چۆن بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین
بوونە ڕم و دەستەچیلە
بوونە سروود و ئاوازی سەرفرازیی
هەمیشە لە پێناو گەل دا،
دەبنەوە قارەمانی ڕێی و
لوتکەی هیوا و ورە و باوەڕ و شانازیی

# بەڕێوەین

٢٠٠٨/٢/٧

بەڕێوەین
مەشخەڵێکمان بەدەستەوەو
خولیای خاکەلێوەی خەندە و شکۆی خۆمان و ئێوەین
ئەشقی هەموو خەسڵەتێکی بەرز و جوانین
لەگەڵتانین
بۆ فرمێسکی هەموو بەردێك
ئێمەش هەنیسکی گریانین
لە حەسرەتی هەموو دەردێك
ئێمەش (تا) و ئازار و ژانین
لە حەسرەتی شەوی دەیجوور
بە چاوی نوور
دوور دەڕوانین

# چیای پێشمەرگە

قەندیل و پیرەمەگروون و سەفین و سووریێن و ماکۆك
بۆ دادپەروەریی و چاکسازیی،
پێشمەرگەن و دێنە سەرچۆك
کێوەڕەش و (کلکەی کۆلێن) و (حاجیلە)
وەك چۆن بۆ رۆژی راپەڕین
بوونە رم و دەستەچیلە
بوونە سروود و ئاوازی سەرفرازیی
هەمیشە لە پێناو گەل دا،
دەبنەوە قارەمانی رێی و
لوتکەی هیوا و ورە و باوەڕ و شانازیی

# بەڕێوەین

٢٠٠٨/٢/٧

بەڕێوەین
مەشخەڵێکمان بەدەستەوەو
خولیای خاکەلێوەی خەندە و شکۆی خۆمان و ئێوەین
ئەشقی هەموو خەسڵەتێکی بەرز و جوانین
لەگەڵتانین
بۆ فرمێسکی هەموو بەردێك
ئێمەش هەنیسکی گریانین
لە حەسرەتی هەموو دەردێك
ئێمەش (تا) و ئازار و ژانین
لە حەسرەتی شەوی دەیجوور
بە چاوی نوور
دوور دەڕوانین

# پەیامی مەزڵومان[1]

٢٠٠٩/١/٥

کوردستانم...

نیشتمانی کارەسات و بەرخودانم،

لەوەتەی خوا پێی بەخشیوم و

چارەی لە چارە نووسیوم و

چاومان بەیەك هەڵێناوەو

لە نێو دڵیدا رسکاوم و

لە نێو دڵمدا رسکاوە!

رقی پیرۆز، لە تاغوت و دەستەڕەشەکانی تاوان

پەرۆش و سۆز، بۆ مەزڵومان و چەوساوان

لە قوڵایی و ناخی خاکیدا نێژراوە

هاوسەنگەری هەموو خاکێکی سوتماك و

---

[1] دیارە رژێمی زایۆنی، زۆر جاران دڕندانە پەلاماری فەلەستینی داگیرکراوی بە گشتی و کەرتی غەززەی بەتایبەتی داوە و خەڵتانی خوێن و خاپوری کردووە، بۆ نموونە: پەلاماری (٢٣) رۆژەی ٢٠٠٨/١٢/٢٧ بۆ سەر غەززە، کە زیاتر لە ٥٠٠٠ کوژرا و برینداری لێکەوتەوە و زوربەشیان ژن و منداڵ بوون، هەروەها پەلاماری دڕندانەی هەوایی و دەریایی و زەمینیی دیکەی هاوشێوە لە ٢٠١٢ و ٢٠١٤، ئەمانە ئەو دڕندایەتی و داگیرکاریانە بوون بۆ سەر گەل و خاکێکی هاوشێوەی کورد و کوردستانی داگیرکراو و ستەمدیدەی خۆمان و، قەڵەم و ویژدان، بێ دەنگیان بە شەرمەزاریی زانی و نەیان توانی بێ دەنگ و بێ هەڵوێست بن لە بەرانبەر ئەو ستەم و ستەمکارانەدا!!

بەبۆمبا و تۆپ دابێژراوە

بێ قەید و شەرت

سوپای نەفرەتی بۆ هەموو داگیرکەرێك دەڕێ ناوە

***

کوردستانم...

دەستە خوشکی فەڵەستینی داگیرکراوە

هاوڕێی قودس و

غەززەی خەڵتانی خوێناوە

ئەی نابینن!!

کوردستان و فەڵەستینم بەیەکەوە

بروسکەیەکیان بۆ مرۆڤایەتی لێداوە:

مرۆڤایەتی! مرۆڤایەتی!

هەموو ئینسانێك، ئازادی و کامەرانیی،

هەموو خاك و نیشتیمانێك، شکۆمەندی و ئاوەدانیی،

هیوایەتی و

داوایەتی

***

کوردستان و فەڵەستینم بەیەکەوە

یەك پەیامیان بۆ بەردەمی ویژدانی دنیا هێناوە:

مافی بوون و سەروەریی و ژیان

قەوارە و کیان

بۆ هەرهەموان!

ئەوەی خوێنڕێژ و دڕندە و ستەمکارە

هەر یەك نییە

بە نیگایەك

سەدان سەددامت لێ دیارە..

نیگایەکەو

ملیۆنان مرۆڤی چەوساوە و دەیان میللەتی بێ چارە...

خاکی سوتماك و وێرانە و نێو بۆردومانی کوێرانە

نە تەنها نیشتیمانێکەو

نە یەك شوێن و گوند و شارە!

دوێنێ هەڵەبجە و گرۆزنی بوو

ئەمڕۆش غەززە

نێچیری داگیرکەرێکی هار و ملهوڕ و غەددارە

***

ئێستا غەززە

بەسەر کەناری دەریاوە

تینوی ئاوە!!

بەخۆیی و پەرداخێکەوە

راوەستاوە

لەجیاتی ئاو

باڕووتی بۆ دەکرێتە ناو

لەجیاتی بەزەیی و شیفا و عوزر و پاساو

دەریا و زەوی و ئاسمانی بۆ دەکرێتە داو

ئێستا غەززە

لایەك قەڵای بەرخودان و

کێوی ورە و کۆڵنەدان و

لایەك کەف و کوڵی خوێنی هەزاران زارۆ و پیرولاو

بۆتە لافاو

لایەك هەڵمەت و هیممەت و نرکە و نەڕەی موقاوەمەو

ڕەفزی دیلی و تەسلیم بوون و موساوەمەو

بریسکەی شمشێری هەڵکێشراو

لەلایەك زریکەی منداڵ و

پیر و کەنەفت و بێ حاڵ و

دایك و باوکی جەرگ سوتاو

هەنیسك و قوڵپی گریان و

داباریني، ئەسرینی خوێنینە،

لە چاو! !

***

ئێستا غەززە

بەدەم کەڵبەی (باڕاك)[1]ەوە

بەدەست سیستەمێکی (بۆش)[2] و

ویژدان مردوو و بێ باکەوە!

---

[1] ئیهود باڕاك، ٣٥ ساڵ لە سوپای ڕژێمی زایۆنی دا بووە.

[2] مەبەست لە سیستەم و سیاسەتی دووفاقەی ئەمریکایە، دیارە سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکای هاوپەیمانی سەرسەختی ڕژێمی زایۆنییش (جۆرج بۆش)ی کوڕ بوو!.

به پێی پیلانێکی شووم و
نا مرۆڤانە و ناپاکەوە
خەڵتانی خوێنە و خاپوورە
ئێستا غەززە
چاوی هەموو ئازادیخوازانی دنیاو
ترپەی دڵی چەوساوان و بێ ماوای نزیك و دوورە
ئێستا غەززە
شۆڕشگێڕێکی جەسوورو
جەنگاوەرێکی گیانفیدا و رق ئەستوورە
ئێستا غەززە
چقڵی چاوی هێزی شەڕو
مەڵبەندی هێزی باوەڕو
سوپای نوورە

***

کوردستانم...
بە غەززەی خوێناوی دەڵێ:
غەززەی هاودەرد!
غەززەی هاوڕێی دێرین و مەرد!
ئەی گیرۆدەی هەناوێکی رەشتر لە شەو
رقێکی شێت
دڵێکی پڕ لە غەرەز و رەقتر لەبەرد
ئەی خاوەنی باوەڕێکی تۆکمە و بێ گەرد

لای من (جودی)ی[1] و لای تۆش (ئەقسا)
لای تۆ هێزی داگیرکەر و لای میش هەروا
لای هەردووکمان
دنیایەك لە خەون و هیوا
بۆ هەموانیش، ئیفتیخاری (سەڵاحەددینی ئەییوبی)
سەرکردەی بەبیروبڕوا و فاتیحی یەکەم قیبلەگا
چاوم لێ یە و چاوت لێیە
بە ئیزنی خوا
ئاسۆ روونە و ئاڵای سەروەرییمان پێیە
هەڵۆی لوتکەی سەرکەوتنین
هەرگیز ناگەڕێینەوە دوا
هەرگیز ناگەڕێینەوە دوا

[1] ئەو چیایەی دەکەوێتە باکوری کوردستان و لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوەو کەشتیەکەی (نوح پێغەمبەر)ی سەلامی خوای لەسەر بێ، دوای تۆفانەکە لەسەر وەستاوەتەوە(...وَاسْتَوَتْ عَلَى الجُودِيِّ...) هود-٤٤.

# پەیامی خزمەتگوزاریی و چاکسازیی

رانیە ٢٠٠٩/٦/٣٠

نەك هەر ئێستا
لەوەتەی هەم
لەوەتەی شەونمی باوەڕ
تك تك دەڕژێتە نێو جەستەم
لەوەتەی ئامێزم لە چیا وەرێناوەو
هاوڕێی سەنگەرم، پێشمەرگەم!
پەیامی من
سپی، سپی
ڕۆشن، ڕۆشن
گەش، گەش، وەك چاوی سەرکەوتن
هێدی، هێدی
بەڵام بە گیانی نەسرەوتن
بەڕێوەیە و لەبەرانبەر
ورد و درشت و گەنج و پیر و پیاو و ژن
تاك و خێزان و کۆمەڵگەو
دەسەڵات و سیاسەت و بەڕێوەبردن
بەرپرسیاریی و خەمخۆریی خستۆتە گەردن

ئەم پەیامەش
ئامانجەکانی کردوونە دوو چەمك و بەش
(خزمەتگوزاریی)و(چاکسازیی)
تا بەم دوانە
لەلایەك باشترین خزمەت بکا پێشکەش
تا گەشەدا بە خەرمانی چاکە و جوانی و دەستکەوتەکان
تا بێتەدی بۆ نیشتیمان
ئێستا و ئاییندەیەکی گەش
تا هەموان بۆ هێنانەدی
ئاوات و ئامانجی هاوبەش
بکاتە یەك گیان و یەك لەش
تا سەری دوژمنانی کورد
بدا لەبەرد،
بگرێ لە هەش
تا ئاڵامان شەکاوە بێ و
بەرز وەك قەندیلی سەرکەش
لایەکی دی
هەتا خراپە و گەندەڵی و زوڵم و غەدر و غەش
خاشەبڕ بێ و
رۆشن بێتەوە شەوی رەش
..........

جارێکی تر

پەیامەکە بخوێننەوە

یەك بەیەکی وشەکانی بدوێننەوە

لەبەر نیگای ئاوێنەی رەسەنایەتی

لەگەڵ بەژنی کەڵەگەتی کوردایەتی

لەگەڵ هەڵوێست و بوێریی و مەردایەتی،

رانوێننەوە

چ پەیامێکی سەنگینە !

چ پەیامێکی زێڕینە !

چ پەیامێکی دێرینە !

چ پەیامێکی هەڵقوڵاوە،

لە قوڵایی هەقیقەت و راستەقینە !

ئەمە دینەو

خواستی ژینەو

چاوەڕێی هەوڵ و خەبات و رەنج و تینە

چاوەڕێی دەنگ و رەنگ و

رێبواری ژیرو چەلەنگ و

راماڵینی شەوەزەنگ و

تەختکردنی ئاستەنگ و

راچەنین و بێداربوونەوە و بەخشینە

........

تێگەیشتوون ! !

من لە کەیی و بەکام هەگبەوە و لە کوێوە

لە کام ڕێوە ! ؟

بۆ تەواوی خواستە ڕەواکانی ئێوە

بۆ دادپەروەریی و ڕزگاریی

بۆ پێشکەوتن و داهێنان

بۆ ئاوەدانیی و بەختیاریی

بۆ ژیار و ژیان

بۆ کوردستان

بۆ کۆمەڵی کوردەواری

پەیامی خزمەتگوزاریی و چاکسازییم پێیە بە دیاری

# پەیامی دادگەریی و چاکسازیی

مانگی ٧ی ٢٠٠٩ رانیه

لە (زاخۆ)و (دهۆك)ی بووکی کوردستان و

لە (هەولێر)ی پایتەخت و دێرینەوە

لە (سلێمانی)ی شاری هەڵمەت و قوربانی و

دلێریی و نەبەزینەوە

لە (گەرمیان)ی پڕ لە حەماسە و سەروەریی،

لە (دەربەندیخان)و (کفری)و (کەلار)ی ئاگرینەوە

لە (باوەنوور)و (مەیدان)و

(رزگاری)ی ئەشك و شینەوە

لە(بارزان)و

(ئاکرێ)و (ئامێدی)و (هەڵگورد)و (مەتین)ەوە

لە(سۆران)و (رەواندوز)و (چۆمان)و (قەصرێ)و (گەڵاڵە)و

(کۆدۆ)ی جوان و زێڕینەوە

لە(شارەزوور)و (هەڵەبجە)ی

بە ئازارو خوێنینەوە

لە(هەورامان)ی دلگیرو (عەربەت)و (سەیدسادق)و

لە(پێنجوێن)ی چقڵی چاوی دوژمنانی لەعینەوە

لە(شاربازێڕ)ی رازاوەو

(جافایەتی) ورەو تەوژم و تینەوە

لە(چەمچەماڵ)و (بازیان)و
(شوان)و (شۆڕش)ی کۆست کەوتوو و حەزینەوە
لە(دوکان)و (تەکیە)و (سەنگاو)،
(قەرەداغ)ی سەنگەری پۆلاییینەوە
لە(خەلیفان)و (هەریر)و
لە(شەقلاوە)و (سەفین)ەوە
لە(خەبات)و (کۆڕێ)و (پیرمام)و (قوشتەپە)،
لە(بنەسلاوە)و (دەشتی هەولێر)ی بە پیت و بەرینەوە
لە(پردێ)و (کۆیە)و (تەقتەق)و
(خەلەکان)و (بالیسان)و (هیران)و (نازەنین)ەوە
لە(رانیە)ی نرکە و نەعرەتەو
لە(بیتوێن)ی مەڵبەندی راپەڕینەوە
لە(قەلادزێ)و (پشدەر)ی قەلای شۆڕش و
خەبات و راچەنینەوە
لە(خۆشناوەتی) چاپووك و
نەوبەهار و رەنگینەوە
لە(مەرگە)ی هیممەت بڵندی و
قارەمان و سەنگینەوە
لە(ئاکۆیەتی)و (ناودەشت)و
(باڵەکایەتی) ئەمەك و جوامێریی و گیانبەخشینەوە
لە(بناری کۆسرەت)ی رەسەنایەتی و
وەفاو خوڵقی شیرینەوە
لە(زمناکۆ)و (سورێن)و (پیرەمەگروون)و

لە(قەندیل)ی بەفرینەوە
بە پشتیوانی خوای گەورەو
متمانەی هاوولاتیانی شاران و گوندنشینەوە
بەیەکەوە ئایندەیەکی گەشەدار
بۆ نیشتیمان دێنینەوە
بە زمانی شیرینی کوردی و
حەماسەی گەرمی(کەرکوک)و (حەمرین)ەوە
بە مەرەکەبی فرمێسکی،
(سنجار)و (دووز)و (مەخموور)و (مەندەلی)و (خانەقین)ەوە
لەسەر سینگی خاکی کوردستانی ئازیز
پەیامی پاکی دادگەریی و چاکسازیی دەنووسینەوە.

# من مامەوە

٢٠١٣/٤/٤

دیرۆکێکە...
لوتکەیەکی نێو هرووژمی
هەور و تەمم
دەروونێکی خرۆشاو و پڕ لە ورە و هەست و هیوای،
بەردەم هەژموونی کەسەر و کۆست و خەمم
ڕێبوارێکی ماندوونەبووی،
ڕێیەکی عاسێ و ئەستەمم
جەستەیەکی بەگوڕی خەڵتانی خوێنم
وەك بەور دێم و ڕێ دەکەم
چرای ڕێگەم
بە خوێنی گەشم پێ دەکەم

***

دیرۆکێکە...
بست بەبست و
شوێن بە شوێن و
بە خۆم و ئارەقە و خوێن و
ورە و بڕوا و بیر و مەچەك و چەکمەوە
بەگژ سوپای داگیرکەراندا دەچمەوە

لەگەڵ هەر پیلان و گلان و تلانەوەیەك
مەردانە تێهەڵدەچمەوە و
دەستەملانی گەردنی لوتکە دەبمەوە

***

نە بۆمبا توانی بمکوژێ و
نە خەردەل توانی یەکجاریی بمخنکێنێ
نە زەبر توانی تخێڵم کاو
نە شاڵاوی ئەنفال توانی
قڕم کاو
خاشەبڕم کاو لە ڕیشەوە دەرم بێنێ
نە سێکوچکەی ( تەعریب و تەبعیس و تەهجیر)
توانیان...
بە هەموو هێزی پیلانیان
لەم سەر خاکە بمسڕنەوەو
داری هیوام ببڕنەوە

***

من سەربەرزانە مامەوە
نە توامەوە
بە خۆم و نیشتیمان و بڕوامەوە
بە چەك و چیا و بە قەڵەم و ئاڵامەوە
بە مەشخەڵی ڕاپەڕین و نەبەردییەوە

گەڕامەوە و
بە ئاسمانی ئازادییەوە
سوڕامەوە

***

من مامەوە و
ئەوان تێچوون
لە بەردەم خوا و خەڵك و مێژوو
خەجاڵەت و
ڕووزەرد و ڕووسیا و سەرشۆڕ بوون
گۆڕ بەگۆڕ بوون

***

تەماشاکەن!
ڕژێمێك لێمان بوو بە زوحاك
ئەم نیشتیمانە حەڵاڵ و موبارەکەی
کردە موحەڕڕەمە و سوتماك
بوو بە دەجال
کوردستانی،
ناونا: شیمال!
قڕانی کوردی،
ناونا: ئەنفال!
بوو بەئافات

ئافاتی مزگەوت و قورئان

ئافاتی ژیان

ئافاتی گیان و چاو و دڵ

ئافاتی  کانیی و تاڤگە و گوڵ

ئافاتی دار و بەرد و گڵ

ئافاتی سەراپای وڵات

بەڵام سەرەنجام چی لێهات!!؟

کەوتە بەر غەزەبی خوایی و

بوو بە نموونەی ریسوایی،

خۆری  کورد و کوردستانیش

لە ئاسۆی ئازادی هەڵات

لە ئاسۆی ئازادی هەڵات.

# ناسنامە

٢٠١٣/٨/٢٨

بە (بسم الله)

بە ناوی  خوای بەخشندە و میهرەبانەوە

بە جەوهەری  ئیمانەوە

بە دادگەری  قورئانەوە

بە ڕێباز و ڕاز و ڕێبەری ژیانەوە

بە گەوهەری  ویژدانەوە

بە ئازار و هاواری نیشتیمانەوە

بە خەرمانی سەروەریی و تێکۆشانەوە

بە خوێنی شەهیدانەوە

کەوتوومە ڕێ

دڕ بە تاریکی شەو دەدەم

دەبڕم چخورد و هەوراز و

نشێو و ئەستەم و عاسێ

لە هەناوی ئازادییەوە لەدایکبووم

کۆیلەی ترس و کورسی و شەهوەت و پارە نیم

غەوارە نیم

سینگم دەفتەری مێژوویەو

ڕەگ و ڕیشاڵی داربەڕووم
سەرتان لەبوونم نەتاسێ
دەبڕوانن!
دار و بەردو
کێو و هەردو
بست بە بستی ئەم کوردستانە، دەمناسێ
من و (جودی)ی و قەندیل و هەڵگورد و سەفین
من و شۆڕش و ڕاپەڕین
من و کانیی و تاڤگە و کارێز
من و سۆز و حورمەت و خۆشەویستی و ڕێز
ناخمان ئاوێتەی یەکترەو
دڵمان بۆ یەکتر هۆگرەو
بێ یەکتر ناژین هەناسێ
........
کە من لەم خاکە خولقاوم
چۆن نیشتیمانم خۆش ناوێ!؟
کە من بە ئاوی سازگاری
ئەم خاکە رواوم، تێراوم!
چۆن بۆی نابمە قەترە ئاوێ!؟
هەرکەس لە پەپوولەیەکی گوڵزارەکانی من ڕاسێ!
هەر کەس تیرێك
بە ئاراستەی سینگی نیشتیمانم باوێ!

بە چاوی پیس لێی بڕوانێ و

داو و پیلانی بۆ دانێ و

بیکاتە نێچیری راوێ!

جا هەرکێ یەو

لە هەرکوێ یەو

هەرچی پێیەو

هەرچی نێوە

سەری دەخەمە ژێر پێوە ! !

........

یەکەم هەنگاو

لەگەڵ شنەی شەماڵی بەختەوەرییدا

بوومە هاوڕێ و

لەوساتەوە

لەگەڵ ئاو و خاك و خۆڵی سەراپای ئەم وڵاتەوە

دەستم لە دەستی نوور ناوەو

بە پەیامی دادگەرییەوە هاتوومەوە

بە پشتیوانی خوای گەورەو

متمانەی گەل رابوومەوە

لەگەڵ شەو و چەواشەیی، دەستەویەخەم

بەگژ ستەمدا چوومەوە

تا ماڵ بە ماڵ و وار بە وار

تا شار بەشار

تا دێ بە دێ

خۆری بەختیاریی لێ هەڵ بێ و

وڵات یەکپارچە مەشخەڵ بێ و

قڕانی گەندەڵی و گەندەڵ بێ و

کوردستان...

بە تیشکی خۆری دادگەریی

ببێتە بەهەشتی هەموان

# تـاڤگەی نوور

٢٠١٣/١١/٤

تاڤگەیەکە
لە کەوسەری سازگارەوە
لە زەمزەمی زوڵاڵی کردگارەوە
لە هەنگوینی خوڵاسەوە
بە چاکترین شوناسەوە
بە پاکترین هەناسەوە
بە جیهانێك سۆز و پەرۆش و تاسەوە
لە قوڵایی شەوگارەوە
لە کوێستانی نیگاوە دێ
بە بەرزترین قامەت و باڵاوە دێ
بە جوانترین ئاڵاوە دێ
بە گەوهەری هەقیقەت و
ئەسڵترین کاڵاوە دێ
لە پیرۆزترین مەڵبەند و هەوارەوە
بە پرشنگی زێڕینەوە
بە گوڵاوی خۆشەویستیی و ئەوینەوە
دەڕژێتە نێو،

نیشتیمانی مەدینەوە

دەڕژێتە نێو،

خۆر و مانگ و گەلاوێژو

بست بەبستی ئەم ئاسمان و زەمینەوە

******

لەوەتەی ئەم خۆرە خواییە

بەڕەونەق و جەماڵیەوە

بەشەوکەت و کەماڵیەوە

بەپەیامی زوڵاڵیەوە

لەتەمەنی چلساڵیەوە

بەگەشترینی رەنگ و روو

بەخۆشترین تام و بۆوە

دەرکەوتووە لە ئاسۆوە !

هاژەی تاڤگەی رەحمەتێکی نەبڕاوەیەو

بە بێ وچان هەموو ساتێ

لەسەر هەر خاك و وڵاتێ

لەنێو هەر دەروون و جەستە و ماڵ و خانوو و

خێمە و رەشماڵ و ساباتێ

دەبێتە گیان

دەبێتە سارێژ و چارە و شیفا و هەتوان

دەبێتە شۆڕش و بزاف

دەبێتە خەرمانی خێر و بەختیاریی و ماف

دەبێتە سەرمەشقی هەموان
دەبێتە ژوانی ئازادیی و
ئاشتیی و ئاسوودەیی و شادیی و
درەوی ستەم و بێدادیی و
تاوان و زیان
دەبێتە پردی پەیوەندیی و
چاکە و مەردایەتی و رەندیی و
پێشکەوتن و بەهاری ژیان
دەبێتە رێنیشاندەرو
چرا و مامۆستا و رابەرو
گەورە و سەردار و سەروەری،
مرۆڤایەتی و هەموو جیهان
دەبێتە سۆمای چاومان و
هێزی دڵ و هەناومان و
تین و تەوژم و تاومان و
هەناسە و نان و ئاومان و
مەشخەڵی رێی هەنگاومان و
حەبیبی کورد و کوردستان!!

# بەرەو سەرکەوتن دەڕۆین

لەسەرچاوەی هەقیقەتەوە هاتووین
بەڕۆشنایی و ڕاستەڕێدا کەوتووینە ڕێ
بە سەراب و ئاوازی ناسازی شەو و شۆفارەکان
فریو ناخۆین

بەئاو و هەوای سازگاری
کوێستانی ژینی ئازادیی و سەرفرازیی گۆشکراوین،
خاوەن سەرووەریی و شکۆین

لەگەڵ نووردا دەستەملانێین
پرشنگی خۆری ئومێد و سپێدەی چاوی ئاسۆین

وابەستە نین، دابەستە نین
لەبیرکردنەوە و بڕیار و هەڵوێستماندا
هەتا ئەوپەڕ سەربەخۆین

دژی بەکۆیلەکردنین
دژی ئیرادەکوشتنین
دژی تۆبزی لێکردن و بەلاڕێگەدا بردنین
نەهیچ کەسێك سوێند دەدەین و نە تەڵاق بە کەس دەخۆین[1] ! !

---

[1] بێگومان لە شەرعدا سوێند بە تەڵاق ناخورێ و کەسیشی پێ سوێند نادرێ، ئەمە عورفێکی هەڵەی کۆمەڵگایەو باوە، بۆیە هێناومە.

پارەی گەل نابەشینەوە و وڵات بەتاڵان نابەین
نەقۆڵی هیچ کەسێك دەبڕین
نەدەنگی هیچ کەسێك دەکڕین
نەدەبینە دزی بازاڕی شێواو و
فرت و فێڵ و (ئاین و ئۆین)

بۆ چاکسازیی راستەقینە و ریشەیی هەوڵ دەدەین
دژی خۆڵ لەچاوکردن و
ئیشی بەپینە و پەڕۆین

بەختەوەریی دنیا و دواڕۆژی مرۆڤەکان ئامانجمانە
زەردەخەنەی لێوی ژیان و
هیوای دڵی پڕ لە ناسۆر و بۆسۆین

بۆ دەروونی وشکارۆی خاکی نیشتیمان
سەرچاوەی (زەڵم)[1] و (بێخاڵ)[2] و
(سۆلاڤ)[3] و (شێخی باڵەك)[4] و (قولە)[5] و
(کوڕکوڕ)[6] و (هەڵشۆ)[1]ین

---

[1] دەکەوێتە پشت گوندی(ئەحمەداوا)ی سەربە خورماڵ.
[2] دەکەوێتە قەزای رەواندزێ.
[3] دەکەوێتە پارێزگای دهۆك.
[4] دەکەوێتە شارۆچکەی حاجی عومەران.
[5] دەکەوێتە ناو شاری رانیە
[6] دەکەوێتە گوندی (کانی توو)ی بەری مەرگە.

هەنگاوی هەستانەوەین
خاراوی ژان و ناسۆر و گێچەڵ و زوڵم و نسکۆین

ژیلەمۆی شۆڕشی نوورین
بۆ بێدادیی و چەواشەیی و ستەمکاریی،
بورکانی بەگڕ و کڵپە و تین و پرپیشك و پشکۆین

لەگەڵ رەسەنایەتییدا جەستە و گیانین
دژی بێ بەندوباریی و لاساکردنەوەی کوێرانەو
کلتور و بیری نامۆین

بۆ سەربەخۆیی و بونیادی قەوارە و دەوڵەتی کوردی تێدەکۆشین
ئەی کوردستان!!
پارێزەری دین و ژینی گەلی کورد و سنوور و سەروەریی تۆین

دەستی ناز و نزا و ئاشتیی و ئاوەدانیین
پێشمەرگەی خوا و خاك و خەڵکین
بەورین، پڵنگین، هەڵۆین

پشت بەخودا و هیممەتی کوردی مسوڵمان
بەرەو سەرکەوتن دەڕۆین
بەرەو سەرکەوتن دەڕۆین

---

[1] دەکەوێتە ناحیەی هەڵشۆی پشدەر.

# دیکتاتۆر

لێبڕوانن!
دیکتاتۆران هەرچەندێکن
لەهەر شوێنێکی جیهانن
هەر بەرگێکیان دەبەردایەو
هەر بیرێکیان دەسەردایە
بە خووخدە، یەك ئینسانی نا ئینسانن!!
هەتا ئەوپەڕ
بێ بەزەیی و بێ ویژدانن
تینووی خوێنن
نوقمی ستەم و تاوانن
مەرگ و وێرانی و کارەسات دەبارێنن
ژانی ژیانن
لایەك کۆیلەی کورسی و نەفس و
دنیا و شەهوەت و شەیتانن!
لایەکی دی
خۆیان بەخوا و خەڵکیش بە بەندە دەزانن!!
هەرچەند دواجار، یەك لەدوای یەك
نێچیری داو و کەمەندی خەشمی خوداو

گڕی ڕقی چەوساوانن!

بەڵام هەرگیز پەند لەیەکتر وەرناگرن

پێیان وایە

هەرەس ناهێنن، نامرن

تا هەتایە حوکمڕانن!

بەم شێوەیە دەیسەلمێنن

گەمژەترین کەس، ئەوانن!!!

# شكۆی شەوڕەوی و بەرزبوونەوە

شەوڕەوی و بەرزبوونەوە
هەڵاتنی خۆری هیوان
لە ئاسۆیەکی روونەوە
گوڵاوی خانەخوێیەکی میهرەبانن
بۆ یەك میوان
لە جوانترین دنیا و دیوان
دەڕژێنە نێو دەروونەوە
.......
ئیسرا و میعراج
دوو وێسگەی پڕ لە موعجیزەی پێغەمبەری سەروەرمانن
دوو ئاسمانی پڕ ئەستێرەی درەخشانن
دوو فێرگەی پڕ لە عیبرەت و وانەی ژیانن
ئیسرا و میعراج
بۆ پێغەمبەری سەروەرمان
تەقدیر و رێزن،
شکۆ و تاج

# بۆ مامۆستای مرۆڤایەتی

پێغەمبەری گەورەی ئیسلام!
هەڵگری پاکترین پەیام
سەربازە گیانفیداکانت
دەڕۆنە پێشێ بەردەوام
ڕێگا دەبڕن، دەبڕن ڕێگا
(الی الامام)

******

ئەی پێغەمبەر
سەرکردە و سەردار و سەروەر
پەیمان بێ تا گیانمان لە لاشە دێتە دەر
ڕێبازەکەت دەگرینەبەر
فەرمانت دەخەینە سەر سەر

******

ئەی (موحەممەدول موستەفا)!
تۆ پێغەمبەری رەحمەتی
تۆ خاوەنی شەفاعەتی
تۆ لوتکەی ئەخلاقی بەرز و

خاوەن جوانترین خەسڵەتی
تۆ ئەمینداری ئوممەتی
تۆ سەروەر و سەرداری دنیا و قیامەتی
ئەی پێغەمبەری خۆشەویست!
دوایین خشتی بینای پێغەمبەرایەتی
تۆ سەرقافڵەی کاروانی پێغە مبەران و
بەرزترین کەسایەتی
تۆ پێشەنگی مەردایەتی
تۆ مامۆستای مرۆڤایەتی

******

ئەی خۆشەویست!
مامۆستا و سەرمەشقی ڕێمان
سوپاس بۆ خوا
دەنگی بانگی زوڵاڵی تۆ
هەردەم دێ لە شار و دێمان
کوردستانمان دەڵێ پێمان:
پەیام و پەیڤەکانی ئەو
تا هەتایە، بۆ ئێمە ناسنامە و هێمان
بە شاهێدی و بەڵگەی مێژووی کۆن و نوێمان
ئیسلام لەگەڵ چیاکانمدا

دەستەملانە

ئیسلام گیانە

ئیسلام ژیانە

******

تا دڵ لـــە لێدان دەکـــــەوێ

(رسول اللە)مـان خۆش دەوێ

دەستمان لەنـاو دەستی دایـە

هەر ئەو سەرمەشقی ڕێگایە

# من وەرچەرخانی مێژووییم

١١/ ٣/٢٠١٤

وایانزانی
بە دۆزەخی رق و کینە و کیمیایی  و بێدادیی و زوڵم
دەتوێمەوەو
دەبمە گەرد و تۆز و هەڵم
نەیانزانی
هەموو کوچە و کۆڵانێکم
بۆ ئازادیی
دەبن بە سەرچاوەی (زەڵم)
........
وایانزانی
تاهەتایە تاڵاوی ستەم دەنۆشم
هەر بەرگی ماتەم دەپۆشم و
رۆژم ڕابرد
تازە دنیای روون بەچاوان نابینمەوەو
کورد گوتەنی: ئەو بابەم مرد!
نەیانزانی
سەرلەنوێ تێهەڵدەچمەوەو
دەبمە هێما و ناسنامەی ستەمدیدەیی میللەتی کورد

(باوەکۆچەك)[1]

باڵا دەکاو

دەبێتە سەفین و هەڵگورد

(کانی ئاشقان)[2]

دەبێتە ژیلەمۆی ئەشقی درشت و ورد!

........

وایانزانی

لە بەرامبەر دیکتاتۆرو

زەبرو زۆرو

کەمەندی تۆمەتی تیرۆر

بەچۆکدا دێم

نەیانزانی

قامەتی من وەك منارەو

شیعری (ئەحمەد موختار جاف و نالی و خاکی)ی

کەڵەگەتەو

کێوی ورە و هەنگاوی رێم

وەکو قەندیل بە هیممەتەو

وەکو شەهید بەهەیبەتەو

نالەرزێ پێم

---

١ ناوچەیەکە دەکەوێتە باشووری هەڵەبجە و ئێستا سەیرانگایە.

٢ گەڕەکێکە لە شاری هەڵەبجە و دوای راپەڕینی ١٩٨٧/٥/١٣ی جەماوەری شارەکە، رژێمی بەعس خاپووری کرد.

وایانزانی
بەیەکجاری دەبڕێمەوە
جارێکی دی،
بۆ ئامێزی نیشتیمان ناگەڕێمەوەو
لەسەر نەخشە دەسڕێمەوە
نەیانزانی
من وەرچەرخانی مێژوویيم
بە نەعرەتەی راپەڕینەوە دێمەوە
لەگەڵ پێنج هەزار (شنرویّ)[1] و
هەزاران گوڵاڵە سوورەی نیشتیمان و
ملیۆنەها ئەویندارى کوردستان و
لەگەڵ (قامیشلو)و (هەولێر)و (سنە)و (وان) دا
سروودی سەربەخۆیی، دەڵێمەوە، دەڵێمەوە، دەڵێمەوە.

---

[1] چیایەکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی هەڵەبجە.

# چرای مامۆستا و مامۆستای چرا

۲۰۱٤/٤/۱٥ رانیه

شەوێکی ئەنگوستەچاو بوو
چراکان هەموو خامۆش بوون
جادە و شەقام، درەختەکان
سیپاپۆش بوون
باخچەکان
سیس و نەخۆش بوون
یەکێکم دی چرایەکی هەڵکردووە
شەو رۆشن بوو...
تاریکی لە چاوان ون بوو...
جادە و شەقام، درەخت و باخچە
گەش بوونەوە
تارماییەکان
رەش بوونەوە
هەموو شتێك کەوتە حاڵی
راسان و تێهەڵچوونەوە
وتم ئەرێ ئەی نیشتیمان!؟
ئەوە کێ بوو
چرای پێ بوو!؟
وتی: ئەوە مامۆستا بوو

# چرای مامۆستا و مامۆستای چرا

٢٠١٤/٤/١٥ رانیه

شەوێکی ئەنگوستەچاو بوو
چراکان هەموو خامۆش بوون
جادە و شەقام، درەختەکان
سیپاپۆش بوون
باخچەکان
سیس و نەخۆش بوون
یەکێکم دی چرایەکی هەڵکردووە
شەو رۆشن بوو...
تاریکی لە چاوان ون بوو...
جادە و شەقام، درەخت و باخچە
گەش بوونەوە
تارماییەکان
رەش بوونەوە
هەموو شتێك کەوتە حاڵی
راسان و تێهەڵچوونەوە
وتم ئەرێ ئەی نیشتیمان!؟
ئەوە کێ بوو
چرای پێ بوو!؟
وتی: ئەوە مامۆستا بوو

نەك هەر چرایەك

هەزاران چرای لەدەستا بوو

هەزاران چرای،

لەبیر و زەین و هەستا بوو!

........

مامۆستایان!

پایەی ئێوە بەرزترە

لە پایەی میر و پاشایان

کێ وەك ئێوە!

شایستەیە و شیاو و شایان

بۆ خەڵات و

رێز و حورمەتی بێ پایان!

وتیان: ئەمە بەچاوپۆشی بیر و رایان!؟

وتم: بەڵێ

چونکە لایان

ئامانج پێشکەوتنی گەل و نیشتیمانە

بە هەموو هێز و توانایان.

# شیفا

٢٠١٤/٤/٢١

گوێم لێ بوو، نیشتیمان دەیگوت:

تەنها و تەنها

دڵ و دەروونێکی رووناک

چاوێکی تیژ

گوێ یەکی سووک و زرینگاوە و دەستێکی پاك

شیفایەو

خۆری هیوایە

بۆ  خەم و ئازارەکانی میللەت و خاك

# هاواری ناخ

٢٠١٤/٤/٢١

مێژوویەکە لە حەسرەتی
سوڵتانی بێ موبالات و پاوانخواز و کەڕەمسۆوە
حەمرین لەگەڵ بابەگوڕگوڕ
هەڵگورد لەگەڵ پیرەمەگروون
باواجی و شنرویێ لەگەڵ، گۆیژە و ئەزمڕ
جەرگیان بووە بە خەڵوزو
دەروونیان هەموو بۆتە گڕ
ناڵە و داد و زیڕە و شین و شەپۆڕیانە
فرمێسک دەڕێژن بە خوڕ
دەچریکێنن...
حوت و حەزیاکانی سەردەم!!!
تاکەی سەرمان دەگرن لە قوڕ
ئەوەی ئێوە پێتان کردین
(با) نەیکرد بە دەواری شڕ
ئێوە بەردی زاری (کانی)ین
سواری ئەسپی هەوا بوون و
لە سنووری گەل دەرچوون و
بوونە نیسکی بێ بەر و پشت و بەردی خڕ

بوونە دڵێکی بێ هەست و
سەرێکی بە دنیا مە ست و
گیانێکی پەژموردە و پەست و
ویژدانی سڕ
بوونە ئاوازی ناسازو
دەنگێکی گڕ
بوونە نێوچاوانی گرژو
کەللەی رەق و وێران و وڕ
لەسەر کەوڵی میللەتێکی ستەمدیدە
بۆ سامان و پۆست و کورسی
وەکو برسی
مڕ بوو ون، مڕ! !
وەکو جەواڵی بن دڕاون
قەت نابن پڕ
نەهۆشێکتان دێتەوە بەر
نەمشورێك لە (گەل) دەخۆن
نە دەستنوێژی تەوبە دەشۆن
نە لەکۆڵ دەبنەوە و دەڕۆن
بوونە داری بێ بەر و زڕ
بەبەرداشی زوڵم و بێدادیی و گەندەڵی
گەل و نیشتیمان دەهاڕن
جەرگیان دەکەن ونجڕ، ونجڕ
کەچی هێشتا لە گەڵ ئەوەی بەم شێوەیە

گەل و وڵات
شەهید و سەنگەر و خەبات
بەقەد دنیا لێتان تورەن، لێتان پەستن
ئەوەندە بێ هەست و نەستن!!
بە لوتبەرزی و غرووریکی بێ ڕەزاوە، روو بە میللەت
وەك پاڵەوان و شۆڕشگێڕ،
لەپشت مایکرۆفۆن دەوەستن!!!

# بۆ (یەکەمین رابەر)[1]

٢٠١٤/٦/١٥

---

[1] بەبۆنـــەی کۆچـــی دوایـــی زانـــاو تێکۆشـــەر(مامۆســـتا شـــێخ مەحەممـــەدی بەرزنجی)نووسراوە، کە لەپێشنیوەڕۆی رۆژی هـەینی ٢٠١٤/٦/١٣ لـە سلێمانی بـەهۆی نەخۆشیەوە لەتەمەنی ٦٩ ساڵیدا کۆچی دوایی کـرد، مامۆسـتای نـاوبراو نـاوی تـەواوی (مەحەممەد نەجیب حەسەن)ە، ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی (سەرگەت)ی ناوچـەی هـەورامان لەدایك بووە، ١٩٥٣ دەستی بە خوێنـدن کـردووە، ١٩٦٥ لەسـەر دەسـتی (٤٥) زانـای ئـایینی ئیجـازەی عیلمـی وەرگرتـووە، هـەروەها بڕوانامـەی بەکالۆریۆسـی لـە زمـانی عەرەبی و زانستی شـەرعی دا بەدەستهێناوە، مامۆسـتا زانایـەکی ئـایینی بەرجەسـتە و کەسـایەتیەکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی دیـاری کوردسـتان بـوو، لـە هۆشـیارکردنەوەی جـەماوەر و بەرپەرچـدانەوەی زوڵـم و زۆری رژێمـی بـەعس و خسـتنەرووی راسـتیەکانی ئیسلام و بێدارکردنەوەی مسوڵمانانـدا رۆڵێکی گەورەو کاریگـەری هـەبوو، لەسـەر هـەق گوتن و هەڵوێستی مەردانە چەندان جار تووشی دوورخرانەوە و ئەزیەت و ئـازار هـاتووە، لـە ١٩٨٣/٨/١٦ دا هیجـرەت دەکـات و رێگـای شـۆڕش و تێکۆشـان دەگرێتەبـەر، لـە ١٩٨٤/٩/١٤ (بزووتنەوەی یەیوەندی ئیسلامیی لـە کوردسـتانی عێـراق) رادەگەیـەنن و ئیتر مامۆسـتا شـێخ مەحەممـەد بـەرزنجی هـەرخۆی دەبێتـە یەکـەمین رابـەری ئـەم بزووتنەوەیـە، دوای هیجرەتـی مامۆسـتا شـێخ عەبدوڵلـەتیف واژەیـی رەحمـەتی، لـە حوزەیرانی ١٩٨٦، مامۆستا شێخ مەحەممەد شوێنی خۆی بۆ چۆڵ دەکات و لەجێی ئـەو لە کۆنگرەی دووەم لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٦ دەبێتە رابـەری دووەم و دواتـر (مامۆسـتا مـەلا عوسمـان عەبدولعـەزیز)ی رەحمـەتی دوای چـوونەدەرەوەیان لـە سـاڵی ١٩٨٧دا، دەبێتە سێهەمین رابەری بزووتنەوەکە.

مامۆستا شێخ مەحەممەد بەم شێوەیە لێبڕاوانە بە هەموو شێوەیەك لە خزمەتی ئـاین و گەل و نیشتیمانەکەیدا بوو، تا سەرەنجام دوای ماوەیـەکی زۆر لـە ململانـێ و تەسـلیم

لەوەتەی کەوتۆتە سەرپێ

کەوتۆتە ڕێ...

ئیتر نەچاوی لێکناوەو

نە هەنگاویشی وەستاوە

شار بە شار و دێ بەدێ،

بەشوێن هەڵاڵەی زانست و

شیلەی ئەدەبدا، گەڕاوە

کاتێك ئیجازەش وەردەگرێ

نیشتیمانێك میوەی مەردایەتی دەگرێ و

چرۆی جوامێریی دەردەکاو

بەرگی عیززەت لەبەر دەکاو

گزنگ دەدا ڕۆژێکی نوێ

لەوساتەوە لەڕووی ستەم و داگیرکەر

وشە دەکاتە گڕدارو

مزگەوت و مینبەریش سەنگەر

---

نەبوون بەنەخۆشیە درێژخایەنەکەی، پێش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی ٢٠١٤/٦/١٣ لە تەمەنی ٦٩ ساڵیدا لەشاری سلێمانی کۆچی دوایی کردو لەمەراسیمێکی گەورەدا بەبەشداری جەماوەرێکی زۆر فراوان لە زێدی خۆی لە گوندی سەرگەت بەخاك سپێردرا.

شایانی باسە مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی لە ٢٠٠١/١/٢٢ ەوە تا ڕۆژی وەفاتی، پێشەوای کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان بوو.

پیاوێك لە نوور

دەبێتە یەك پارچە جەوهەر

دەبێتە شنەی شەماڵی ئاشتەوایی و

دەستی برایەتی و تەبایی و

هەتوان و شیفاو چارەسەر

دەبێتە میراتگرێکی رەسەنی  رێگەی (پێغەمبەر)

دەبێتە وڵاتپارێزو

تێکۆشەر و میللەت پەروەر

رۆژ بۆ رۆژێ باڵا دەکاو

ئاسۆی هیوا واڵا دەکاو

هەنگاوی دامەزراندنی شۆڕشی نوور دەگرێتەبەر

هیجرەت دەکاو

دەبێتە پێشمەرگەی رێگای  ئایین و گەل و نیشتیمان

تاجی  شکۆ دەنێتەسەر

دەبێتە سەرقافڵەی کاروان

دەبێتە یەکەمین رابەر

# سەرۆك

٢٠١٣ ـ رانیە

لە بانگەشەی هەڵبژاردندا
جەنابی سەرۆکی وڵات،
لە بەرانبەر گەلدا فەرمووی،
لە دوای ئەوەی ئازادییمان بۆ هێنان بە دیاریی و خەڵات!
ئیتر دەبێ، سەروەریی یاسا بچەسپێ
دیموکراسی بەرقەرار بێ!
ساڵ هات و چوو...
ماوەی یاسایی جەنابی سەرۆکی وڵات تەواو بوو!
بەڵام سەرۆك لە جیات ئەوەی، بۆ وازهێنان بۆ گەل بدوێ!
خۆی سازدا بۆ خولێکی نوێ!
میللەت بەناچاری پرسی
بەڕێز سەرۆك!
بەجێنەهێشتنی کورسی!؟
لەگەڵ کام یاسای کۆن و نوێ
کام بنچینەی دیموکراسیی و
دیموکراسیی کوێ،
دەگونجێ!!؟

# درووود

٢٠١٥

ئێستا جەرگم...
لەگەڵ کزەی جەرگی دایکی شەهیدانا
دەکا ژانێ
ئێستا چاوم...
لە دووربینی ئاسۆی گەشی نیشتیمانەوە دەڕوانێ
ئێستا دڵ و زمان و زەینم
درووود دەنێرن، بۆ شەهید
سروود دەڵێن، بۆ پێشمەرگە
بۆ کوردستان، بۆ کۆبانێ![1]

---

[1] شـــارێکی خۆرئـــاوای کوردســـتانە و دوای ئـــەوەی لـــە ســـەرەتای مـــانگی ١٠ی ٢٠١٤ چەکدارانی ڕێکخـراوی تیرۆرسـت و شـەڕانگێزی (داعـش) بەشـێکیان لـێ داگیر کـرد و ڕۆژانی دواتریش شەڕ و بـەرەنگاریی قورسـی تێـدابوو و داعـش دەسـتی بەسـەر زۆربـەی شـــارەکەدا گـــرت، لـــە ڕۆژی دووشـــەممە ٢٠١٥/١/٢٦ و دوای (١٣٤) ڕۆژ بـــە بـــەرگری جوامێرانەی شەڕڤانان و بەهاناوەچوونی هێـزی پێـشمەرگەی کوردسـتان لـەدوای بڕیـاری ناردنی لە ٢٠١٤/١٠/٢٨و پشتیوانی هێزی ئاسمانیی هاوپەیمانان، چەکدارانی داعشی داخ لەدڵ دەربەڕێندران و تەواوی شارەکە ئازادکرایەوە و داسـتانێکی قارەمانانـەی مێـژوویی تێدا تۆمارکرا.

# گەندەڵی

کە گەندەڵی...
وەك بەڵایەکی بێ ڕەزا
بە ژەهر و نەشتەر و نێزەی،
کەوتە وێزەی،
گیانی حکومەت و میللەت!
وڵات دەبێتە زۆنگاوی
سەدان دەرد و پەتا و عیللەت
قڕی و پڕی و کۆیلایەتی،
چەوسانەوە و زوڵم و زیللەت
یاسا و ڕێساکان دەبنە تۆڕ
دەبنە حوکمی قەرەقوش و
زیندان و گۆڕ
دەبنە گێژ و زۆنگاو و هۆڕ
دەبنە دارستان و جەنگەڵ
دەبنە بیشەو
پڕ دەبن لە گورگ و چەقەڵ
کاربەدەستان لە زەلکاوی هەناوی دا
دەبنە سن و زێڵوو و زەروو،
دەبنە دەغەڵ

وەکو گەرای کوللەزەردە
دەیان لەشکری راو و ڕووت، سەرهەڵدەدەن
لە خەڵکی کەودەن و گەندەڵ
......
لەژێر سایەی شومی پەتای گەندەڵی دا
دەمڕاست،
بابای ئەحمەق دەبێ
ژین سەراپا
بێ بەها و بێ رەونەق دەبێ
هەق، نێچیری ناهەق دەبێ
کارێز، دەروونی وشکارۆو
کانیی، چاوی ئەبڵەق دەبێ
چاکی و پاکی،
بەشیان تەنگ پێهەڵچنین و
ناوزڕاندن و تەخوین و
کەلەپچە و مست و شەق دەبێ
بەدەست خەڵکی ناکەس بەچە و بودەڵەوە
تەواو جێیان پێ لەق دەبێ
نیشتیمانیش لە حەسرەتان
جەرگی لەت لەت،
دەروونی شەقار شەقارو
دڵیشی پەست و شەق دەبێ

گەندەڵی خۆرکە و مۆرانە و گیاکەڵەیە
ئەلغامە،
تەپکە و تەڵەیە
خەجاڵەتی و خیانەت و خۆپەرستییە،
ڕەشترین خاڵ و پەڵەیە
سەرانگوێلکە،
لافاوی هەڵپە و هەڵەیە
ئاگرێکی بێ ئامانە
چاك و خراپ و تەڕوپووش
بەیەکەوە دەسوتێنێ
گەل قڕ دەکاو
متمانە خاشەبڕ دەکاو
پەیوەندییەکان دەشێوێنێ
ئینتیما بۆ گەل و وڵات دەسڕێتەوەو
داری هیوا دەبڕێتەوەو
سنوورەکان دەبەزێنێ
دواجار هەرەس بە بونیادی کەسایەتی و
قەڵای میللەت و کۆمەڵگە و یاسا و حوکمڕانی دێنێ
......
چارەسەریش بۆ ئەم دەردە کوشندەیە
یەك ڕێگەیە
هەبوونی نیازێکی پاك و ڕاستەقینەو
ئیرادەیەکی بەهێز و بەرنامەیەکی تۆکمەیە

بۆ چاکسازیی و

بۆ پاکسازیی

بێشك هەرکەس، خاوەن هەر پایە و پێگەیە

هەوڵی بەگژداچوونەوە و

نەخشەی ڕووبەڕووبوونەوەی،

لەگەڵ ئافاتی گەندەڵی و گەندەڵکاراندا، ئاوابێ

با دڵنیا بێ

مەشخەڵی هیوا پێ دەکاو

بەرەو سەرکەوتن ڕێ دەکاو

هەتا مابێ

گەل پشتیوانی لێ دەکاو

تەنیا نابێ

# دەستڕێژی بەڵێن

٢٠١٥

بۆنەیەك بوو
بەرپرسێکی باڵای وڵات
بە فیزەوە تەشریفی هات!
لە پشتی مایکرۆفۆنەوە
وەستاو وتی:
سڵاوی شۆڕش و خەبات!
ئەی جەماوەری خۆشەویست!!
بەم بۆنەوە
بەڵێن دەدەم بەزوترین کات
کارەبای نیشتیمانیی
بکەینە بیست و چوار سەعات
رێگەوبانیش تێکڕا بکەینە جووت ساید
قیرتاوێکیش، قات لەسەر قات!!
ئاوی ماڵان
دەکەین بەئاوی حەیات
بەردەوام بێ و بەبێ ماتۆڕ
بۆ نهۆمی سەرێی سەرخات

خەڵکێك کردیە چەپڵەڕێزان
بژی بژی، گیانمان فیدات!!
یەکێك لەناو خەڵکەکەوە، گوتی: قوربان!
کردار شەرتە
بەڵێن قسەیە و قسە (با) دەیبات!
ئەو بەڵێنانەی پارساڵ و ئەوانەی ئێستە فەرمووتن!
چاوەڕوانین،
هەتا بزانین !
سەرەنجامیان بەکوێ دەگات!!
من تا پێنج ساڵی دی رازیم
تەنها یەکیان جێ بەجێ بێ و،
بیکەیتە مەکرەمە و خەڵات!!
بەڵام ئەوساش چەپڵەیەکت بۆ لێنادەم!!
چونکە ئەمە واجبە لەسەر دەسەڵات

# قەرز

قەرز: تۆقی عەزازیلە

قەرز: سیلە !

قەرز: فیلە !

قەرز: نیلە !

قەرزدار: تا دەیداتەوەو

ئەو بەڵایە لەیەقەی خۆ، دەکاتەوە

بەند و دیلە

خاوەن قەرز:

دڵاوایە و هیممەت بەرز

کلیلە

هیوا و دەلیلە

داری بەر و سێبەر و گوڵ و قەندیلە

دەوڵەمەندیش:

کە دەست قوچاو و رەزیلە

زیزانەیە،

سەرکوێزر و خۆڵ و بنژیلە

قەرزکوێر:

هەمیشە هەر چاوبەرەژێر

هەنگوینی تاڵە و ئاوی سوێر

سپڵەیە و دڕکی چاکە و خێر!

# ئایلان [1]

٢٠١٥/٩/٤ رانیە

سڵاوێکی گەرم و بە کوڵ
بۆ تۆ... (ئایلان)ی خونچە گوڵ
(ئایلان)ی چاو
(ئایلان)ی گوێ
(ئایلان)ی دڵ
(ئایلان)ی نوقمی دەریای خەم
(ئایلان)ی مەملەکەتی شین و ماتەم
(ئایلان)ی نێو گڕ و کڵپە و دوکەڵ و کڵ!

---

[1] ئایلان عەبدوڵڵا کوردی خەڵکی کۆبانێ، کە لە ڕۆژی ٢٠١٥/٩/٣ لە دەریای ئیجەدا خۆیی و (غالب)ی برایی و دایکیان لە ڕێی کۆچ لە تورکیاوە بۆ ئەورووپا، خنکان و ڕۆژی دواتر لە کەناری دەریاکە لەلایەن پۆلیسی تورکیاوە تەرمی (ئایلان)ی سێ ساڵە بە خنکاوی و بێنازی و لەسەر ڕوو، دۆزرایەوە و وێنەکەی ئایلان زۆر بەخێرایی بە میدیاکانی هەموو دنیادا بڵاوبۆوە و دەنگدانەوەیەکی جیهانیی لێکەوتەوەو کاریگەری زۆری بەسەر جیهان و بەتایبەتی یەکێتی ئەورووپاوە دانا لەڕووی مەزڵومیەتی میللەتی کورد و ئاوڕدانەوەی خێرا لە ڕەوشی خراپ و قەیرانی پەنابەران و کۆچی بە لێشاوی خەڵك بەرەو وڵاتانی ئەورووپا.

شایانی باسە تەرمی هەرسێکیان لە ڕۆژی ٩/٤ هێنرانەوە کۆبانێ و لە مەراسیمێکی جەماوەریی دا بە خاك سپێردران، بەم شێوەیە وێنەکەی (ئایلان)یش وەکو وێنەکەی (عومەری خاوەر) بوو وێنەیەکی جیهانیی و سیمبولێکی تری ستەمدیدەیی گەلی کورد.

هەناسەکەم!

هەناسە بێ نازەکانت

بوونە شەپۆلی نەفرەت و

خەشمی خۆیان بەسەر زۆرداراندا باراند

خەون و خۆزگە و رازەکانت

بوونە دەنگی یەك میللەت و

هاواری مەزلۆمانەیان، بە گوێی هەموو دنیا گەیاند

وێنەی تۆ و (عومەری خاوەر)

بوونە شەهیدێکی زیندوو و

نهێنی غەدرێکی گەورەی مێژوویی و دێرینیان درکاند

بوونە ناڵە و نزوولە و رازی نزایەك

ویژدانی مردوو و بابردووی، سەراپای جیهانیان هەژاند

بوونە ئاوێنە و ناسنامەی

ستەمدیدەیی گەلی کورد

بوونە هەڵگورد

پەیامی ناخی دەروونی میللەتێکیان

بۆ سەر مێزی کۆبوونەوەی یەك بەیەکی وڵاتان برد

لەبەردەمیان ئاڵای کوردستانیان هەڵکرد

# سوریا

٢٠١٥/١٠/٣١

نیشتیمانێك
سەرلەبەری بەخوێن سوور بوو
شار و دێهاتی خاپوور بوو
تەنانەت بەرد لەوێ گریا
بەدۆزەخی دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر
بەبەرداشی بەرژەوەندی گەورەهێزانی جیهان خۆر
چی نەدەبوو بکرێ، کریا !!
دانیشتوانی،
وەك کوردستان بوونە پێنج جۆر
کوژراو و زامدار و گیراو،
بێ سەروشوێن و ئاوارەی بێ حاڵ و دڵ پڕ لەناسۆر
کەچی هێشتا هیچ کەسی نەگەییە فریا
لەویژدانی دنیام پرسی
دەزانی ئەو شوێنە کوێ یە!؟
وتی: ئەمشەو لەخەونمدا،
وتیان: سوریا!!!

# راستیی وێنەو وشە[1]

مانگی ٤ی٢٠١١

ئەی پەیامی خاوەن پەیام!

سەکۆی راستیی وێنە و وشە

مەکۆی مەعریفە و برایەتی

هەتوانی زام

دەنگی زولاڵ

رەنگی سامالٚ

سروەی شەمالٚ

رەزاسوك و خوێن شیرین و شیرن کەلام

مینبەری رەسەنایەتی

---

[1] لە گەرمەی خۆپیشاندانەکانی ١٧/ شوباتی ٢٠١١ و لە رۆژی سێ شەممە ٢٠١١/٤/١٩ هێزە ئەمنیەکانی دەسەڵات هەستان بە گەمارۆدانی (کەناڵی ئاسمانی پەیام) و هەڕەشە لێکردنی، بەو هۆیەشەوە لەلایەن خەڵك و جەماوەرەوە و لە پێنا و پاراستنیدا لە سوتاندن، پشتێنەی مرۆیی بەدەورەوە دروستکرا، دیارە پێشتریش لە سەعات ٢ی شەوی ٢٠ی شوباتی ٢٠١١ لەلایەن کۆمەڵە چەکدارێکەوە، کەناڵی (NRT) سوتێنرا. بۆیە بەو بۆنەوە پێشکەشە بە کەناڵی ئاسمانی پەیام و هەموو میدیا و میدیارێکی راستگۆ و پیشەیی و دلێر و بوێر.

شایانی باسە کەناڵی ئاسمانی پەیام، لە رۆژی ٢٠٠٨/١٢/١ وەك یەکەمین کەناڵی ئاسمانی ئیسلامیی کوردستانی، لە سلێمانی بەفەرمی دەستی بە پەخشی بەرنامە ئاساییەکانی خۆی کردووە.

تاڤگەی  میهرو بەخشندەیی و مەردایەتی
تۆ ئاوێنەی بەها جوان و باڵاکانی کوردەواری و
هەست و سۆزی خاوێنی نەتەوایەتی و
ماناکانی کوردایەتی
تۆ پڕشنگی نووری فەرموودە و ئایەتی
دەستەملانی لەگەڵ  پاکترین پەیام و خواست و مەرام
تۆ خزمەتکارێکی خاکیی و
دەستێکی کافوریی و پاکی و
بەبێ پسانەوە و بەردەوام
شیلەی راستیی و خۆشەویستیی
چاکەکاریی و خۆنەویستیی
خواویستیی و خەڵك دۆستیی
پێکەوەژیان و تەبایی و ئاشتەوایی و رێزو سەلام
دەبەشیەوە
.......
کەناڵی ئاسمانیی پەیام!
هێمای میدیای هەقگۆ و بوێر
دەنگی دلێر
رەنگی کوێستان و گەرمەسێر
بۆنی شەوبۆ و نێرگزو نەسرین و شلێر
خانەخوێی خانەدان و
خۆش خولق و رووخۆش و دڵ تێر
میوانی زێدەئازیزو موبارەك و پێ و قەدەم خێر

بەخێرهاتی

تۆ سومبولی ئازارەکانی ولاَتی

لەو رۆژەوە کەوتویە رێ

بۆ مالّ بەمالّ

بۆ شار بەشار و دێ بە دێ

خۆشەویستیی و

(سەفین) سەراپا بۆتە چاو

(قەندیل) سەراپا بۆتە گوێ

بۆ وەرزی رۆشنبیریی و ژیان و ژیریی و بۆ سفرە و خوان

بوویە جۆرەها میوەی جوان،

بۆن و بەرامە و تام و خوێ

لەو رۆژەوە

دلّت لەگەلّ رۆحی شەهیداندا دەدوێ

نیگات لەگەلّ نیگای نیشتیماندا هەلّدێ

سینەت لەگەلّ نمەی باراندا دەپشکوێ

لەو رۆژەوە

لەگەلّ ئەستێرە و پاساری و کانیی و قەرسیل

کەوتونە وتنەوەی کۆرسی سروودی نوێ

........

لەورۆژەدا کە تۆ هاتی

تێگەیشتین

تۆ خەرمانەی مانگی چواردەی

تۆ خەلاّتی

خەندەی نەسیمی بەیان و
خاکەلێوەی دنیایەك خەون و ئاواتی
بۆیە ئێمەش، درشت و ورد
لەگەڵ کوردستان
لەگەڵ کورد
سوجدەی شوکرمان بۆخوا برد
ئەمجار بەکوڵ دەستی نزامان لە خوا کرد
خوایە ! پەیام بۆ هەمیشە
لەژێر سایەی رەحمەتی زاتی تۆ دابێ
چۆنی پێی رازی ئاوا بێ
هەردەم سەرقافڵەی رێگا بێ
دوور لە ئافات و بەڵا بێ
خوایە ! ئەوەی زەردەخەنێك
سەرنجێکی دڵسۆزانەو
دوعای خێری بەدیاریی بۆ پێ بێ و لابێ
سەرفرازو رووسووری هەردوو دنیا بێ
هەرکەسێکیش نیازی خراپی لەهەگبەدا دەرهەق بە ئەو
خودایە ! بێدار بێتەوەو
رزگاری کەی لە دەست نەفس و شەیتان و شەو
لەو زەندۆڵە هەستێتەوەو
دژ بە خۆیی و خۆر و خەڵك و
ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە و کوردانە، نەوەستێتەوە ! !

# دادگا

٢٠١٥/١١/٦

گەندەڵی وڵاتی تەنی!
گەندەڵکاران،
بوون بەسەدان، بە هەزاران
بەماڵی میللەت بوون خەنی!!
یاسا بوو بەلاستیك، بە پیك
بەهێز، قاقا پێی پێ کەنی!
بێ هێز، داماو بەدەستیەوە،
لەنێو زیندانی دا، گەنی!!
کەچی بۆ تەنها جارێکیش،
نەماندی دادگا ڕاچەنی!!
پرسیان بۆچی وا بێ هەڵوێستە و کش و مات !؟
قەندیل وتی:
چونکە هەرکات
دادگا کەوتە ژێر هەیمەنەو
چاوسوورکردنەوەی دەسەڵات!
ئەوسا بە هەقیقەت وڵات!
دەبێتە مەڵبەندی پەتاو
بەڵا و ستەم و کارەسات!!!

# دێوجامە

ڕاپەڕینمان بۆ ئەوە کرد

تا ئیدی کوردستان و کورد

ئاسوودە بن،

سەریان بەرز بێ، وەك هەڵگورد

کەچی حەیف

ئەم هیوایە

ئەم خواست و داوا ڕەوایە

هێندەی نەبرد

لەبەر شەڕی کورسی و پارە و پۆست و پایە

لە دڵی نیشتیماندا مرد ! !

کوردایەتی،

شەهید و پێشمەرگە و گەل و مەردایەتی

لەبەر بەزمی پاوانخوازیی و کوێخایەتی

کرانە بەردەباز و پرد

تەنانەت شکۆ و سەروەریی حکومەت و

هەرچی دام و دەزگایەتی

بوونە کۆمپانیا و دێوجامەی،

ڕاوی بەرژەوەندی شەخسیی و حیزبایەتی ! ! !

# لوت بەرزی

هەرکەسێ هەیی و هـەرچی
فیز و کیبرت لـەبـــەرچی!
ئـــــەم خۆبـــەزل زانینە
پەستیی و دەروون بـەزینە
تەکـــەبوور و کەشخەیی و لوت بەرزی، لـە ژێرپێ نێ
خـــاکیبـــوون و بـێ فیـــزیی، رێـــز و شـــکۆ دەنوێنێ
***
بزانین لـەچـی خولقاوین! ؟
زادەی دلۆپـــەیـــەك ئاوین
بێ شك هـــــەرکەسێ ژیـره
ئـــەم ڕاستییەی لـــە بیرە
شەیتان بەهۆی تەکەببور، کەوتە بەرخەشم و غەزەب
پارێزراوبین لــە فیز و کیبر و لوت بـــەرزی، یاڕەب! !
***
بـــەندەی لاواز و بێ هێز! !
گەرەکتە حورمـــەت و ڕێز!
قـــــەت خۆ بـــەزل مەزانە
خـــۆبـــەزلـزان، نـــەزانە
فـــــەرموو لەنـــاو خەڵکدا، دەرکـــەوە بـــە ئاسایی
خـــوا، بـــۆ خۆبەکەمزانین، دەمـــانکـــا ڕێنـومـایی

***

هەرکەس خاکی و بیَ فیزە

لای خـوا بــــەرز و عەزیزە

کیبر و خـۆ لـــەخۆ گۆڕان

شـــەرمـــــەزارییە و دۆڕان

هــــەموو بەندەی لاواز و گوناهباری، یــــــەك خودایین

پێوەر لای خـــوا تەقوایـە، بـۆ لـە خەڵك جودایین! ؟

# ژینی کوردان

ژینی کوردان، پڕی هات و نەهاتە
بەرخودانە، ڕووداو و کارەساتە

لە هەر شوێنێ و لە هەر ڕۆژ و مانگ و ساڵ
دەیان داستانە، گلانە، داو و چاڵ

کەچی کورد بەم هەموو حاڵ و حیسابەش
نەکۆڵی دا، نەبێ هیوا، نەسەرکەش

گەلی کورد، گیانی دینداریی دەبەردا
گەلی کورد، بیری ئازادیی دەسەردا

تەماشای ڕیزی سەرکردە و زەعیمان
چلۆن بوو ون، لە ئیرادە و لە ئیمان!

دەبێ وابێ و لە ئاستی کێوی باوەڕ
پەتی ئیعدام و زیندان و سوپای شەڕ

بەچۆکدابێن و بۆ وان بێ، شکستیی
خەیاڵە بەوری باوەڕ، تێ بوەستی!

# ڕەشەبای قڕان

ڕەشـــەبـــایەك، بــــەنـــــاوی ئەنفال هەڵیكرد
بۆ سـەر خاكـــــی كوردستان و میللەتی كورد!

بــــە دڵڕەقی و شێتی و دەستڕەشی و كوێرانـە
نیشتیمانـــی كـــــردە سوتماك و وێرانـــــــــە

بــــــــە بــەرچاوی ویژدانی مردووی دنیاوە!
میللەتێكــــــی خستەنێو دەمــــــی حـــــەزیاوە

هـــــــەزارەهـــــا بزە و گڕوگـــاڵــــــی منداڵ
بوونــــــە زیرە و بـــــە زیندوویی نرانـــە چاڵ

بە هـــــەزاران دایك و باوك و پەككەوتـــە و پیر
بۆ شۆفلّ و شەو، مەرگ و بیابان، بوونە نێچیر

بە هەزاران لاوی جوامێر، خوشكـــــی ڕووسوور
كەوتنە داوی ڕژێمێكـــــی یــاخی و لە خوا دوور

ئاهـــو نزای ئــــــــەم گولآنـــــــە، ئـــەم دلآنە
پـــەیامـی ستـــەمدیدەیی و كۆڵنـــەدانــــــــە

ئـــەو گولآنـــەی لـە ژێر نــاوی (ئەنفال) وەرین
لـەگـەڵ (قورئان)، هەمـــوو لـــەو تاوانـــە بەرین

ئـــەوانیش و ئێمـەش هـــەتـا گیان دەسپێرین
ڕق و نـــــــەفـرەت، بۆ ستـــەمـکـاران دەنێرین

بۆ کوێ دەڕۆن ! ؟ بەرژێمەوە و تەخت و بەخت !
دەچێژن لـــە دنیاو دواڕۆژ ســــزای ســـەخت ! !

# ئاوارەیی

دەمێکـــــە ڕێی ئـــــاوارەیی دەگرمــە بەر
خوێن و زوخـــاو لە جەرگ و لاشەم دێتە دەر
لەبەر زوڵم و چـــەوسانـــەوە و هـــاوار و ڕۆم
بـەبێ نازی ســــەری خۆم هەڵدەگرم، دەڕۆم

لەسەر سنوور، دەریا و ڕووبار و دەشت و شاخ
هەڵدەکێشم خـــــەم و نـــاسۆر و ئۆف و ئاخ
ســــەدان کۆسپ و مـــەترسی دێنە ڕێمەوە
خوا دەزانێ، لە کوێ و کەی سەردەنێمەوە ! ؟

ئـــــــاوارەیـــی و جێهێشتنــــی زێد و وڵات
کوێرەوەریــــــی و ژان و مردنـــــە و کارەسات
ئاخۆ تاکـــــەی پەنابەرمە، بەر ئەم و ئەو! ؟
بەناچـــاری بگرمـــە پێش، ڕێی کۆچ و ڕەو!

زۆر لـەمێژە، کـۆڵـی کۆچم بـەکۆڵـەوە
تـەوقی جـەورم، بە ئەستۆ و قاچ و قۆڵەوە
لێقەومـاوی و غوربەت بوونـە ئاو و هـەوام
خاکم هەیـە و کەچی غـەوارە و بێ نـەوام!

منیش هیوا و ئـاواتی لـەمێژینەمـە
هەر دێ و دەچێ، لـەبیر و زەین و سینـەمـا
بـە ئـازادیی و ئـاسوودەیی لە خـاکی خۆم
بژیم، هـەردەم پرشنگ بدا خۆری ئـاسۆم

# تاجی رووسووریی

گەرەکتە تاجی ڕووسوورییت لەسەر بێ!؟
خەمی دنیا و دواڕۆژی خۆت لەبــــەر بێ!

بەدینی خواوە پەیوەست بە، هەموو دەم
شــەماڵێك بــــەو لــــەڕێ لادە مژوتــــەم

وڵات پـــــــــارێز و پەرژینی سنوور بـە
لــەتـــــاوان و گوناهو ستـــەم دوور بـــە

لـــە کۆڵ نێ، کۆڵی ئایین و گەل و خـاك
لەگەڵ پاکی قەراربگرە و دەروون پـــاك

مشوورخۆری جەماوەر بـــە، هــــەمیشە
کارابـــــە و دەستەوئـــەژنۆ، دامـــەنیشە

پشوو درێژبـــــــە، لـــە هەوراز و نشێوان
ورە و بڕوات بـــــەهێزبێ، چەشنی کێوان

پشت ئەستوور بـــە، بە تەوفیقی خودایی
بنەخشێنە ڕێی برایەتی و تـــەبــــــایی

لە ژین دا، هەڵوێست و جوامێریی شەرتە!
بەم شێوە، تاجی سەربەرزیی لەسەرتـە!

# راپەڕین

راپـــــــەڕینــی شـکۆدار
ڕوویدا لــە (پێنجی ئـــازار)
ڕانیـــــە، لـەگـەڵ بیتوێنا
شۆرشێـكیان داهێنـــــــا
کـە پێشمەرگـــە و جەماوەر
بوونـــە یـەك هێز و سەنگەر
لـە پێناو یـــەك مـەبـەستا
بورکانی تۆڵـــە هـــــەستا
داگیرکـــەری چــــەوسێنەر
لـــە نیشتیمان کرایـــە دەر
ئازادیی هاتـــە کایـــــــە
سوپـــاس بۆ تۆ خودایـــە
ئێستا (ڕانیـــــە)ی دەروازە
شێرە، هەڵۆیـــــــە، بازە
ئێستا کــوردستـان و کـورد
سەریان بەرزە وەك هەڵگورد
ئێستا هـــــەمـــوو رزگارین
سەرفـــراز و بــــەختیارین
هـــــەزاران جار ئافـــەرین!
بۆ (ڕانیە)و بۆ (ڕاپـــەڕین)

# دەروازەی ڕا پەڕین

ڕانیەی بە هەڵمەت و تین!
ئـــەی دەروازەی ڕاپەڕین!
مـــەشخەڵێکت داگیرســـاند
کوردستانت خرۆشـــــاند

بورکانی (پێنجی ئـــازار)
تێکی هـــــارِی ستەمکار
خودا هێنای بـــە خـــەڵات
ئـــــازادی گـــەل و وڵات

(کێوەڕەش) و (حاجیلە)[1]
کـــە بوونـــە دەستەچیلـــە
هـــــەستا لافـــاوی تۆڵە
تۆڵـــــەی هـــــەزاران ڕۆڵە!

---

١ دوو چیان، یەکەمیان لـە لـە بـاکوری ڕۆژهـەڵات و دووەمیـشیان لـە خۆرئـاواوە دەوری ڕانیەیان داوە.

بلّندگۆی (مزگەوتی گەورە)[1]
دەتگوت چەخماخەی هەورە
لــەڕووی دوژمنی بــەدفەڕ
دای لــە (ئەللاّهو ئەکبەڕ)

[1] مزگــەوتی گــەورەی ڕانیــە، لــە ســەر لەبــەیانی ڕۆژی ٣/٥ /١٩٩١ و ڕۆژانــی دواتــردا، مەڵبەندی سەرەکی ڕاگەیاندن و بانگەواز و بارەگای کۆبوونەوەی لیژنە (١١) کەسـیەکەی سەرپەرشتی ڕاپەڕین و ئاراستەکردنی جەماوەر و پێشوازی گەڕانەوەی هێزی پێـشمەرگە و ئەفسەر و سەربازە دیلەکان بووە.

# مەشخەڵی ڕاپەڕین

کوردم، خاوەنی ناسنامــە و مێژووم
هەرگیز دەستەمۆی دوژمنان نەبووم
بە وورەی بــەرز، بــە بیر و بــازووم
هەمیشە بــەرەو لوتکەی هیوا چووم

گرمـــــــەی شۆڕش و ڕاپــەڕینی من
بەکۆڵنەدان و هـــــەوڵ و نــەسرەوتن
بەویستی خودای بـــــەتوانا و مــەزن
لەرزاندی تەخت و تـــــاراجی دوژمن

وا بـــــەمەشخەڵی ڕاپـــــــەڕینــەوە
بــــە بڕوا و هیوا و هێز و تینـــەوە
بــــە گیانفیدایی و نـــــەبەزینەوە
ڕووبـــەڕووی کۆسپی ڕێ دەبینــەوە

مەشخەڵ، بەدەستی شەهیدانـــــەوە
مەشخەڵ، بەدەستی کوردستانــەوە
هەموو دەڵێین لە ناخمانـــــــــەوە
نا، بۆ بێدادیی و بۆ چەوسانـــەوە!

# هەلی راپەڕین

سـەردەمێکـی دوور و درێژ بوو
یـەکپارچـە خاکمان مینرێژ بوو

تـاڵیی دوای تـاڵیمان دەچێشت
ڕق، وڵاتمـانـی دادەبێشت

شـاڵاوی قڕانمان لـەسـەر بوو
ژینمان هـەر ژان و کەسەر بوو

بزە و شـادی لای کەس نەبوون
هەر دێ و شار بوون خاپوور دەبوون

ڕۆژ بـە ڕۆژ، بەڵکو سات بە سات
دەهـاتن کۆست و کارەسـات

بـارودۆخ زۆر خـراپ دەگـۆڕا
خوێن لـە دار و بـەرد دەچۆڕا

هــــــەموو بستەخـاكێك گــۆڕ بوو
هــــــەموو بستەخـاكێك تــۆڕ بوو

لــــە گشت دێ و شــــــار و بازێڕان
ناڵــــە و هــــــاوار بوو و شینگێڕان

ئەمن و ئەمان بــــــــاری كرد بوو
ڕۆژی ڕەشــــــی گــــەلـــی كورد بوو

تا لــــــەپڕ خوا ڕەخســــــاندی هــەل
یەكرێز ڕاســــان شۆڕش و گــــــــەل

ئــــــەو گەلــــــەی دەخرایە نێو كڵ
وره و هێزی كــــــەوتـــــــــە نێو دڵ

مــــەردانـــــــە و بێ باك لــــــە مردن
لــــــەنێو شــــــار و جەرگەی دوژمن

مــــــــــەیدانــــــی گــــرت و ڕاستبۆوە
بــــــــــــەگـــژ دیكتــاتــۆردا چۆوە

ڕاپــــــــــەڕینێكی بــــــەرپــــا كرد
ڕووی نــــــەدابوو لــــە مێژووی كورد

ئـــــافرەت و پیاو، گچکـــە و گەورە
هـــــــەرکامێکیان دەتگوت بـــەورە

هـــــەڵمەتیان بەرەو هـــــــەر لا بوو
دوژمن وەك پوشكەی بـــەر (با) بوو

كام مۆڵگـــــــەی سەختی دوژمن بوو
غـــــەنیمـــی میللـــــــەتـــی من بوو!

خــــــەشمی خودا و ڕقی میللـــــەت
ڕایانماڵـــی پــــــــــەستی و زیللەت

داگیرکـــــــەری هـــــــــار و ملهوڕ
بوو بـــــــە پـــــــەند و دەواری شڕ

نــــــەما هــــــــــــاوار و قوڕ پێوان
خــــەندە هـــــاتــــــەوە سەرلێوان

نـــــەما سەختی و شەختـــە و کرێوە
خـــــــاك کەوتـــــەوە خاکـــــەلێوە

خـــــاکی وڵاتمان ئـــــازاد بوو
گیانی شـــــەهیدانمان شـــاد بوو

ڕۆژی نویٚ لـــــە ئـــاسۆ هــەڵات
شـــــەکایەوە ئـــــاڵای وڵات

گوڵ، کەوتــەوە ناسکی و نـــازان
بولبول، کەوتــەوە ئـــــاوازان

کارێز، کـەوتـــــەوە خوڕە خوڕ
گیا، ســـــەری دەرێنا بـــە گوڕ

چیا، تـــاجی شکۆی نایــە ســەر
تاڤگـــە، ڕەنگی هـــاتـــەوەبـەر

منداڵ، شـــــاد بۆوە بــە بێشکە
قـــەرسیل، کەوتـــەوە کەروێشکە

مـــەل، بــــە ئاسماندا فڕیــەوە
چـــاو، ئـــەشکی خوێنی سڕیەوە

درەخت، کـــەوتـــەوە خـــــەڵفاژۆ
نـــەمــا حــــەبی سەوز و واژۆ[1] ! !

ئیختیار، ئیرادە و ویســت و بـــوون
هاتنــــەوە نێو جەستــە و دەروون

ئــــەنفال، کیمیایـــی و ڕاگواستن
ڕاونـــــان و ڕفـــاندن و گـــرتن

کوشت و بڕ، ڕاو و ڕووت و شــــەڕ
سزا و لێدان، گێچەڵ و گــــــەڕ

سێدارە، ڕەمـــی و کۆت و بــــەند
فڕێدانــــە شیو و دۆڵ و کــــــەند

دەورەدان و بـــــەســـــــەردادان
شـــــەق و کەلەپچـــە و قۆڵ بادان

---

[1] سەردەمی ڕژێمی ڕوخاوی بەعسی دیکتاتۆر، بەتۆبزی خەڵکیان دەکردە بەعسی و ئەوەی بەهەر جۆرێکیش بووبایە بە بەعسی، پێیان دەگوت: حەبە سەوزەکەی خواردووە، یان حەبەکەی قوت داوە ! !
لەلایەکی ترەوە بەعسیەکان بەزۆر و زەخت بەخەڵکیان ئیمزا دەکرد کە ببنە بەعسی، واتە: بە (بەعسیکردن – تەبعیس) یەکێك بوو لە سیاسەتە شوومەکانی ئەو ڕژێمە نەگریسە.

ڕەشبگیریـــی و زیندەبـــەچـــاڵ
دەنگی (قیف) ، چەخماخ و پۆستاڵ

ئیختیفـــــا و شـــــەوڕۆ و فیراریی
تۆمـــەت، جـــاسوسی و ئیخباریی

سوکایـــــەتی، دەستدرێژی و جنێو
بڕینـــی گـــوێ، زمـــان و دەم و لێو

نینۆك كێشـــــــــــان و داخكردن
ترســـــــــــاندن و زەندەق بردن

بۆردومـــــان، ناڵـــــە و ڕمب و هوڕ
گڕ و بڵێســـــە و دوكـــــــەڵی چڕ

سوتـــــانی مـــاڵ و ڕەز و بـــاخ
هـــــەنیسك و زیڕە و ئۆف و ئـــاخ

ئەمانـــــە و زۆری دی، كـــە بوون
نەمـــان، تێپەڕین، بەســـــەرچوون

هـــاتـــەگۆڕ ســـــەردەمێکی نوێ
لە ســـــەدا سەد، لــە پێشان جوێ

ژین، ســــــەرلەبــەری ژیایـــــەوە
ژان، بـــــارگەی خۆی پێچایـــــەوە

لــــــەوێوە وەك نەتـــــــەوەی کورد
دوا قسەی خۆمـــــان بۆ جیهان کرد

قـــــــەت تەسلیمی ستــــەم نابین
ئـــــــازادیخوازیین تـــا مـــــابین

هەمیشـــــە گیان لەســــەر دەستین
تــــا ســــەربــەخۆیی نـــاوەستین

# پەنام هێناوە بۆ قاپیت خودایە!

پەنام هێناوە بۆ قـــاپیت، خودایـــە!
ئەمن داوام لـــەتۆ ڕەحم و هودایـــە

تۆ خـــاوەن هێز و توانای بێ سنووری
بە میهری خۆت، لە تـــاوانان دەبووری

خودایـــە! چەندە بەخشندە و بەسۆزی
لـــە تۆوەن، بوون و ژین و ڕزق و ڕۆزی

لەخۆم ڕا، تـــا دەگاتە ئەوپەڕی بوون
هـــەموو پڕپڕ لە ســـەرسوڕمانە گەردوون

سەرنجی هـــەرچی دا، هۆشمەند و زانـــا
گەورەیی تۆ دەبینێ جوان و ســـانـــا

پەپوولـــە، بەو هەموو نەخش و نیگارە
نیشانـــــــەی گەورەیی پەروەردگارە

ئەم سروشتە، کە بـەرگی خۆی دەگۆڕێ
شیلـــەی بڕوا و زانستـی لێ دەچۆڕێ

کەسێ ژیر بێ و دەخەم دواڕۆژی خۆ بێ!
خودایە! هـــەر دەبێ تەسلیمی تۆ بێ!!

# قندۆڵ[١٧]

قندۆڵ، زێدی ئازیزی من!
خاکەلێوەی پایزی من

تێکەڵی گیان و جەستەمی
ئاوازی شیعر و بەستەمی

لە خاك و خۆڵی تۆ بوومێ
هەر لە تۆچووم هەرجێی چوومێ

---

[١] گوندەکەی خۆمە و دەکەوێتە رۆژهەڵاتی قەڵادزێ و سەر بەناحیەی (ئیسێوە)یە و هاوسنوورە لەگەڵ ناوچەی (ئالان)ی (سەردەشت)ی رۆژهەڵاتی کوردستان.

گوندی قندۆڵ رۆژی ١٩٧٨/٧/١٧ لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەری وەکو (گەناو، دەوژان، رازان، سەرشیو، بەردکێشان...) لەلایەن رژێمی بەعسەوە راگوێزراوە بۆ ئۆردوگای زۆرەملێی (تووەسووران)ی سەر بە ناحیەی سەنگەسەر.

شایانی باسە جگە لەمە، ئەم گوندە لە ١٩٩٣/٧/٣ش، بە بەهانەی جموجۆڵی حیزبی دیموکرات لەو سنوورە، لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە تۆپباران کراو لە ئەنجامدا (٥) هاوڵاتی گوندەکە (بەناوەکانی: عبداللە خدر و صالح عبداللە خدر– باوك و کوڕ– ، محمود حمە خدر و علی خدر بابکراغا و جلال خدر بابکراغا) شەهید بوون.

هەروەها ١٦و٢٠٠٧/٨/١٧یش هەر لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە بە بەهانەی جموجۆڵی پەکەکە لەو سنوورە، تۆپباران کرایەوەو ٢ هاوڵاتی بریندا بوون و چەند خانوویەکیش روخان، ئەمە جگە لە سوتانی پوش و پاوان و رەز و باخ و چۆڵکرانی تەواوەتی قندۆڵ و گوندەکانی دەوروبەری بۆ ماوەیەك بەوهۆیەوە.

یەکەم هەناسەی تۆم هــەڵمشت
نیگام بـــــە پڕشنگی تۆ ڕشت

لێوم نــــا، بــە ئـاوی تۆوە
لــە باوەشتـا زمــــانم بۆوە

دڵم بــــــە تۆ گەشـایــــەوە
گوێم بـــە دەنگت زرینگایـەوە

خۆشم دەوێی، خۆش، بێگومان!
هـەر ئـــاواش دایکی نیشتیمان!

چــــاو و دڵ و گیــــان و گوێمە
لـــــە ڕێیدا ڕێی خەبـات ڕێمـــە

پشت بەخوای بەخشندەو گەورە
دنیا هـــــــەر ڕۆژگـار و دەورە

بـــە تـــــەواوی توانـــا و هێزم
وەك چـــــــاوی خۆم دەیپارێزم

# سروودی کاروانێکی نەپساوە

شــۆڕشــی شکــۆداری ئیســلامییمــان
خـــاوەن مێژوو، هێمای بـــەردەوامیمان
ناسنامـــەی ڕەسەنایـــەتی کوردستان
کاروانێکـــە، بـــەڕێوەیە بێ وەستان

بۆ برایەتی و داد و ئــاشتیی و تەبایــی
بۆ سەروەریی و بەختیاریی تا هــەتایــی
تــا گــەل بگا بـــەخۆر و ڕووناکایـــی
دینی خوامـــان ڕێبازە و ڕێنومـــایـــی

ئـــــالا هـــەڵگری شۆڕش و جیهادین
دەنگی ئاشتیی و ئــاوەدانیی و ئازادیین
هێز و تینی بـــازووی چەسپینی دادین
مژدەی خۆشیی دنیا و دواڕۆژ و شـادیین

بیری ئێمـــــە، پەیـــــامی ڕۆژی نوێ یە
پەیامی نوور، بۆ هـــەموو کـات و جێ یە
چەك و خامەو گوڵ و سۆزمان هـــاوڕێ یە
لــە ڕووی ستەم، ڕقی پیرۆزمـــــان پێ یە

لە ئاست کۆسپ و لـەمپەر و پیلان و داو
بڕوا قایم، بـــازوو بەهێز، تیژە چــــــاو
یەك سەنگەرن، ئافرەت و پیاو، پیر و لاو
خوێنی شەهید، مەشخەڵەو تیشکی هەتاو

# ئیسلام و کورد

ســـــەردەمێکی زێڕینـــــە، کاتێ کـــە میللەتـی کورد
ئـازایـانــە ئـــــامێزی بـــەدینی ئیســلامـدا کـرد

جێی سەرنجــــــە و تەماشا، ئاکام و ســـەرەنجامیی!
بوو بــە ســـــەرکردە و ڕێبـــەر بۆ گـــەلانی ئیسلامیی

کــە سوڵتان سەلاحەددین، لــە فــەتحی قودسی پیرۆز
خــــەونی خاچپەرستانی، کردە خۆڵــــەمێش و تــۆز

لەوساوە کورد بە ئیسلام، ئیسلام بــە کورد سەربەرزە
ئەمــەش جێی شانازییــە، تاماوین لەم ســــەر ئەرزە

ئـــــەی کوردینە! ئاوایــــــــە مێژووی زێڕینی ئێوە
بەرۆکتان هـــــــــەزارەهـــا مـــــەدالیای مەردیی پێوە

مێژووتــــــان نــەشێوێنن، گومڕا و ســــــەرلێشێواوان
کورد لە سایەی ئیسلام دا، نـــاوی کەوتە نێو ناوان!

ڕاستییە بۆ هـــەمیشە، دیــــــــار و زەق و زیندووە
ئیسلام ڕەگـی بـــەنـــاخی کوردستان دا، ڕۆچووە

ئەمــە پەیامی مێژوو و نەوەی نوێ و چیای هەڵگوردە
هەر کەس دژی ئیسلام بێ، بێ شك دوژمن بە کوردە!

# هەبوون و نەداری

١٩/١١/١٩٩٨ هەولێر

بوون و نەبوون، هەردوولایان لــە خواوەیە
هەرکامێکیان، خێر و شــــەڕی بەدواوەیە

بـە مـەبـەستی ئەزموون و تــاقیکردنەوە
خولقێنراون، ژینیش بــە مەرگ و مردنەوە

دەوڵــەمەندی، بــەڵایە، بێ خێر و زەکات
خوا بوونی وا، قەت بـە نسیبی من نەکات!

دەبێ هــەبێ، بۆ هــەبوونێ، شوکر و سەنا
مایـەی سزا و جەزرەبەی زۆر توندە، دەنا

دەوڵەمەندی، حەزیای ڕژدی هەڵی لووشێ!
خاوەنەکــەی دەکاتـــە سەپانی پووشێ!

ئادەمیزاد! سەخی بەو بەخشندە و بــەدڵ
چــاو پڕ نابێ، هــەتــاکو پڕنەبێ بەگڵ!

بۆ نــەبوونێ، پێویستــە قەناعـەت هەبێ
هەرکەسی بێ، ژین تاڵــە و پەستە وانەبێ

قەناعەت بــەو مانایە نــا، بێ ئیش و کار
بەڵکو تێکەڵ بە هــەوڵ و ڕێی ڕەوا و لەبار

بـەڵام نابێ لەم ڕاستییەش بێ خەبـەریی!
نەبوونی، پڕ لـــە ئــــازارە و کوێرەوەریی

ئەگەر خوا ڕەحمت پێ نــەکا و وریا نەبی!
بە دەستییەوە تووشی هەزار بــەزم دەبی!

لەگەڵ کوفرا، نـاوی هێناوە (خۆشەویست)!
لەوان بە(خوا) خۆی پەناداوە(خۆشەویست)!

بوون و نـــەبوون، هـەردوولایان لە خواوەیە
هــــەرکامێکیان، خێر و شەڕی بــە دواوەیە

بــە مــەبـــەستی ئەزموون و تاقیکردنەوە
خوڵقێنراون، ژینیش بـــە مەرگ و مردنەوە

دەسا خوایە! هـــەرکامیانم دێنیتـــە پێش
سەربەخێربێ، ئیتر چش لەخۆشی و لەئێش!

# دەوری ئیسلام

١٩٩٩ - هەولێر

بـە پشتیوانی خوای گـــــەورە
دەوری ئیسلامـــــە ئەم دەورە
ئیسلام پەیـــــامی ڕزگاریی و
دژی زوڵم و زۆر و جـــــــەورە
گوڵی یەخـــــەی چەوساوەیـــە
لە ڕاست زاڵمیش تیر و تـــەورە
ئـــــاوی کانیاو و سەرچـــاوەی
پاك و سازگار و بێ غـــــــەورە
ئـــــالآهەڵگری ئـــەم دینـــــــە
شێر و پڵنگ و بـــاز و بـــــەورە
نرکـــەی تەکبیرە و هـــەڵمەتی
بروسکەیە، چەخماخەی هەورە

# نەوەی نوێ

۱۹۹۹ـ هەولێر

ئــــەی نەوەی نوێی ئــەم پەیــام و پەیڕەوە!
ڕەوڕەوەی ڕابوونی تۆیـــــــە، پڕتـــــــــەوە

لـــە هــــەرجێ، نرکـــەی تەکبیرەت دەبیستم
لــــەخۆشیان گەشکــە دەگرم، خۆشەویستم!

بێ شك، تــۆ و ڕابــوون و دواڕۆژی ڕۆشـــــــن
دەرەنجامــی پــابـــەندیی و کــرد و کــۆشن

نەکــــــەی داوەڵێ، لە لۆمـــــە و تانــە هەرگیز
ئەگـــــــــــەر خوا ڕازیی، با عالەم هـەموو زیز!

ناحــــــــەزان و بێ دینانی بــەد مـــەبەست
سەد بوختانیان بۆ (خۆشەویست) هەڵدەبەست!

مادام ئـــــــاڵای نوور و هــەقت لــــە دەستا
سۆز و پـــەرۆش، شـــەپۆل دەدەن لە هەستا!

فــــەرموو ئــــەرکی سەرشــانت ڕاپەڕێنــە!
ئــــەرکت ئــــەدای بــــــانگەواز و بـەڵێنـە

# زانست و کردەوە

١٩٩٩ـ هەولێر

زانست، دەگـەڵ کردەوە
شۆڕشێکـی پڕتــــــەوە
دەخاتــە گـەڕ، ڕەوڕەوە
لەنێو گـــەل و نەتـــەوە

زانست دەگـــــەڵ کردارا
دەبێتــــە هێزی کـــارا
شۆڕش دێنێتـــە ئـــارا
تریفــــەی مانگەشـــەوە

کـــەسێکی وانـــەزانێ!
ئەگەر ڕووش لە (فەزا)نێ
کەوتۆتــە بـــەر خەزانێ
نێچیری حـــەزیای خـــەوە

زانینــی بــــەبــێ کـردار
ماڵی قەڵبــە و باری خوار
مرۆڤ دەکا شــــەرمــەزار
خـراپترین شــت، ئــــەوە

کــــەسێکی هەیبێ زانست
بۆچاکەش ناوێ یەك بست
بە تەونی ئیبلیسی ڕست!
خودایــە! مەفعی کــەوە

# دەبێ یەکبین و یەکبگرین

١٩٩٩ ـ هەولێر

دەبێ یـەکبین و یـەکبگرین، ئەگـەر نا !
هـــەموو هـــەولێك، دەشكێتەوە بـەسەرنا

فەشەل، زادەی نیزاعـــە، جا کـــەوابێ!
شنـــەی شـــەماڵی یـــەکگرتن دەبـا بێ!

ئایـــــەتی (وَاعْتَصِمُوا)[1]تان لـــە پێشە
هـــەمووش زانا، ئیتر بۆ کۆسپ و کێشـە !

ئەمـــە قورئان، لە ئێمەش ســـەمع و طاعە
دەستی خوداش دەگەڵ کێ یە؟ جەماعە[2]!

ئەمما یـەکبوون، تا قایم و شەوڕەوێن بێ!
دەبێ (حەق و عـەدل و پاکیی) هەوێن بێ

[1] (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) ال عمران – ١٠٣.
[2] (يد الله مع الجماعة) حسن، ترمزی گێڕاویەتەوە.

# كورد و زانا

١٩٩٩ ـ هەولێر

خاوەنی زۆر زانـــای بەرزە گـــەلی كورد
هەریەك بوونە خۆری ئاسۆ و كەلی كورد

زانستـــی وان، میوە دەدا چـوار وەرزە
كورد بەو زانا بەرزانەوە، سەربــەرزە !

ئاخر پـــایـــەی بڵندە مـرۆڤی زانـــــا
(هَلْ يَسْتَوِي)[١] فـــەرمووە، زانی دانا !

بەڵێ، دیـــارە بەوێنـــەی ڕۆژی ڕووناك
مەدالیای فەخرە زانا، بۆ گـــەل و خاك

ئێستا شۆقی عیلمی پـــاكی ئەوانــــە
ڕۆژە و مانگ و گەلاوێژیش، شەوانــــە

ئەمما زانـــا كـاتێ گـرەوی بـردەوە !
بیسەلمێنێ زانــــایـە، بـەكردەوە ! !

---

[١] (...قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ) الزمر – ٩

# مەرگی زانا

بـــــەڕاستیی، مەرگی زانـــــا کارەساتــــــە !
ئـــــاوابوونیی خۆری گـــــــەل و وڵاتــــــە

بـــــەڕاستیی، مـــەرگی زانـــــا کۆست و داخە !
خــــــەمی گـــەورە لـــەکۆچی دا، وەجاخـــــە !

کـــــە خۆرێك ڕادەبووریّ لــــــەم فـــــەزایـــــە !
چەند ئەستێرە دەگەن بــــــەو پۆست و پایە ؟!

کە خۆرێك ڕێی سەفـــەر دەگریّ، لە جیّ و ڕێی !
چەند ئەستێرە هەڵدەگرن ئەرك و شوێن پێی ؟!

هـــەقیقـــەت کۆچی زانـــــــــا، کۆچی نـــووره
بەخــــــەم ســــــاردی، بەلایدا ڕامـــــەبووره !

بە هـــــەق جوانە و پڕ لە ڕاستیی و لە مانـــــا !
وەکو مـــــــەرگی جیهانــــــە، مـــەرگی زانـــا !

هـــــــــەواڵی مـــەرگی زانــــــــــا دڵ تەزێنـــە
خودایـــــــــــــە ! ســـــەبر و سێبووری بهێنـــە

# بۆ زانای شەهید (ماموستا مەلا عومەری تیمار) [1]

سڵاوی خوات لەســـەربێ، مامۆستای بەڕێز
تێکۆشەر و خاوەن هەڵوێست، خاوێن پەرێز

هـــەر لەوکاتـــەی وەکو زانایەك دەرکەوتی
ڕانـــەوەستای، هەتـــا بۆ لوتکە سەرکەوتی

---

[1] ناوی تەواوی (عومـەر مستەفا قـادر)ەو بـە(مامۆسـتا مـەلا عومـەری تیمـار) ناسـراوە، ساڵی ١٩٥٢ لە گونـدی (مـەلا ئۆمـەر) لـە دایکبـووە، لای مامۆسـتا مـەلا مستەفا پـەڵکۆیی باوکی، دەستی بـە خوێنـدنی ئیسلامیی کـردووە، بـۆ خوێنـدن گـەلێك ناوچـەی کوردسـتان گەڕاوە، لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە.

سـاڵی (١٩٦٦) بـاوکی لەکاتێکـدا لـەپێش کۆمـەڵێك لـە خـەڵکی هـەژاری سەروچـاوە ڕۆیشتووە بۆ بەرگری لێکردنیان، لەلایـەن ڕژێمـی داگیرکـەرەوە گوللـەباران کـراوەو شـەهید بووە.

ساڵی (١٩٧٤) لە کۆیە، لەلایەن مامۆستا (مـەلا محمد ئـەمین)ەوە ئیجـازەی زانسـتی وەرگرتووە، لە گوندی (خەرابە)ی (تەقتەق) بووە بـە مـەلا، دوای پێـنج سـاڵ چـووە بـۆ گونـدی (تیمـار)ی سـەربە (سـورداش)، ١٩٨٠ چـووە بۆحـەج، ١٩٨٢ بـۆ سـەربازیی داواکراوە، بەڵام مامۆستا نەچووەو بە نهێنی لە تیمار ماوەتـەوە، تـا لـە شـەوی (٢٠-٢١ ڕەمـەزانی سـاڵی ١٩٨٤)، سـەعات یـەکی نیـوە شـەو، دوژمنـانی ئیـسلام و کـوردو کوردستان، لەماڵی خۆی لە نێو منداڵەکانیدا، دەستڕێژیان لێکردو تیرۆریـانکرد، پاشـان لە گۆڕستانی گەورەی چوارقوڕنە بەخاك سپێردرا.

مانگێـك دوای شـەهیدبوونی مامۆسـتا، لەسەرانسـەری کوردسـتانەوە، سـەدان کـەس لـە زانایـان و لاوانـی مـسوڵمان، لـە (چـوارقوڕنە) کـۆڕێکی شـکۆداریان بەسـت بـۆ نـاڕەزایی دەربڕین لە دژی تیرۆرو تیرۆریستان و ئەم کۆبوونەوەیەش بوو بـە مایـەی گەشەسـەندنی بزافی ئیسلامیی کوردستان.

هەقگۆ بوویت و لەگەڵ نووردا بەڕێوە بووی
لە ڕووی باتڵ، وەکو کێوێك بـــەپێوە بووی

چەواشەییت دەخستە بەر دەستڕێژی هــەق
ڕوسیات دەکرد، بەبەڵگەی عەقڵی و نەقڵ ودەق

حەکیمانـــــە لـــە (تیمار)[1] بۆ تیماری کورد
پەیــامــەکـــــەت بـــە نێو وڵاتدا ڕادەبرد

بە دڵسۆزی و چاکی و پاکی و بێ غەشیەوە
میهرەبانییت بە نێو گەلدا، دەبـــەشییەوە

تا بایەقووش کەوتـــــە دابــــارینی غەرەز
ناشێ بەراز، تێك هـەڵنەشێلێ دەغڵ و ڕەز! !

بـــەو هیممـــەت و هیوا و باوەڕ و نوورەوە
شەهیدکرایت و فڕی بە بــــەرگی سوورەوە

پیرۆزت بێ، ئـەم گەشتــە بــەم خـەڵاتەوە
پەیامـــەکـەت هەروا دێ و دەنگ دەداتەوە

ڕێشت پڕە لـە ئــاپۆڕای ڕێبواری مــــەرد
ئیتر ناحەز، بــا هــــەر سەری بدا لە بەرد!

---

[1] گوندێکە سەر بە ناحیەی (سورداش) و مامۆستا لەوێ تیرۆر کراوە.

# بۆ (ماموستا شەریف)[1]

(بێ دەنگ)[2] بەدەنگ ورەنگ و سەنگ، بەزمانی حاڵ
بانگـــــەوازی بۆ هەق دەکرد، بــە گیان و ماڵ

ئـــارامیی و سۆز، شـــەرم و حـەیا، ڕێز و ویقار
کـردبوونیە، ئـــــاوێنـــەی کــردار و گـوفتار

[1] (شەریف حوسێن مستەفا) ناسراو بە (مامۆستا شەریف) ١٩٦٩ لە (خدران)ی بناری کۆسرەت لە دایکبووەو تەنها تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندوویەتی و لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی شارەزابوو لە ئیسلام و واقیعی ڕۆژ، لە سەرەتای هەشتاکانەوە هۆگری کاری ئیسلامیی بووە و ١٩٨٦ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامییەوە کردووە، ١٩٨٧ لە هێزی (شافیعی) بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەوکاتە بووە بەپێشمەرگە، دوای کردنەوەی بارەگاکانی هێزی (حەمزە) لە (قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل، وەك پێشمەرگە و فەرماندەیەك لەوێ درێژە بە خەبات دەدات، ١٩٨٨ لەکۆنگرەی چوارەم کە لەبارەگای هێزی (خالید) لە گوندی (براڵە)ی ناوچەی (شلێر)ی سەربە پێنجوێن بەستراوە، دەبێتە ئەندامی سەرکردایەتی، لە کۆنگرەکانی پێنجەم لە ١٩٩٠ لە (دزڵی) و شەشەم لە ١٩٩٢ لە سەرئەشکەتان ، دوبارە بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵدەبژێردرێتەوە و دوای تەشکیلەی کۆنگرەی شەشەم تا ١٩٩٣/١٠/١٢ بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری بووەو لەوێشەوە تا ڕۆژی شەهیدبوونی، بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی بووە، کەسێکی تا بڵێی ڕوح سوك و بێ فیز و هەژاردۆست بوو، بەردەوام خەریکی ئاشتەوایی و برایەتی و لێبووردەیی بوو و ماندووبوونی نەدەزانی، سەرەنجام لە ١٩٩٣/١٢/٢٧ لە سەرچیای ماکۆك لەگەڵ پۆلێك هاوڕێی دا بە دیلی ڕەمی کراو لە چوارقوڕنەش بەخاك سپێردراوە.

[2] لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٧و دەستپێکردنی ژیانی پێشمەرگایەتییەوە، نازناوی (بێ دەنگ)ی بۆ خۆی دانابوو.

خـاکیبوون و خـــەڵك دۆستیی و مشوورخـۆریـــی
پێناسی بوون، بۆ گشت بوون، خـــەم و ناسۆریـــی

خۆشەویست و خۆش خوڵق و خوو، شیرن کـــەلام
بۆ برایـــەتیی و ئاشتەوایی، ژیـــا بــــەردەوام

(شەریف)ێکی شەریف بوو، جوامێر، سینە ســـاف
دوور بوو لە ڕق، لە فرت و فێڵ، لاف و گــــەزاف

پێشمەرگـــە بوو، ســـەرکردە و دێرین و دلێر
نــــەرم و نیان و دڵ ئاوەدان، پــــەیـــامی خێر

دەسا خوایـــــە! تاڤگـــەی سۆز و میهرەبانیی
بـڕژێنـــە ســـەر، گیانــی خۆیـی و هـــاوڕێکانی[1]

شـــــەهـادەتـی مــەزڵوومانـــەیـــان پیرۆز بێ
هــــەردەم ڕێیان، پڕ لـــە ڕێبواری دڵسۆز بێ!

---

[1] ئەوانەی بە دیل و مەزڵومانە لە گەڵیدا رەمیکران لـە رۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٧ لەسـەر چیای ماکۆك، بریتی بوون لە: (وریا مەحەممەد سەعید- مامۆستا وریا کـەرکووکی، نـەبی مینـە حەسەن- حاجی نەبی، مامۆستا حەسەن بابەکر، ئەحمەد بابـەکر ئەحمـەد، مەحەممـەد یونس قادر) بەڵام بەویستی خـوا (مامۆسـتا حەسـەن بابـەکر) دوای رەمیکرانیـشی، وەك شەهیدی زیندوو مایەوە.

# زانای ڕەسەن

١٩٩٩ - هەولێر

ئەی مامۆستا، ئـــەی زانای ئایینی بەڕێز!
بـــەکردار و ئـــــــامۆژگاریی بـەهێز و پێز
ڕۆشن کــەوە، ڕێبازی دین و ژینی گــــەل
پەیامــەکـــەت بارانەیــە و خۆری ئەمــەل

زانــــــا، بـــەیداخی ژیانەوەی هـەڵکردووە
گەل، بێ زاناو پەیامیی، جەستەی مردووە
زانــــــا، بەم هێما و نوورەوە بەڕێوەیـــە
پەیامــەکـەی مایـــەی بەختیاری ئێوەیە

مامـۆستایان! زانـایـانی ڕاست و ڕەسەن!
تەماشاکەن واریسی کام زات و کـەسەن!؟
کوانێ ئـــەرکی لـــەوە گەورەتر کامەیە؟!
(بـــارەکـەڵڵا) لـــەو پایــە و بڕوانامەیە!!

ئەرك و پایــە و مەقـــامی زانـای ئایینی
پێویست دەکا هەربۆ خوابێ، ڕەنج و تینی
زانـا دەبێ پێشڕەو بێ و ئازاو گیان فیدا
وەك قەندیل بێ، لە ڕۆچوویی و لە بەرزیدا

زانــــا، نـەکەی دین بە دنیا نـەگۆڕیـەوە!
خۆت نەخەیـە ناو زەلکاوی سەرشۆڕیەوە
بـا کردەوەت ئـاوێنەیـــەکی ڕۆشن بێ
عـەللامــە بی، دۆڕاوی ڕێگەت لێ ون بێ!!

پەنـــا بەخوا زانـا هەتڵەبێ لـەو ڕێ یە
ئاشکرایـــە سەرەنجامی بەرەو کوێ یە!
(وَعالِمٌ بِعِلْمِـــــــــــــــهِ لَمْ يَعْمَلَنْ
مُعَذَّبُ مِـــنْ قَبْلِ عُبَّـــــــــادِ الْوَثَنْ)[1]

زانــــا، بەپایـــەی زانست و کارو کردار
دەبێتــە دوند، دەبێتە هێما و شۆڕەسوار
بڕوا و زانست، بــە کردەوە گزنگ دەدەن
دوانەیـەکن، بێ یەك نابن گیان و بەدەن!

---

[1] ئەم دێڕە شیعرە هی (ابن رسلان الشافعي)یە، واتـە: زانایـەك کـە ئـیش بـە زانـستەکەی ناکات، لە ڕۆژی دواییدا لە پـێش بـت پـەرسـتانەوە سـزاوجەزرەبە دەدرێـت. دیـارە ئـەم دێڕەشی بەدوادایە (وَكُلُ مَنْ بِغَيرِ عِلْمٍ يَعْمَلُ – اعْمالُهُ مَرْدُودَةٌ لا تُقْبَلُ)

# کاکی مەسئول

تەمووزی ١٩٩٩ ـ هەولێر

کاکی مەسئول! هـــەر پایـــــە و ناوی لێتە
لێم قبولّ کـــە، ئەرکـــە و مەفەرموو شێتە!

وەڵڵاهـــی گـــەر تورە و (غَلِيظَ الْقَلْبِ)[1]ی
هـــەر لە حزەیەك داینێ تووشی فەشـــەل بی

گەورەم، گەر هیوات پێشرەوی و صەلاحـــە
ئەمـــەی دەیڵێم، رێی تـــەوفیق و نەجاحـــە

دەگەڵ رەعیەت، بە عەدل و رەحمەت و رێز
بجولێوە، لەمەش دا، گـــــــەورەیی و هێز

کە پێوەرت ئیخلاســــــــە و خزمەت و کار
ئەوسا هـــەقی و مووەففەقی و خوداش یـار!

---

[1] (...وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ...) ال عمران–١٥٩

# بەرپرسیاریی

بـــەرپرسیاریی، لـــە دینی خوادا ئـــەرکـــــە
خـــەڵات نییە، بیری وا لە ســـەر دەرکـــــە!

پێت وانەبێ، کاربـــەدەست و براگـــــــەورە
حازرخۆرە و جێی نـــەرم و پارووی چەورە!

نـــەخێر، نـــا، نـــا! لێپرسراو و بـــــەرپرس
خزمەتکارە و بۆ ئـــــەوە ئـــــەرکی قورس

کەسێك ئاوا لـــــە مـــەسئولیەت نـــــەتۆرێ
لەســـــەدا ســـــەد لە مـەحشەر تێ دەدۆڕێ!

ئای مەسئولیەت، چەند گرانی و پڕ مەترسی!؟
چۆن ئیماندار هـەڵپـــــە دەکا بۆ کـورسی!!

ئـــەوەی داوای مەسئولیەت کات و سوور بێ
خوایە! دەبێ چەند لە ڕەحمی تۆ دوور بێ!؟

مەنسـەب تەڵەب، ئەوەش لەسـەری سووره
(خۆشەویستمان) لـە ڕوویان ڕق ئـەستوره

دەسا ئـەمیر! جـەنابیشت بـه كوللی
وەك (خۆشـەویست) بفەرموو (لانولی)[1]ی

ئاوا مـەسئول دەبێتـه خادیم و بـەس
دەبـا(هـودا) پێوەر بێ، بۆ هـەموو كـەس!

هەركـەسێ ڕێز و شكۆی خۆی پاراست !
مـانـای گـرتوویـە، ڕێڕەوێكـی ڕاست
گـەر هەردەم دەخـەم كەڕامەتـی بـێ !
دەگـاتە لـوتكه و بـەرزترین ئاسـت

[1] فەرموودە (انا لانولي هذا العمل احدا من ساله او احدا حرص عليه) متفق عليه.

# هەرکەس بیەوێ سەربەرز و شاد بێ

هەرکـــەس بیەوێ سەربەرز و شـاد بێ
دەبێ هـــەمیشە خودای لەیـــاد بێ

ســـــەر و ماڵی خۆی، قوربانی خوا کا
زەخیرەی رۆژی قیامـــــــەتێ داکا

عـــەودالّی چاکـــە و خزمەت و خێر بێ
خاکیی و لێبوردەو سەخی و جوامێر بێ

سینەخاوێن بێ و دڵ نـــەرم و ڕووخۆش
بۆ بـەرژەوەندی گشتیی بێتـــە جۆش

وەك مۆم ڕێگـــەی ژین، ڕۆشن کاتـەوە
خراپـــە بـــە چاکـــە، وەڵامداتـــەوە

بێگومان هـــەرکـــەس لـــە ژیندا وابێ
نـــادۆڕێ و توشی بـــەدبـــەختی نابێ!

# بۆ پێشەوە بەرەو لوتکەی سەرکەوتن

دەبا تەبا، یەکڕیز و دەست لەنێو دەست
بە دانایی و بە وریایی و لەســــەر هەست
لە مەیدانی خەبات و خزمـــــــەت و کار
بە نەسرەوتن، هـەوڵدانی چڕ و خـــەست
بۆ پێشەوە بەرەو لوتکـەی سەرکـەوتن
لە دەوری یەك ئامانج و نیاز و مەبـەست
مسۆگـــــەر ئێمە وابین ســـــــەرفرازین
ناحەزانیش زەبوون و بێ هیوا و پەست

# زانست

بەنـــاوی خوای دانا و زانــا        خوای خاوەن هێز و بە توانــا
کە بوونی لـە نــــەبوونەوە        بەوپەڕی دانـــــــایی دانـــا

زانست بناغەی بوونــەوەرە        (بوون) تاجی عیلمی لـەســەرە
سەرنجی هەربوونێ دەدەی        بە عیلمی خــوا موونـــەووەرە

خوا زانایە و زانـــاو زانست        هـەر ئـەو ڕێزی وانی دەرخست
دەهــــەژێنێ (هَلْ يَسْتَوِي)[1]        فامی کــــاڵ و ویژدانی سست

نــزای (زِدْنی عِلْماً)[2] کـــەوا        خـــوا فەرموویـــە بە پێشەوا
بەڵگـــەی بایەخی زانسـتە        زانست نانە و ئاو و هــــــــەوا

---

[1] (...قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ...) الزمر -٩

[2] (...وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا) طه -١١٤

# بۆ (مامۆستا سەید ئەحمەدی پەپوولە)[1]

۱۹۹۹/۱۱/۸ رانیە

سڵاو، میراتگری پێغــــەمبـــــەری خوا
سڵاو، ئـــــــاڵاهــــەڵگــری بیر و بڕوا

سڵاو، ڕێبواری ڕێگــای ڕاست، سڵاوێك!
پێشکەش بە تۆ، هەموو دەوران و تاوێك

---

[1] (ئەحمەد عەبدولفەتاح مەحەممەد مستەفا) ناسراو بە(مامۆستا مەلا سەید ئەحمەدی پەپوولە) ساڵی ۱۹۲٦ لە گوندی (نۆڵچکە)ی بەری مەرگە لەدایکبووە، زۆر شوێنی کوردستان بۆ خوێندن گەڕاوە، دووجار ئیجازەی عیلمی لای دوو گەورە زانای کورد وەرگرتووە، جاری یەکەم لای مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و دووەمیشیان لای دکتۆر مستەفا زەڵمی لە ساڵی ۱۹٥۳ لە مزگەوتی (بن تەبەق) لە سلێمانی، سەرەتا لە گوندی نۆڵچکە و پاشان لە سندۆڵان و سۆفیان و چەندان شوێنی تر مەلایەتی کردووەو کۆتایی شەستەکان چووە بۆ قەڵادزێ و لەوێ نیشتەجێ بووەو دوای راگواستنی پشدەریش، سەرەتا لە جدیدە و پاشان لە دارەتوو دانیشتووە، لە دوای راپەڕین گەڕاوەتەوە قەڵادزێ و دواجار لە مزگەوتەکەی خۆی مزگەوتی (سەیدان) بە مەلایەتی و تەدریسەوە سەرقاڵ بووە و لەدوای راپەڕینیشەوە تا کۆتایی لە لیژنەی فەتوای ئەوسای بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشووشدا ئەندام بووە، نزیکەی ۳٥ ساڵ خەریکی وانەوتنەوە بووە، ۱۳ جار سەفەری ماڵی خوای کردووە، کەسێکی زۆر نەفس بەرز و دامەزراو و پارێزکار بووە، هەرگیز بەلای دەسەڵاتداران و تەماع و ماڵی دنیادا نەشکاوەتەوە، زانایەکی عیرفانیی و پەیوەست بە خودا و دڵ ئاوەدان و هەژاردۆست بووە، لەلایەنی زانستی و ئیمانیی و روحییەوە سوودی زۆر بە زانایان و خەڵك گەیاندووە، تا سەرەنجام سەعات ۸ و ۲٥ دەقیقەی شەوی ۱۹۹۹/۱۱/٤/۳ لە تەمەنی ۷۳ ساڵیدا بە هۆی نەخۆشییەوە لە قەڵادزێ وەفاتی کردو هەرلەوێش لە مەراسیمێکی شکۆداردا بە خاك سپێردرا.

سڵاو، زانـــای بـــەڕێز و ڕاستـــەقینە
سڵاو، ئـــــەی عاشقی ئەم نوور و دینە

سڵاو، (پەپوولە)[1] ی گوڵزاری عیبادەت
هێمای زوهد و تـــەوازع و قەنـــــاعەت

سەفەرت کرد، سەفەرت خێر، مامۆستا!
ئینشائـــەڵڵا گۆڕت باغێکـــــــــە ئێستا

ڕوحت تێکـــەڵ بـــەخۆشییە و ڕووسووی
خوا یاربێ خوا، لە تـــاوانت دەبووری!

لـــــە دنیادا خۆت ســـازدابوو بۆ مردن
بۆی ئـامادەن، ئـــەوانەی ژیر و وردن!

ڕێگایەکە، لەبەر هـەمووان، کێش ژیرە!
(کفی بـــالموت واعـــظا)[2]ەی لـــە بیرە

---

[1] لەبەر خواویستیی و تەقوا و و پاکیی، پێی دەگوترا پەپوولە و هەر بە (مامۆستا مـەلا سەید ئەحمەدی پەپوولە)ش ناسرابوو.

[2] (کفی بالموت واعظا) بـە مـەوقوفی لـە (ابـن مەسـعود)ەوە بـە سـەنەدێکی صـەحیح گێڕدراوەتەوە، واتە: مردن بەسە مامۆستاو ئامۆژگاریکاری مرۆڤ بێت.

بەڵێ تۆش وەك (مامۆستای نوورەدینی)[١]
بەجێت هێشتین لەنێو ماتی و حەزینیی

خواتان دەگەڵ، بەهەق بەرزو بەڕێز بوون
بەنێوبانگ و خاوەن مێژوو و پەرێز بوون

بەســـــەر خـــەتی شەرعـدا ڕادەبردن
ڕەسەن بوون و جێگای شانازی کوردن

کەسێ شەیدای هەق و خزمەت و خێربێ!
جێیی خۆیـــەتی، لە ئێوە وانە فێر بێ

[١] (مامۆستا مەلا موحەممەدی نوورەدینی) ساڵی(١٩٢٠) لە گوندی(هوڕێوە)ی سەر بە قەڵادزێ لە دایك بووەو شەوی (٢٨/٢٩/١ ١٩٩٨) لە هەولێر بە هۆی نەخۆشیەوە وەفاتی کردو لە قەڵادزێ نێژراوە، ناوبراو یەکێك بوو لە مامۆستا پایەبەرز و شارەزاکانی کوردستان و دۆستێکی هەرە نزیکی (مامۆستا مەلا سەید ئەحمەدی پەپوولە)ش بوو.

# دایە

دایە، دایە، دایکی خۆم، دایـە، دایـەی شیرینم!
لـــە میهرەبانیی خـواوە، سۆز و میهرت دەبینم

ئامێزت پڕ لە سۆز و میهرەبانیی و پـــــەرۆشە
ناتوانن وێنای تۆکەن، هەرچی ئەندێشە و هۆشە

هـەناوت دێتە جۆش و لــەنــاخی دەروون و دڵ
بەخۆتمەوە دەگوشی، بۆنم دەکــەی وەکو گوڵ

دەمخەیە سەرچاوان و شـــــەونخونی دەکێشی
لەگەڵ هەر ئازارێکم، جـەرگت ژان دەکاو دێشی

دەسا خودایــــــــە باڵی میهرەبانیی بۆ ڕاخە!
هەرچی خەم و ئازارە، لەســـەر دایـــەی وەلاخە

# ژیانی دونیا

١٩٩٩/١١/١٣ ـ رانیه

دنیا ڕاڕەوی ژینێکـــی نوێ یـــــە
بێ (باوەڕ) تاڵـە و بێ تام و خوێ یە
ڕازی بـــاوەڕە مانـــای پێ دەدات
بێ باوەڕ وڕە، کێ یە و لەکوێ یە ! !

دەخیل نەفسی پیس وا لە بۆسـەدا!
با دنیای فـانی، فریومان نـــــەدا
مەگـــەر نابینن هەموو جێی دێڵین!
پیاو و ژن، دارا و نـــــەدار و گەدا

کەسێ هۆشمەندە و هۆشیار و زانـــا
دنیای لـە خزمـەت دوارۆژی دانـــا
ئای چەند بەدبەختن دنیا پەرستان!
دۆڕان، دواڕۆژیان مـادام وەلانـــا

بۆ بـەرزی دنیا و دواڕۆژ بفـــەرموون
دەرگــا والآیە، ڕێ ڕاست، ئاسۆ ڕوون
فەرمانبـەرداری خوا و پێغەمـبەر بن
نەك نەفس و ڕێچکەو شەیتانی مەلعوون

# سڵاو و نەفرەت

١٩٩٩/١١/١٤ ـ رانیە

سڵاو کـوردستان، نیشتمانـی دابـەشراو
سڵاو فەڵەستین، خاکی قودسی داگیرکراو
سڵاو کۆسۆڤــا[١]، سڵاو کشمیر[٢]ی دزراو
سڵاو نیشتمان، هێمای بـــەرگری، سڵاو

---

[١] کۆسۆڤۆ یان کۆسۆڤا، سەر بە ئەوروپایەو لەسەدا ٩٠ی دانیشتوانەکەی مسوڵمانن، لە ١٩١٢ەوە لە ژێر دەستی صرپەکاندا بووەو ١٩٨٨ دیکتاتۆر سلۆبۆدان میلۆسۆفیجی سەرۆکی یۆگۆسلافیای ئەوکات، کردیە شوێنی کۆکردنەوەی صرپەکان و لە ١٩٩٠دەسەڵاتەکانی لێ سەندنەوە، کاتێک لە کۆتایی نەوەدەکاندا یۆگۆسلافیا کەوتە حاڵی هەڵوەشانەوەو سلۆفینا و کرواتیا سەربەخۆییان راگەیاند، کۆسۆڤاییەکانیش کەوتنە کار بۆ سەربەخۆیی و بەرپەرچدانەوەی صرپەکان، لە ١٩٩٧ سوپای رزگاریخوازیی کۆسۆڤا لەگەڵ صرپەکان کەوتە شەڕەوەو صرپەکان زۆر تاوانی دڕندانەیان دەرهەق بە کۆسۆڤا و خەڵکەکەی ئەنجامدان، لە ٢٤ی مارسی ١٩٩٩ ناتۆ لە صرپەکانی دا، دواجار کۆسۆڤای خوێناوی لە ٢٠٠٨/٢/١٧ سەربەخۆیی راگەیاند.

[٢] هەرێمی کشمیر زۆرینەی مسوڵمانەو لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا ئیسلامی پێ گەیشتووە، لە نێوان هیندستان و پاکستان و صین دا دابەش بووە و حاڵی ناکۆکی و تێکهەڵچوونی نێوان هیند و پاکستانە، لە خەباتی رزگاریخوازیی دایە دژ بە ستەم و داگیرکاریی هیندستان و وەدەستهێنانی سەربەخۆیی.

نەفرەت لە داگیرکـــەر و زۆردار و تاغووت
خەزانی باخی خەڵکن، بـــەپیسی و باڕووت
خوایە ! تەفرو تونابن ، سەرشۆڕ و نابووت
بەوێنەی ئەبو جەهل و فیرعەون و جالووت

دنیا پڕ مەرگەســــــات و زوڵم و تاوانـــە
پڕ لە هــــــــاوار و ناڵەی دڵ سووتاوانـە
گۆڕێکی بـــە کـۆمـــەڵی پیر و لاوانــــە
سەیرکەن، باران، خوێن و ئەشکی چاوانە !

زلهێزانن، سەری ئـــاشووب و خوێن ڕشتن
زلهێزانن، مایــــــەی چەوسانەوەی گشتن
ڕەواج دەدەن، بە زوڵم و فـەساد و کوشتن
ئەی چەوساوان، هەرخەباتە ڕێی سەرکەوتن!

# بۆ (مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازی)[1]

٢٠٠١/١٠/١٣ رانیە

(مامۆستا ئەحمەدی قازی)ی بەخێر چی!
زانای ڕەسەن، جێی شانازیی، بەخێر چی

ئەتۆ ئەهلی ئیمانت خۆش دەویستن
دنیا و پایە و ئافەرینت نەویستن

---

[1] ناوی تەواوی (ئەحمەد رەسوڵ حەمەد)ەو بە (مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازی) بەناوبانگ بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی ساڵی ١٩٦٤ قازی شۆڕش بووە لە سەنگەسەر، ناوبراو ساڵی ١٩٣٠ لە گوندی (سکتان)ی ناوچەی خۆشناوەتی هاتۆتە دنیاوە، خوێندوویەتی و دووجار ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، جاری یەکەم لای مامۆستا مەلا حوسێنی دەشتێوی و جاری دووەمیش لای مامۆستا مەلا مەعصومی کۆیی، پاشان بە پلەی ئیمتیاز پەیمانگای ئیسلامی تەواو کردووەو بووە بە مودەڕیس، زۆر دژایەتی بەعسی کردووە و بەعسیش زۆر لێی خەفتاوە، تەنانەت لەبەر ملنەدانی دوعاکردن بۆ سەددام و رژێمەکەی لە وتارەکانیدا، لە وەزیفە دەردەکرێ و تا دوای راپەڕین دانامەزرێتەوە، مامۆستای قازی دوای راپەڕین زۆر لەگەڵ کاروانی رابوونی ئیسلامییدا هاو هەڵوێست بوو و بە دڵ و بەگیان بەرگری لە ئایین و گەل و نیشتیمانەکەی دەکرد، لە میانی بەشداریکردنی لە لیژنەی فتواشدا بە شوێن چارەسەری کێشەی هاووڵاتیانەوە بوو، بەردەوامیش تەدریسی هەبوو، تا دواجار لە دوانیوەڕۆی رۆژی هەینی ٢٥ی رەجەبی ١٤٢٢ی کۆچی بەرامبەر ٢٠٠١/١٠/١٢ لە رانیە کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەشی لە گوندی سکتان بەخاک سپێردرا.

ڕێبواری ڕێی خــەتی شەرعی خـودا بووی
بەکردەوە لەگــــــەڵ زۆران جودا بووی

سەرت بەرز و تاجی بەرزیت لەســـەر بوو
خەمی خـەڵك و دینی خودات لەبـــەر بوو

بە هەق مەرگی کــەسی زانـــــا کەلێنە
زانستی ئــەو چرایــــــە و شەو ڕەوێنە

تا کاروانی زانــــــــاو زانست بە گوڕ بن
مزگــەوت و حوجرە و پــەیمانگا، با پڕبن

# ئاهەنگی سەرکەوتن

جەژنـــــە و دەسا بفەرموون
دڵتان شـــاد و چاوتان روون
خەندەو بزەو دیاریی و گوڵ
بکـــەن بـــە گـوڵـزاری دڵ

خۆشـــەویستیی و میهر و ڕێز
بگرنـــــە سینە و ئـــــامێز
بـــە گڕی عیشقی خـــاوێن
با کینــــە و ڕق، وەتـــاوێن

بـــە جـــەژنی ســـەرفرازی
سۆزی ســـــەدا و ئــــاوازی
بـــا ژین لـــــــە ژان داماڵین
لـــەشکـری خـــەم ڕاماڵین

جـــــەژن، خـۆری ڕۆشنــــە
ئـاهــــەنگی ســـەرکەوتنە
ئــــــاوی کانیی و کارێزە
تـــاڤگەی بەختیاریی و ڕێزە

ســــەردان و ئــــــاشتەوایی
جــــــەژنانـــــە و پیرۆزبایی
تۆقـــــە و گەردن ئــازادی
دەبنــــە هەوێنی شـــادی

# کۆچ

ساڵی نوێی کۆچی هـاتـــەوە
تـــا دێ ڕەونـــەق دەداتـــەوە
پڕشنـــگی ڕۆژێکی نوێ یـــــە
پەیـــامی سەروەریی پێ یـــە

کە گوڵزاری هیجرەت پشکوت
بەیـــانی ئـــازادیی ئەنگوت
خۆری چـــەوساوان دەرکەوت
هـەق پڕشنگی دا و سەرکەوت

کە هیجرەت چەخماخەی لێدا
تـــاغوت کـــەوتن لەژێر پێدا
لەو ڕۆژەوە دەوڵـــــەتی نوور
دەکاتە ڕۆژ، شەوی دەیجوور

کاتێك پێغەمبـــەری سەروەر
ڕێگای هیجرەت دەگرێتەبەر!
ڕاستەوخۆ دەفـەرموێ پێمان
ئیسلام ئیشی دەوێ لێمان!!

# بۆ شمشاڵی (قاله مەڕە)[1]

هـــەر بتبیستم، بەدڵ مەحزوون و مەستم
سۆزێکی زۆر بـــەکـوڵ، دەڕژێتـە هـەستم

چ دەنگێکی ئــەفسوناویی و بـــەجۆشی!
من تێناگـــەم، لەبەرچی هێندە خۆشی!؟

سەد نامەخوا، لە بەهرەو بەهرەمەندیت!
تۆ کوێستان و  باغ و مێرگ و زەمـەندیت

بە باعەی مەڕ، بـە دەنگی زەنگوڵ و ڕان
بویتە یەکەم تابلۆی جوانی کوردستان!!

---

[1] شمشاڵ ژەنی ناوداری کورد (قاله مەڕە) ناوی تەوای (قادر عەبدوڵلا زادە)یە، ساڵی ١٩٢٥ لە گوندی(کولیجە)ی بۆکان لەدایکبووە، لـە تەمـەنی یـازدە سـاڵیەوە دەسـتی بـە شمـشاڵ لێـدان کـردووە، لـە چـەندان دەزگـای ڕاگەیانـدن و بۆنـەدا بەشـداری کـردووە و خەڵاتی ڕێزلێنانی پێدراوە، ساڵی ١٩٨٥ خێزانی پێکەوە ناوە، لە تەمەنی هەشـتاو پێـنج ساڵیدا و لە شەوی پێنج شەممە ٢٠٠٩/٥/٢١ بـە نەخۆشـی لـە بۆکـان وەفـاتی کـردووە و ڕۆژی دواتر ٥/٢٢ لە (ناڵەشکێنە)ی بۆکان لە مەڕاسیمێکی جـەماوەریی گـەورەدا بـەخاک سپێردراوە.

# شوانی

١٩٨٥

خۆزگـــە شوانی مێگەلێکی زۆری پێنجسەد سەر دەبووم
دەست بە گۆچان و بلووریێ، ڕووبەڕووی شوانی دەچووم
جا شەوان لەجیات ئەوەی گەرچی لە(جێ)دا مت بنووم!
دەستم دابـایـــە بلـــوورم، تێمبکـردا هێزی فـــووم
پاڵەپشتیشم کـەژێ بـا، یـا دەوەن، یا داربـــــەڕووم

هەرکەس کەسێتی خۆی لە ژێر پێ نا
بۆخۆی کۆتــایی بـە (بوون)ی هێنـا !
سەیرە، کەسێ خوا، ڕێزی لێ نابێ!!
بێ، خـۆی ڕیسواکا، وا سووک و سێنـا

# پێشمەرگە

ئەی پێشمەرگە، سڵاوی خواو گەل و نیشتیمانت پێشکەش
تۆی چقڵی چـاوی دوژمن و داگیرکـەری هار و سەرکەش
تۆی پـارێزەری وڵات و مـژدەی ئـاییندەیـــەکی گـەش
تۆی مەردانە لەسەنگەردای، دژی هـەموو دەستێکی ڕەش

تۆ پەیـــامی شـــەهیدان و ئاڵای کوردستانت پێ یـە
تـۆ ڕێبازی تێکـۆشـــان و ورە و کۆڵنـەدانت ڕێ یـــە
هەناسەت سروەی ئـازادیی، دەشت و کێو و شار و دێ یە
گڕی لولــەی چـەکی دەستت، پرشنگی ڕۆژێکی نوێ یـــە

مەشخەڵی شۆڕشی گـــەل و خەبـــاتی ڕزگاریخوازیـــی
هاوڕێی لوتکـــەی سەرکەوتن و سەربڵندیی و سەرفرازیی
شورەی پۆڵایینی خاکی، شێر و پڵنگ و هەڵۆ و بـــازی
تاجی شەڕەفت لەســـەرە و هێمای سەروەریی و شانازیی

ئێستا کوردســـتان سەراپـا، سروودی تۆ دەڵێتەوە
ئـاڵامان بـــەدەستی تۆوە، لەبـــەرزی دەشـــەکێتەوە
دوارۆژی کورد و کوردســـتان، وەکو خۆر دەدرەوشێتەوە
هێزمـان بۆ ستـەمکارانە و مست لـە درێشە دەکشێتەوە !

# ئەم دینە پاکە

٢٠٠٢/١/٣

ئەم دینە ڕۆشن و پاکە
نیشاندەری ڕێگەی (چاك)ە
ڕێی ڕزگاریی گەل و خاکە
دەبا هەموو لە ژێر سایەی ئەم دینەدا
لەم ژینەدا
دەست لە نێو دەست
ڕێگا ببڕین بەرەو مەبەست
***
پەیامێکە لەخواوەیە
خێر و خۆشی بەدواوەیە
بۆ بەختیاریی سەرچاوەیە
دەبا هەموو لە ژێر سایەی ئەم دینەدا
لەم ژینەدا
دەست لە نێو دەست
ڕێگا ببڕین بەرەو مەبەست
***

بەهاری ژینی ئەم دینە

جوان و خەملّیوە و ڕەنگینە

ژین تەنیا لەوێ دا، ژینە

دەبا هەموو لە ژێر سایەی ئەم دینەدا

لەم ژینەدا

دەست لە نێو دەست

ڕێگا ببڕین بەرەو مەبەست

***

دنیا و دواڕۆژی دروشمن

قۆناغی ڕێن، ژیان و مردن

تا ڕووسوور بین لای خوای مەزن

دەبا هەموو لە ژێر سایەی ئەم دینەدا

لەم ژینەدا

دەست لە نێو دەست

ڕێگا ببڕین بەرەو مەبەست.

# دین دەستەملانی زانستە

٢٠٠٢

چ دینێکی مـوبینە و ڕاست و ڕۆشـــن!!
ژیر، ئەوانـــەن بـە شیری پاکی گۆشـــن

چ دینێکی دەستـــەملانـــی زانستـــە!!
بۆت بێنمـــەوە، سـەدان زاراوە و ڕستە!

تـــەماشـــای (اقْرأْ)[1] و (هَلْ يَسْتَوِي)[2] کـە
دە تـەسلیم بەو سەرت بۆ خوا نەوی کە!

گولاڵـــەی عیلم و مەعریفەی شەریعـــەت
خەملاندویـــە، هەمـوو ژین و تەبیعـــەت

---

[1] (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) العلق –١

[2] (...قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ...) الزمر –٩

بـــەفووی زار و هـــەوای نەفس و لـەخۆڕا
بە هیچ کەس، ڕاستیەکی ئیسلام نەگۆڕا

تەماشـــاکــــــە ! پڕشنگی خۆری زانست
دەمــی زۆر ناحـــەز و ناحـــاڵی داخست

ئای لەم دینە ! کە دینداری دەوێ و بەس!
دینی ژین و ســـــەرفرازیی هـەموو کــەس

# بەخششی ئازادی

٢٠٠٢/٣/٧

له مێژبوو، کورد دیل و پەستی دەست و پۆستالّی دوژمن بوو
خاك و خۆی خەڵتانی خوێن و سوتماك و ئەنجن ئەنجن بوو
هەموو ماف و هەقی خوراو و هەموو خۆشیەکی لێ ون بوو
بۆیە سەر و ماڵی فیدای ڕێی ئازادیی و سەرکەوتن بوو!

کاتێ خوا بۆ کوردی ڕەخساند، بەفەزڵی خۆی دەرفەت و هەل
بڵێسە و مەشخەڵی شۆڕش و چەخماخەی ڕاپەڕینی گەل
وەکو بورکانێك تەقییەوە و تەختی زۆرداریی خستە تەل
بەم شێوە خۆری ئازادیی کوردستان دەرکەوت لەکەل!

ئەم ئازادییەی کە دەسکەوتی یەکبوون و خوێن و خەباتە
ئەم ڕزگارییەی کە ڕەشماڵی بەختیاریی گەل و وڵاتە
بۆ هەمووانەو لەسەر هەمووان، ئەرك و پێویستیی گشت ساتە
شوکر و گەشە و پارێزرانی، چونکە بەخشش و خەڵاتە

کە ناحەز ویستی ئەم کوردە، لەناو بات و لە ژێرپێ نێ
نەیزانی کورد گەلە و (گەل بوون)، فەرمانی خوایە و دەمێنێ!
ئەوەی دژبێ بە فەرمانی خودا، خوا تێکی دەشکێنێ
گەلی کورد دوژمنت تێشکا، ئەمەت ئەمڕۆ و ئەوەش دوێنێ!

# هاواری تێکۆشان

٢٠٠٢/٦/٢٧

لە پێناو چەسپاندنی شەریعەتی خودایی
بەرپرسیارین بە ئەمر و ئاراستە و ڕێنومایی
بۆیە بەنیازی پاك و ورەی بەرز و دڵنیایی
کەوتووینە بانگەواز و شۆڕش و گیانفیدایی

ئێمە، کە تێکۆشەری ڕێگەی خوای میهرەبانین
بە هۆشیاریی و وریایی، خەریکی تێکۆشانین
پارێزەری ئیسلام و میللەت و نیشتمانین
لە لوتکەی خەباتەوە، بۆ ئازادیی دەڕوانین

هەتاکو ئاڵای ئیسلام شەکاوە بێ، هەمیشە
هەتا ڕەگی زۆرداریی و خراپە دەربێ لە ڕیشە
دەبێ بەردەوام هەوڵ و خەبات بکەینە پیشە
لە هەڵمەت و ئازایی، هەڵۆ بین، شێری بیشە

زانایان! ئیسلامخوازان، لاوانی خوێن گەرم و ژیر!
دەبێ یەکخەین هێزی، بازوو و حەماسەت و بیر
میللەتی پەرتەوازە، تێشکاوە، دیل و ئەسیر
بە برایەتی و یەکڕیزیی، قەڵامان قایمە و ڕاگیر

# شەهیدان

٢٠٠٣/٣/١٢

شـــەهیدان، نـووری چـاومانن
هێزی دڵ و هـــــەنـاومـانن

لە نـــاخـەوە خۆشمان دەوێن
بـۆ ئـــازادیی بوونـە هـەوێن

هـەڵۆی لوتکـەی تێکۆشـانن
خـــاکـــــەلێوەی نیشتیمانن

بەسـەر و ماڵ و خوێن و گیان
لە ڕێی خوا و چەوساواندا ژیان

بـەیداخی سـەروەریی و شکۆن
پرشنگی ئـەستێرەی ئاسۆن

مـەشخـەڵی ڕێی سـەرفرازیین
مایـەی ئەوپـەڕی شانازیین

بوونـــــه زانكـۆی بڕوا و ســـەبر
ڕووسوورن، نەلەخشـــاو، نـەمر

سەرمەشقی پاكیی و دڵسۆزیین
لای خوا، خاوەن ڕزق و ڕۆزیین

خـــاوەنی بـــــاشترین بـەشن
تاجی ســـەر (سەر)ی ئێمـەشن

# ڕەمەزانی ڕەحمەت[1]

٢٠٠٣ سلێمانی

ڕەمـــەزانـــــــە و میوانێکــە و چ میوان!
لە گشت ماڵێ، خانــەخوێ و میری دیوان

خۆشـــەویستیی بـەجۆرێکی بـەجۆشـــە!
جۆشێنـــــــەری سۆز و میهر و پـەرۆشـــە

قوڵپ دەدا بــەلێزمـــەی بـــارانـی ئـــەو
کانیی بڕوا و خێر و ڕەحمەت، ڕۆژ و شەو

دەسا خوایـــــە لەو ڕەحمەتە بەشی مە!
پـرشنگ بدا خۆری ئـــاسۆی گـەشی مە

[1] ئـەم شـیعرەم لـە ٢٠٠٣ لـە سـلێمانی نووسـی بـوو و نوسـخەم لا نـەمابوو، ڕۆژی ٢٠١٤/١٠/٣١، م صەلاح عەبدولقادر نوسـخەی ئەصـڵی کـە لای خـۆی پاراسـتبووی، بـۆی هێنامەوە ڕانیە و سوپاسم کرد.

# قوتابی

٢٠٠٤/٧/١٥ رانیه

سڵاوی خوات لەسەر، هاوڕێی قوتـــابی!
تۆ چاوی گــەل و خــاك و دایك و بــابی

هـــــەنگی دەوری داهێـنان و زانـیاری
ڕێژنـــە بــارانی پـایز و بـەهـــــاری

خــەڵاتـی دەستی مامۆستای بـــەڕێزی
بۆ پێشکــەوتن، بیر و بــازووی بـەهێزی

بۆ کورد و کوردســـتان و کۆمـەڵ و هـۆز
گوڵی هیوای، نەژاکێی خوایــە یـەك تۆز!

چەکی خامەت لەدەستدایە و هـەموو دەم
سێرە دەگری لە هـەور و شەو، مژ و تەم

تـۆ پێشڕەوی شـــارستانیی و زانسـتیی
دژی دەردی نەزانی و پەستیی و سستیی

بۆ پێشەوە ڕێگا دەبڕی و بەڕێوەی
لە ئاست لەشکری تاریکیی بەپێوەی

بە تۆیە گوڵی پێشکەوتن دەپشکوێ
داهێنان و هەنگاو و بەرهەمی نوێ

ئەوەی خزمەت بە تۆ نەکا، کەواتە
هاوپەیمانی ناحەزانی وڵاتە

پڕ گەوهەرە دەریای زانست و فێربوون
زیتەڵ، نازانێ ماندووبوون و تێربوون

زانست دەرگای لەسەرپشت بۆهەموو کەس
دەسا خوێندکاری ئازیز، قەت مەڵێ: بەس

قەت گەندەڵی و خراپە و خۆپەرستیی
بە ڕەوتی زانست ناهێنن نشوستیی

نوکی خامەی پەیامدار و وشەی هەق
وەکو قەندیلە و چۆن قەندیل دەبێ لەق!

عەزیزم، تۆو مامۆستا دەست لەنێودەست
بە هێزی بیر و بازوو و باوەڕ و هەست!

تێدەکۆشن بەرەو لوتکەی شکۆ و ڕێز
دەیسەلمێنن، زانست هێزە، ئەمما هێز!

دەخیل! دەبا پەیام و ئەرکی ئێوە
کە ئاییندەی گەشی گشتمانی پێوە

بە جوانی و پاکی و پوختی جێ بەجێ بێ
تا بەختیاریی، شاربەشار، دێ بە دێ، بێ

دیسان سلاوی خوات لەسەر قوتابی
یاخوا هەردەم سەرکەوتوو و بێ بەلا بی!

# شالاوی شەڕ

٢٠٠٤/١٠/٢١

ڕێبوارین، بەنێو چخوردا، بەڕێوە
بەبێ سۆزی خودا، حاڵمان پەشێوە

حەزیای نەفس، لەنێو جەستەو دەروونا
جینگڵ دەدا و خەریکی هات و چوونە

تاومان دەدا بەرەو پاوانی تاوان
دەمانخاتە هەزاران چاڵ و داوان

لەولاشەوە، ئیبلسی نەگریس و پەست
لە چوارلاوە دەهێنێ هێرشی خەست

ئینجا دووڕوو و بێباوەڕی شەڕانگێز
لە ڕوومانداں بەکینە و جۆرەهای هێز

کەوتووینە بەر شالاوی لەشکری شەڕ
بەلام خوا پشتیوان بێ، بەرزە باوەڕ

ئــەی ڕێبـواری ڕێـبازی ژین، دەخیلە!
هــەر ڕێگــەی خوا، بۆ ڕزگاریی دەلیلە

وریابــە ئــــادەمیزاد ڕێ نــــەگۆڕی!
ڕێی هەق بگرەو ڕوو بەرەو حەشروگۆڕی

ژین و تەمەن، لە ئەزموونداان هـەناسێك
کە ڕۆیشتن، لــەوان نــامێنێ بــاسێك!

# دەستی پاك

٢٠٠٤/١٠/٣١

سڵاو لەو دەستە پاکەی گوڵ دەچێنێ
ڕووی نیشتمان بـە خەندە دەخەملێنێ

سڵاو لەو دەستەپاکەی داسی (درك)ە
ڕێ نادا (زی) دڵی کـەس سارد و سڕکا

سڵاو لەو دەستە پاکەی دەستی بەرزە
بەخشندەیـە و میوە دەدا چوار وەرزە

سڵاو لـەو دەستە پاکەی بۆ برایـەتی
درێژە و گورجە، بۆ چاکە و مەردایەتی

سڵاو لەو دەستەپـاکـەی دەستی نازە
بۆ هـەرکـەسێ هـەتیو و بێ نـەوازە

سڵاو لەو دەستەپاکەی گـەرم و کارا
ڕۆزی حـەڵاڵ دەچنێتەوە لـە (کار)ا

سڵاو لەو دەستە پـاکـەی پڕ نزایـە
ڕقی لـە ڕق، دژی زەبـر و سـزایـە !

# ئەزموون

٢٠٠٥/١/٧

من ئەم ڕاستیەم لـەدڵدا، دیار و ڕوونە
کە هاتوومـــە باوەشی ئەم گـەردوونە
لەم سەفـــەر و گـەڕان و هـاتووچوونە
ژینم هـــەمووی ئـەنجامدانی ئەزموونە !

جێنشینم، خـــاوەنـی خواسـت و بیرم
بەم پایـــەوە لـەســـەر زەوی جێگیرم
کـە خۆم ناسی، بەمانـــای وایـە ژیرم
دەنا هەڵوێستەکەم چەوت و چەتوونە !

مادام هۆش و بیر و زەینم لـە سـەردا
دەبـێ وردبم لـە هــــەنگاو و گـوزەردا
تا ون نەبم، لە دەشت و چۆڵ و هـەردا
ئـــەوەی ون بێ لەڕۆشنایی، زەبوونــــە

عـــەزیزانم! سەفـــەری ژینی هـــەمووان
سنووردارە و لەگـەڵ پـــایز دەکا ژوان
خەزان دەیبا گەڵای عومری پیرو جوان
تەنیا (چاکە) دەستمایەی ژین و بوونە

# ژین و ژان

٢٠٠٥/٤/٣٠

کۆسپ و ژان و کوێرەوەری
هێمان بۆ بەرزیی و سەروەری

ژینی بێ ژان و (تا) و ناسۆر
دوورە بگاتە ژوانی خۆر!

بۆ ڕزگاریی و شکۆمەندی
دەرچوون لە دیلیەتی و بەندی

هەر خەبات و بەردەوامیی
ورە و باوەڕ و ئارامیی

دەبێ توێشووی ڕێبازمان بن
ئالاّ و درووشم و رازمان بن

.....

ڕێی ئازادیخوازان دیارە
بڕوایە، ورە و ئازارە

هیچ کەس خەیاڵی وانەبێ
بێ ئازار، ئازادیی دەبێ

ئــەم دینــە وامان فێر دەکات
ئەمــەش مێژووی گـەل و وڵات

ژین لەگــەڵ ژانـــا پێ دەگا
ژیر باش لەم ڕاستییە تێ دەگا

لەگــەڵ نــاخۆشی، دێ خۆشی
لەگــەڵ شین، شادیی دەنۆشی

سـەختی، دەرووی بــەدواوەیە
خــەندە، لـە خــەمدا تواوەیــە

بە دوای شەودایە خۆر هــەڵدێ
باتڵ، کــە هەقی دی هــەڵدێ

لوتکــە، دوای بڕینی هــەورازە
چێشتی خۆش دوای کوڵینی سازە

زەوی، لــە دوای کێڵان وەردە
دەرمانی تـــاڵ، دەوای دەردە!

ڕەز، دوای بڕین و بەرپاچ ڕەزە!
پێوەر کرداره، نــەك حـــەزە

بــــەگـــەرما، پێ دەگا میوە
کـەی لە ساو باران باریوە ! ؟

خـــەرمان، لەگـــەڵ دروێنەیـــە
دار لە کوێ، بـار لەو شوێنەیە !

مـەنزڵ، دوای بڕینی ڕێگـەیـــە
کۆشش، ڕێی پـایـە و پێگـەیـە

مرۆڤ بە بـەخشین، بەخشندەیە
چاك چاکە و گەندەش گەندەیە !

دوای لـەکڵ دانێ، پـوختـە زێڕ
بـە شۆڕش دەبیە شۆڕشگێڕ! !

دوای بناغـــــە، دیوار دادەنرێ
کوا نوێژ بەبێ دەستنوێژ دەکرێ؟

ئـــازادیی و ئـــازار، ژین و ژان
هـاوڕێ و هـاودەمن، بێ گومان

خەیـــــــاڵ بـــەلاوە دەنێین
بــــەو شێوە، ڕێبواری ڕێین !

# کوردستان

٢٠٠٥/٦/٢٦

کوردستان، خاکی باب و باپیرم
ئەی نیشتیمانی جوان و دڵگیرم
جوانترین خاک و زێد و هەواری
بەخشش و دیاریی پەروەردگاری

بۆ ئاوەدانیی و ئازادیی و شکۆت
بە ماڵ و بە گیان، تێدەکۆشم بۆت
سینەم بە ڕەنگی تۆوە ڕەنگینە
نەفرەت لەو کەسەی بە تۆ خائینە

سۆزی نیشتیمان، لە دڵما بەرزە
سەراپای جەستەی خستوومە لەرزە
خودا ئەم سۆزەی داوە بەم دڵەم!
بەدڵ عاشقی ئەم ئاو و گڵەم

پەرژینی خاک و نیشتیمانی خۆم
خزمەتی وڵات، شانازییە بۆم
بە ئاڵا و خوێنی شەهیدانەوە
دەچمە مەیدانی تێکۆشانەوە

# دەنگدان

٢٠٠٥/١٢/١ رانيه

دنيايـــــەك كارەسات و فرمێسك و ژان و نــاسۆر
خــەبــاتێكـی دوور و درێژ، قوربـــــانيدانێكـی زۆر

لەگــەڵ چــەندەها ڕژێمی چەوسێنــەر و ديكتاتــۆر
بـۆ ژوانـی ئــازادیی بوون، بۆ ماچـی گزنگـی خـۆر

ئێستاش تا ئەم میللەت و کوردســـتانـە خوێنینە
هــەمیشە دەستـــــەملانی ئازادیی بن لــەم ژینە

تا تێبشکێن ئەوانـــــەی لەکورد لە فێڵ و جەنگدان
بە جۆش و خرۆشـــــەوە، دەڕۆیین بەرەو دەنگدان

تا هـــاووڵاتیبوونیی، یەکسان لێرە مەیســــەر بێ
تا چەنگی حیزب تاسەر، لە قوڕگی حوکمەت بەربێ

تا یاسا و دادپەروەریی و چاکسازیی ڕیشـەیی بێ
تا دڵنیایی و متمانـــەی قوڵ و هـەمیشـــەیی بێ

تا گـــەندەڵی نەمێنێ و قڕی و پڕی بە ســـەرچێ
با مرۆڤی چـاك و پـــاك و شارەزا و دڵسۆز دەرچێ

جەماوەری خۆشەویست! میللەتی کوردی نەبەرد!
خاراوی ژان و ناسۆر، گـــەلی قـارەمان و مـەرد!

هەلی گـــەورەت لە پێشـــە و ڕۆژێکە ڕۆژی تۆیـــە
شوان و سەرۆك یەکسانن، لەپرۆسەی دەنگدان بۆیە

نـــاوی خودای لێ بێنـــە و قۆڵی لێ هــەڵبماڵـــــە
بەرەو سندوقی دەنگدان، بیکـــە بە نرکـــە و ناڵــە

دوور لە شەڕ و ئـــاژاوە و هەڕەشە و فێڵ و تەزویر
بیسەلمێنە، گەلێکی پێشکەوتووی، هۆشیار و ژیر

ئێستا، کـــە تۆ شۆڕشی هەڵبژاردنت لـە پێشـــە
لە بەرانبەر دەنگداندا، هیچ شتێك مەکـــە بەکێشـە

ڕۆژانێك شۆڕش و خوێن، پێشمەرگایەتی و هەڵمەت
ئەمڕۆش شۆڕشی دەنگدان، دەستم دامێنت میللەت!

دەنگت چرۆی هیوایە و نەخشـــەی دواڕۆژ دەكێشیٚ
نـائومێدیی وەلانێ و هەنـگـــــــاو بنیٚ بـۆ پێشیٚ

دەنگ ویژدان و هەڵوێستە، نەك كاڵاو بەرگ و پۆشاك
فرۆشتنی دەنگ و ویژدان، خیانەتە بە گەل و خاك

دەنگدان، شایـــــەتی دان و ئەرك و ماف و وەفایە
وریابە! دەنگ و ڕەنگ و ڕەنجت نـــەچێ بەزایـە!!

# کاروانی پڕ لە سەروەری

کاروانی پڕ لە سەروەریم
پەروانەی دەوری دادگەریم
بە بیر و بڕوا و هەستمەوە
دژی ستەم دەوەستمەوە

پەیامی ڕەسەنایەتیم
مەشخەڵی ڕێی مەردایەتیم
بۆنی خاکی نیشتیمانم
تریفەی خوێنی شەهیدانم

دەستم لە نێو دەستی گەلە
ئەی گەل ئەمڕۆ ڕۆژی هەلە!
بە دەنگی تۆ بۆ چاکسازیی
دەنەخشێ ڕێی سەرفرازیی

بە پشتیوانی خوای مەزن
دەڕۆین بەرەو سەرکەوتن
متمانەی گەل وەدەست دێنین
کوردستانمان دەنەخشێنین

# خەرمانی تەقوا

٢٠٠٦/٩/١٨

وا مانگی مـوبـــارەكی ڕەمـــەزان گــــەڕایەوە
مسوڵمان وەك خـــەرمانی تەقوایـــە بەلایـــەوە

مانگێكە پڕ لە سۆز و ڕەحمـەت و میهر و پەرۆش
دڵ لە بەرد نەرمتر بێ، لەو مانگـــەدا دێتە جۆش

دەرگاكانی بەهەشتی تێدا دەخرێنە ســـەر پشت
ئەمما ! دەروازەكانی جەهەننەم دادەخرێن گشت

شەیتانـــەكانیش كۆت و زنجیر دەكرێن، كەواتـــە
ئەم مانگە مانگی عەفوو و لێخۆشبوون و نەجاتـــە

بۆیـــە لەناخی دڵ و بە ئەوپـــەڕی شـانـازیی
بـــەخێری دەهێنین و دەوەستین لـــە پێشوازیی

دەك لەهەمووان پیرۆزبێ و بەخێربێ سەرچاوانمان
خودا بیكاتـــە مایـــەی سڕینـــەوەی تاوانمان

هەرکەسێ ڕێزی لێ نێ و فەرمانی خوا نـەشکێنێ
مسۆگەر سەرکەوتن و بەختیاریی وەدەست دێنێ

با ئەم مانگــــە بکەینە مانگی چاکـە و هاوکاریی
مانگی وەدەستهێنانـــی ســـەرفرازیـی و ڕزگاریی

هەموو ئەوانـــەی کــــە دیـکتاتـــۆرن
بۆ هـــەر زوڵمێکیان پاسـاویان زۆرن ! !
قـــــــەت دان بە هەڵەی خۆیاندا نانێن
ویژدان مـردوون و پیس و خـوێن خۆرن

# کەلامی نوور

٢٠٠٦/١٢/٨ رانیە

کەلامی خوایە ڕۆشنایی دەبەخشێ
ژین بە تەنیا بە نەخشی ئەو دەنەخشێ
ئەوەی خوازیارە لە ژیانا نەلەخشێ
دەبێ ڕێبازی قورئان بێ، ڕێبازی
هەر قورئانە مەشخەڵی سەرفرازی
****

کەلامی خوایە هەتوان و شیفا و چار
خۆری دڵی تەنگ و پەست و شەوی تار
ئەگەر شەیدای شەماڵی و ئاوی سازگار! ؟
هەتا دەرفەت لە دەست دا، تا زووە، زوو!
بۆ کوێستانی ژینی قورئان بفەرموو
****

بە نووری پاکی قورئانە، دەروون ڕوون
هەر قورئانە، وەڵامگۆی فەلسەفەی بوون
لەفێرگەی ژین یەك ڕێ هەیە بۆ دەرچوون
ئەویش ڕێبازی قورئانە و بەبێ ئەو
هەموو دنیا خەراباتە و خەم و شەو
****

هەر قورئانــــــــه بەختیاریی لێ دەبارێ
دەمانکاتـه خوشك و برای یـەك، بـه جارێ
دەمانکاتـه بـەندەی پــــــەروەردگارێ
خودایـــــــــه ! رێنوومایی و پشتیوانیت
هـــەردەم بـە ئـەهلی قورئـانمان بزانیت

ئـــاواتـــی گـــــەورە و ئامـــانجـی ڕەوا
هیمـمـــەتیـــان دەوێ، نــــەك فیز و هەوا
ژین چۆن بەخەون و خەیاڵ دەنــەخشێ ! ؟
بەشـــمان هەر خـــــەونە، لە شیرن خەوا !

# هاوڕێی هیوا

٢٠٠٧/٤/٢٧ قەڵادزێ

هەرکەس ڕێی قورئانی ڕێ یە
کلیلی بەختــەوەریی پێ یە

لەبــەر ڕۆشنایی ڕێ دەبڕێ
گیانی بەرەو بــەرزی دەفڕێ

هــەرگیز تووشی دۆڕان نـایـە
هەمیشــە هاوڕێی هیوایــــە

# گەشتی ڕەمەزان

٢٠٠٧/١٠/١٤

چ گەشتێکی ئیمانیی و ڕووحیی و دەروونیی خۆشە!
دڵی هەر ئیماندارێك، دەریـــــــای میهر و پەرۆشە
کوردســــــتان بۆ پێشوازیی، زۆر لەجۆش و خرۆشە
ئـــــەوەی دڵ و دەروونی، بە ئەشقی بـــاوەڕ گۆشە
ئەلهەق ئـــازا و دلێر و دووربین و خـــــاوەن هۆشە
ڕێبواری ڕێی بـــەختیاریی و مەردی بە کرد و کۆشە
ئەوەش توێشووی لە تەقواو ڕۆژوو و عیبادەت بۆشە
مانای وایـــە موفلیس و مایــــــــەپوچ و قەلۆشە
دووره لـــە ئـــاسوودەیی و شینگێڕ و سیاپۆشـــە
دەروونــی دەردەدار و چـرای دڵـی خـــامۆشـــــــە
خودایـــــە! بە لوتفی خۆت، تا گیانمان دەبەردایە
هەر هاوڕێی ئەم گەشتە بین، کە کوێستانی تەقوایە

# پەیمان

٢٠٠٧/١٠/١٤

دوای ڕەمـــــەزان و جەژن، ژیر و ئــــازا ئەوانــەن
هەر فـەرمانبەرداری خوان، خاوەن ورە و متمانەن

لەگـــەڵ چاکــــە خـەریکن، لە تـاوانـان تــەریکن
لە سەر خەت و ڕێباز و دینی خوای بێ شـــــەریکن

هەرگیز تەسلیمی نەفس و شەیتانی مــەلعون نابن
لە ســــەر پەیمان و وادەی خواپەرستین، تا مابن

خەرمانی تەقوا و چاکـەی ڕۆژوو و مانگی ڕەمەزان
بێ هودە بەبـا نـادەن، بۆ نەفسی پیس و نەزان

هەردەم هاوڕێی قورئـانن، لەسەر ڕەوشتی جوانن
شەیدای ڕەزامەندی خوای، بەخشندەو میهرەبانن

خودایـــــــە ! مسوڵمانی ڕاستەقینە و دڵسۆز بین
دڵسۆز و تێکۆشـــــەری ئیسلام و خاك و هۆز بین

## ئادەمیزاد، لەلای خوا پایە بەرزی

٢٠٠٨/٢/٧

ئـــــــادەمیزاد، لەلای خوا پایـــــەبەرزی
دەبـــا بڕوات وەکو کێو بـێ و نەلـــــەرزی
خـودا نـــاردوویـــــــــەتـی دینێکی کـاملْ
نوقسان نییە، ئـــــــەوەندەی نووکـی دەرزی
نادۆزیــــەوە کـــــەم و کورتی لـــــە هیچ دا
لە خۆت ڕا، تاوەکو ئاسمان و ئـــــــــەرزی
لە ڕۆژ و شـــەو، لە جوڵە و خـــەو، لە کێوان
لە خۆر و مانگ، لـــــە سوڕی ســـالْ و وەرزی
پێی بەخشیوی بـــــــەخششی بێ ئـــەژمارە
قـــــــەرزداری و وەفاداربـــــە بە قـــەرزی
بفـــــەرموو: ملکـــەچی ئەمری خودا بــــــە!
لە پای چی، سەرکەشی و دەشکێنی مەرزی!؟

# پەیامێك لە قەندیلەوە[1]

٢٠٠٩

قــەندیل، پەیــامێکی پێ یە
دنیا هەر هــەموو گوێی لێ یە

هەمــوو کوردێك دەیلێتــــەوە
هەقێکــــە و دەدرەوشێتــەوە

پەیـــــامی گەورە و بچوکە
کوردستانێتی کــەرکووکــــە

کێش دژی هــەق و مێژوویــە
گێلــــە، ویژدانی مردوویــــە

هەڵدەکێشێ هەنــاسەی ســەرد
دەبێ سەری خۆی دا لە بەرد!

[1] (وەڵامێکە بۆ ئەو شۆڤێنی و ناحەزانەی دەیانەوێ کــەرکووکی شــاری خۆشەویستی کوردستان، لە ئامێزی دایکی نیشتیمان دەربێنن و رقی خۆیانی بەسەردا برژێنن).

پەیامێکـــــە بۆ هەموو کـەس
تەنها هەر یـەك داوایـە و بـەس

چاو مەبڕنە خاك و ئـــــاومان!
بە کەس نابڕێتەوە نـــاومان!

ئەگەر مافمان نەســـــەلمێنن
مانــای ئێوەش تینوی خوێنن

هەرکەسیش زاڵم وخوێنخۆر بێ
هەتا ئەوپـــــەڕ دیکتاتۆر بێ!

دووره پیلانی ســـــەربگرێ
باپەند لە (سەددام) وەربگرێ!

.......

کـەرکووك! تۆ خۆری گیراوی
هـــەورێکی ڕەش دەوری داوی

بەڵام بە ئیزنی خوای گـــەورە
دەڕەوێتەوە ئەم هـــــەورە

ئەم هەورە چڵکن و ڕەشـــــە
سەرەنجام ڕیسوایی بەشـــــە

ئێمەو تۆو نیشتیمان، گشتمان
بـــە هـــەموو هێز و بڕشتمان

دژی ئەم هـــەورە وەستاوین
دەستـــــەمۆی نابین تاماوین

.......

زۆرداریی و داپڵۆسین و گـــەڕ
دۆڕاون، دەشکێ هێزی شـــەڕ

کام دیکتاتۆری زەبـــەلاح!!
کامە حـەزیاو حوت و تیمساح!؟

نەبوونە پەندی زەمـانـــــە!
دەبا پەند وەرگرن ئەمانـــە!!

یەکڕیزیی و حیکمەت و سووربوون
هەمیشە مەشخـەڵی نوور بوون

پابـــــەندیی ڕەسەنایــــەتی
ڕازی ژیانـــە و مەردایـــەتی

تا زیاتر پێیان پـــــەیوەستین
چاکتر بناوان هەڵدەبـــەستین

نابێ دەستمان لێ یان شل بێ
تیغی ورە و بـــاوەڕ کول بێ!

وریـــایی و یەکدەنگیی خۆمان
بـــاشـترین گرەنتییـە بـۆمان

ساویلکەیی و چـــاو لەدەستیی
شــەرمـــەزارییە و شکستیی

کـــام ئیمپریالیزم و زلهێز!؟
بۆ کورد، کوردی گرتە ئـامێز!

ئـــەوان بـــەرژەوەندی خوازن
کەی ئەوانــە دەستی نازن!؟

خوێن لـــە مێژوویان دەچۆڕێ
کەی ئەمڕۆ خویان دەگۆڕێ!؟

تەبـــایی و ڕێکی نێو ماڵمان
شیفایـــــــە بۆ ژینی تاڵمان

قـــــڕی و پـــــڕی وەلانێیین
دادگەریی و یاســــــا ڕانێیین

پێـــوەری حیزبیـی تورڕدەین
ئەوســا دەبینین چۆن هەین!

کەرکووک، حەمرین ڕادەسپێرێ
هەزار ئافـــــــەرین دەنێرێ

قەندیل و سەفین و هــــەڵگورد
سروود دەڵێن بۆ بــەرزی کورد

سورێن، لەگەڵ پیرەمــەگروون
دەڵێن ئیدی خەم بەسەرچوون

هــــەولێر و سلێمانی و دهۆک
وەك شێر تاسەر دێنەسەرچۆك

قامیشلو، دەڵێ لـــــــەوێوە
سڵاو لە هیممـــــــەتی ئێوە

ئامـــــەد، دەڵێ بە مەهاباد
چاومان ڕوون و دەروونمان شاد!

شـــــەهیدانیش تێکڕا دەڵێن
بژی ئەهلی وەفـــا و بەڵێن!

# ئەوانە کێن؟!

٢٠٠٩/٥/١

فەرمان و فەرموودەی خوایـــــە
مەرگ، دەڕۆستی وان نایـــــە
دڵیان کانیاوی تەقوایـــــــە
لیقای خودایان هیوایـــــــە
ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!
گزنگی بــــەری بــەیـــانن

****

زیندوون، لە ژیـــان هەڵناوێرێن
هەرگیز بە مردوو نـــــازمێرێن
ئەمڕۆن، نەڵێن دوێنێ و(پێرێ)ن
مەرگی شـــەڕن، گیانی خێرێن
ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!
هەردەم دەستـــــەملانی ژیانن

****

مـــەردی ئـــازا و بە جەوهەرن
شـــەفـــاعەتکاری مـــەحشەرن
مرواری و دووڕوو گــــــەوهەرن
نێرگزن، میسك و عـــــەنبەرن
ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!
هـــەڵبژاردەی خوای میهرەبانن

****

سەرومالّ و گیان، خوێن و لـەش

هەموویان بەخوا کرد، پێشکەش

بۆیە ئـــاسۆیان ڕوونـــە و گەش

بوونـــــە خاوەن باشترین بەش

ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!

شاسوار و مـــــــەردی مەیدانن

****

مایـــەی شانازیی و سەروەریین

شایانن بـەکۆی ئـــــــافەرین

لــــە ڕژدی و ترس، بێ بــــەرین

یـــــــار و هاوڕێی پێغەمبەرین

ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!

لـــــــە دیـوانــی خـوا میـوانن

****

ڕووسوور و لاشـــــــە خوێنینن

جێی خۆ، لە بەهــەشت دەبینن

لوتکـــــــەی ورە و نەبەزینن

مایـــــــەی هێز و وزە و تینن

ئەوانـــــــە کێن؟ شەهیدانن!

مــەشخــەڵی ڕێی تێکۆشـــــانن

****

گوڵاڵـــــه سوورەی بــەندەنن
درێشـــــەی مشتی ئەهریمەنن
لە ئـاست دوژمن دا (ئەڵوەن)[1]ن
شمشێر و تیغی ڕەســــــەنن
ئەوانـــــــه کێن؟ شەهیدانن!
چقڵی چـــــــــاوی ناحەزانن

****

هێمای ڕزگاریی میللـــــــەتن
دژی زۆرداریی و زیللـــــــەتن
یەکپارچە هیوا و هیممـــــەتن
سەراپا سەنگ و قیمـــــەتن
ئەوانـــــــه کێن؟ شەهیدانن!
خاکــــــــەلێوەی نیشتمانن

****

هێزی دڵن، سۆمـــــــای چاوان
ژیاون لە ڕێی خوا و چــەوساوان
ناویان کەوتۆتـــــــه نێو ناوان
چۆنێکی وەسفیان کەی، ئاوان!
ئەوانـــــــه کێن؟ شەهیدانن!
مایـــــــەی شانازیی هەموانن

---

[1] چیایەکە لە خۆرهەڵاتی کوردستان.

****

خوایـــه ! پڕ ڕێبوار بێ، ڕێیان
فیردەوسی ئـــەعلا بێ، جێیان
کێش وەفادار نـــــەبێ، پێیان
هەقـــــــه بخرێته ژێر پێیان
چونکـــــــه ئەوان شەهیدانن
بۆ هــــــەموو ڕێزێك شـــایـانن

# سڵاوی تێکۆشان

٢٠٠٩

سڵاوت لێ بێ، فــــەلـەستین!
خاکی خەبـــات و خوێن و شین

خاکی جوامێریی و نەبــــەردی
دونیا شاهێدە کە مـــــەردی

سڵاو لە (ئەقسا) و لـە (قودس)
لە (غەززە)ی ئـــازا و نەترس

غەززەی مـــەزڵووم و خوێناوی!
(جو) شـــــاڵاوی بۆ هێناوی

نە جارێك، نە دوو، نە دەیـان!
بەتۆپ و تانك و فڕۆکەیـــــان

بەڵام تۆ، بێ فڕۆکـە و زرێپۆش
تێکت هاڕین (باڕاك)[١] و (بۆش)[٢]

---

[١] ئیهود باڕاك، لە دایکبووی ١٩٤٢ یەو ماوەی (٣٥) ساڵ لـە سـوپای ڕژێمـی زایـۆنیی دا بوو و پاشان بوو بە دەیەمین سەرۆك وەزیرانی ڕژێمی جولەکە لە ١٩٩٩–٢٠٠١.

[٢] جۆرج بۆشی کوڕ، لەدایکبووی ١٩٤٦ەو چـل و سـێهەمین سـەرۆکی ئـەمریکا بـوو و لـە ٢٠٠١/١/٢٠ –٢٠٠٩/١/٢ لەسەر کاربوو.

ئاوایـــــــــــه باوەڕی بەهێز!
بڕواننه مـــەیدان و پـــــەرێز!

گـــــەلێك هێنده خـۆڕاگر بێ!
گەمـــەی بە بۆمبا و ئـــاگر بێ

ئـــافرەت و پیاوی، گـەنج و پیر
بۆ فڕۆکـــــه و تانك ببنه نێچیر

منداڵ، بەخۆیی و بێشکــــــەوە
بەدەستی جووی بێ مێشکەوە

ببن بـــەڕەژوو و پرپۆڵـــــــــــه
ئەویش هەر ڕشت بێ بۆ تۆڵـە!

هەر (حَسْبُنَا اللّهُ)[1]ی شیعار بێ!
هەر (إِنّا لِلّه)[2]ی هـــــاوار بێ!

---

شایانی باسه مەبەست له ناوهێنانی ئەم دوانه، پیلان و شەڕانگێزیی بەردەوامی هـەردوو وڵاتـی ئـەمریکا و ئیسرائیله، لـه مێـژووی دروسـتکرانی ڕژێمـی زایۆنیـەوەو لـه دەورانـی سەرۆکه یەك لەدوای یەکەکانی هەردوولادا، بەدژی گەل و خاکی فەلەسـتینی خوێنـاویی و داگیرکراو.

١ ئاماژەیه به ئایەتی (...وَقَالُوا حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) ال عمران –١٧٣
٢ ئاماژەیه به ئایەتی (....قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ) البقره –١٥٦

قەت میللەتی وا، نابـــــــەزێ
با شەق با، هەموو ناحـــــەزێ!

خوێنی ئەم جگەرگۆشـــانـــە
ورە و وزەی تێکۆشـــانــــــە

ئەم قەتڵ و عام و ئیبـــــــادە
مەرگی زایۆنی و (موســــاد)ە

شــــــەڕی ئەم شەڕانگێزانــە
بۆ خۆیـــــان گەلارێزانـــــە

هەرچەند ئاگری شەڕ خۆشکەن
دەبێ هەر خەشمی خوا نۆشکەن

خوا خامۆشی دەکاتـــــــەوە[1]
خۆی وەلامیان دەداتـــــەوە!

[1] ئامارەیە بە ئایەتی (كُلَّمَا أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ ...) المائدة – ٦٤.

# نیگاری نوور

۲۰۰۹/۳/۱۵ رانیه

لـــه ئاسمان و لـــه زەویــــــەوە
لە دەریـــــاو بەرز و نەویـــــەوە

بـــاکوور، بــــــاشوور، نزیك و دوور
دروودی بێ ژمـــــــــارە و سنوور

لە ڕۆژئاواش تا رۆژهــــــــــەڵات
لە تۆ، ئەی خاتەم و خـــــەڵات!!

.......

لـــە ئـــــال و بــــەیت و یـــارانت
لە شوێن کــــــەوتوو و ڕێبوارانت

لە دیدار و سیما و سایـــــــــەت
لە پەیڤ و پەیـــام و پایــــــەت

وەك بارانی شـــەست لەســــەر بێ
نـــــەبڕێتەوە و هـــەربێ و هـــەربێ

لێره، له کوردســـــــــــتانه‌وه
له‌م خاکـــه پاك و جوانـــــــه‌وه

مـوبـــــاره‌ك و بـــــه پیت و پێز
لانــــــه‌ی ڕه‌سه‌نایــــه‌تی و ڕێز

مه‌ڵبــــــــــه‌ندی زانـــا و ئه‌دیبان
جێی خانـــــــــه‌دان و نــه‌جیبان

خـــاکـی خه‌م و خوێن و خه‌بـــات
خـــاکـی سـه‌روه‌ریی و کاره‌ســـات

مـــــــه‌کـۆی شۆڕش و جـوامێریی
نیشتیـمانیی تـــــاڵـیی و سـوێریی

بـــه‌ســــــــه‌ر چڵـی نێرگـزه‌وه
بـه‌وپـــــــــه‌ڕی ویست و وزه‌وه

بـه‌ڕه‌نگی (خاکــــــــه‌لێوه)وه
بـه‌نـــــــــاوی خـۆم و ئێوه‌وه

پێشـــــــــەوای ڕێی ڕزگارییمان!
درووود دەکـــەینــــــە دیارییمان

.......

پـــەیمانیش نویٚ دەکـــەینــــەوە
دڵ لـــە تۆ جویٚ نـــەکـەینـــەوە

هـــەتـــــاکـو گیانمان دەبـــەرە
تا دڵ دڵـــە و تا (ســـەر) ســـەرە

بـــە شـوێـن تـۆدا بـــەڕێـوەین
خـــاراوی شـــەختـــە و کـرپێـوەین

.......

ئـــــەی زەمزەمی خێر و خۆشیی!
تـۆ شـــــەمـاڵـــی دڵ و هـۆشیی

جریوەی ئەستێرە و تریفەی مـانگ!
خـــاوەنی بـــەسۆزترین بـانگ

بـزەی خـونچــــــە و چرۆ و کانیی
شیلـــەی ڕەوشت و خوو و جوانیی!

دەریـــــای سۆز و میهر و مانـــا
شـــاری زانست، زانـــا و دانـــا!

سیمای سپێدە و سامـاڵ و تـاو
ڕەنگی قەڵبـەزە و خوڕەی ئـاو!

بـاران و کـەشی دوای بـاران
بۆنی خـاک، هـەوای نساران!

هـاودەم و هـاوڕێی بێ نـازان
هـاوپـەیمانی ئـاشتیخوازان!

درێشـەی مشتی ستـەمکاران
هیوای چـەوسـاوە و هەژاران!

خـاڵ و پیتی نێو یـەک دێڕین
بـە شوێنتـەوە شۆڕشگێڕین

.......

بڕوانن لـە بـەهـای بـاڵای!
لـە ڕێگا و پەیـام و ئـاڵای!

خەڵاتـە و بە خەڵاتـەوە
دنیا ڕۆشـن دەکاتـەوە!

.......

یارانی چەند بەرز و گەورەن!
خۆرە و ئەستێرەی لە دەورەن!

لە هەر کامێکیان دەنۆڕی
شەوقی جیهانێك دەگۆڕی

لە هەر بوار و بارێکەوە
سەد میوەن بە دارێکەوە

دنیا بەوان چراخانە
تیاح لەم گوڵزار و باخانە!!
.......
پرشنگی ئاسمان و زەمین!
(ئەمین)ی (بەلەدول ئەمین)!

(مەککە) و (مەدینە) و(حیڕا)ی تۆ
بە(نیگا) بوونە نیگای تۆ

(کەعبەتوڵلا) و (بەردە ڕەشە)
چاویان وەك چاوی خۆر گەشە

زەڕڕەیەك خاکی (عەرەفە)
دنیایەك دوڕڕ و صەدەفە

(صەفا) و (مـەڕوە) و کێوی (ئوحود)
یـەك پـارچـە بوونـەتـــە درووود

(ئەقصا) و گەشتی (ئیسرا)و (میعراج)
پایــــــە و شـــەڕەفن، شکۆ و تاج

(هیجرەت)، (خەندەق)، (فەتحی موبین)
پڕاوپڕن لـــە وانــــــــــەی ژین

(مزگـەوت)و (دەولـــەت)و (دەستوور)
بۆ پێکـــەوەژیان، بوونـــــە نوور

(بـەدر) و (حودەیبییە) و (تـــەبووك)
(نامــــە) بـۆ ئـومــــــەڕا و ملوك

دواجار (حـــــەجی ماڵئاوایــــــی)
بوونـــــە چـرای ڕێنوومـایــــــی

نێـوانــی (مینبــــــەر) و (گـۆڕ)ت
وەکـو کـۆبـوونـــــــــەوە و کـۆڕت

بـــاغی بــــەهـــەشتـــە، نوورینـە
شیفایـــــــــــە بـۆ دڵ و سینـە

لە هەر نیگارێ ڕامێنین
دوندە و ئێمەش لە دامێنین

یەك لە یەكتری باڵاتر
یەك لە یەكتری واڵاتر

نوورستانێكە مەپرسە
وەسفی زۆر ئەستەم و قورسە !

.......

خوایە بەردەوام لەم نوورە !
لەم گیان و ژیان و كافوورە

بڕژێتە نێو دڵمانەوە
نێو خاك و چیا و گڵمانەوە

ماڵ بە ماڵ، سینە بە سینە
پڕ بێ، لە نووری (مەدینە)

.......

هەركەسێ دوورە لەم نوورە !
هەموو ژیانی ژێرەوژوورە

هـــەركـــەس لـەم نووره ياخی بێ!
دەبـێ هـــــەر ئـــاخ و داخـی بێ

کـێ لــەوانـــــەی پشتی تێکرد!؟
بردیـــــــەوە! نـەخێر دۆڕا و مـرد!!

ئۆخـــــەی، سوپاس بۆ خوای گەورە
ئێمـــە لــــەم زەمـــــان و دەورە

لــــە دەوری نوور کۆڕ دەبــــەستین
بـــە نووری خـــواوە پـــەیوەستین

شــــــادە بــە پێغەمبــــەر دێنین
هاوڕێیین و ســـــاتێك لێی جوێ نین

بـــەوپـــــەڕی بـــــاوەڕ و ئەوین
ڕێبـــواری ڕێبـــازی ئــــــــــەوین

ســـــــەد جـــار بمرین و بژینـەوە
هـــــەر بـــانگی ئـــەو دەڵێینـەوە

بـــە گیان و هۆش و هـــەستـەوە
ئـــــــالآی ئـەومان بـە دەستـەوە

پشت بــه خــوای گەورە و میهرەبان
بۆ ئیسلام، بۆ کورد، کوردســـــتان

بۆ ئـــــــازادیی و دادپــــەروەریی
بۆ ســــــەرفرازیی و ســــــەروەریی

پــــەیمانــی دەگــەڵ دەبــەستین
پێشمـــــەرگەی گیان لەسەر دەستین

وجوودمـــانـــی بــە دواوەیـــــــە
سەرکــــەوتنیش لــــە خواوەیـــە

# نووری دیدەم

٢٠١١/٢/١٥

سڵاوی خوات لەســـەر بێ، نووری دیدەم!
بە شوێنتەوە هەڵوەدام و گـــــــەڕیدەم

سڵاوی خوات لەســـەر، سـەرمەشقی ڕێمان
بـــــە تۆوە ئاوەدانـــــە شــــار و دێمان

لە دەشت و چیا، فەزا و دەریا، شار و دێ
هـــــەر شـــەماڵی ئـــــەوینی تۆم بۆلا دێ

لە هــــــــەر شوێنێکی ئـــــەم دنیا بەرینە
بەرامــــەی تۆیــــــە دێ و دەڕژێتە سینە

لە هــــــــەر جێیەك گوڵێکم دێتە بـــــەرچاو
جـــــەمـاڵـی تۆ دەدا وەك پڕشـنـگـی تـــاو

هـــەر تاڤگەیــەك لــە هەر شوێنێك دەبینم
لە ڕەنگی تۆ دەچێ، ئـــــەی خۆری ژینم!

لای هـــــەر بێناز و بێ باوك و هـــەژارێك
دەست و پـــەنجـەت دەبینم وەك چنارێك

بۆ هەرکەس مەزڵوم و مات و کەســاســـە
تاڤگەی هیوا و ئومێدی و سۆز و تــاســـە

لە ڕووی زاڵم و داگیرکـــــەر و خوێنخۆران
دەبینم گـــــەردەلولـــی و بـــاو و بـۆران

لە هـــەر کـار و گوفتار و بوار و بـــاریٚ
دادپەروەریت بـــە لێزمـــــە لێدەبـــاریٚ

سینەت پڕی پـــــەرۆش و سۆز و هەستە
ئـــاسـوودەیی مرۆڤایەتیت مــەبـــەستە

بۆیـــە دڵ و چـــاومانی و تــاجی سەرمان
تەنها ڕێی تۆش دەگرینەبـەر، سەروەرمان!

# پەیامی جەژنی ئێمە

پەیـــامی جەژنی ئێمەیە، گەردن ئازادیی و زمانی گوڵ
جەژن، بارانی ڕەحمەتــە و دەڕژێتــە نێو دەروون و دڵ

پەیامی جەژنی ئێمەیە، خۆشەویستیی و سۆز و پەرۆش
بەسەرکردنــەوەی هەژاران، خزم و لێ قەوماو و نەخۆش

پەیــامی جەژنی ئێمەیە، ئاشتیی و لێبووردەیی و چاکە
جـەژن، شەونمی بـەیــان و وەرزی خەملینەوەی خاکە

پەیـــامی جەژنی ئێمەیە، بەختەوەریی و شکۆ و شادیی
جەژن، ڕۆژی سەرکــەوتنــە و پرشنگی خۆری ئازادیی

# گەل

/٣/١٠
٢٠١١

گـــــەل سەرچـــاوەی دەسەڵاتە
هەر گـــەل ســـــەرداری وڵاتە
دەنگی گـــەل، دەنگی زوڵاڵــــە
خامۆشکردنی مــــەحـــاڵــــە
دەنگی یەکەمـــە، دەنگی گەل
سەنگی یەکەمـــە، سەنگی گـەل
هــەر دەنگ و ڕەنگ و سەنگی تر
بێ گــەل، یەکسانــــە بە سفر

.......

گـەل گـەلە و گاڵتەی پێ ناکرێ
کەس بەرگەی زەبری گەل ناگرێ
حیزب و ســـەرۆك، فلان و فیسار
یەکن، دەن، ســـــەدان و هـەزار
نـــەفورات بن، هـــار و خوێنڕێژ
گــــەل و وڵات بخەنــــــە گێژ
بـــە شێران، هـــــەوران دابێنن

بکـوژن، ببڕن، بســـووتێنن!!

که گــەل متمانـــەی پێ نەمان

دەبنـە پـــەندی دەور و زەمـــان

......

ئەوەی گـــەل لەخۆی توڕە کات

دەبێتە مـــەهزەلـــەی وڵات

نـــاڕەزایی و تـوڕەیی گـــەل

زۆر دەســـەڵاتی خستە تـــەل

هەرکـــەسێکی دژی گـەل بێت

مسۆگەر تووشی (ئیرحـەل)[1] دێت!

دەکـــەوێتـە بـــەر خەشمی خوا

تێدەشـکێ و تێدەچێ و دەڕوا

لـەبن پێی دەردێنن بـــەڕێ

تەخت و بـــەختی وەردەگەڕێ

.......

[1] (ئیرحەل) ئەو درووشمە بوو کە گەلانی چەوساوە و ڕاپەڕیوی چەند وڵاتێکی عـەرەبی وەکو: تـونس و میـصر و لیبیـا لـە سـاڵی ۲۰۱۱ دژ بـە ڕژێـم و دەسـەڵاتە دیکتـاتۆر و خۆسـەپێنەکانیان لـە شـۆڕش و ڕاپەڕینەکانیانـدا دەیانگوتـەوە و ڕاپەڕینەکانیـشیان بـە (بەهاری عـەرەبی) نـاوزەد کـران و سـەرەنجام چـەند دیکتـاتۆر و ڕژێمێکـی دیکتـاتۆریی بەدوای یەکدا هەرەسیان هێنا و وەرچەرخانێکی گەورە بەسەر جیهان و ناوچەکەدا هات.

گەل گەلـــە و هێزی هێزە، هێز!
فەرموون، ئـــەوە مێژوو و پەرێز
دوور و نزیك، نموونـــــەی زۆر
گەل لە کوێ و لەکوێش دیکتاتۆر! ؟

# راسانی گەل

٢٠١١/٣/١١

گـــەلی مـــــەزڵومی کوردی مەرد
دوای ســــەدان کارەسـات و دەرد
لافاوێك لـە ئـارەقــــــە و خوێن
وێرانبوونــی زۆر نـاوچــە و شوێن
ئــەنفال و کیمیایــی بـــــاران
شــــــەهیدبوونی بە هــــەزاران
ئـــــافرەت و پیاو، درشت و ورد
راپـــــــەرینێکی بــەرپــاکرد!
لـــــەوێوە ئــــــازادیی و کیانێك
بوون بــــە هـــــــەواری وچانێك
بـــــەڵام بــــــە حیزبگــــەرایی
تـــــــەزویر، شــــەڕ و ناتەبایی
دوو ئیدارەیی و مـــەحسوبیـــەت
شــــەپ و گوپ و ناشـــەفـافیەت
پێشێـلکـردنــی مـــافـــی مرۆڤ
بێکاریــی و کـوێرەوەریــی و ئۆف
قڕی و پـڕی و یـاســـــــاشکێنی
بـێ مــــەسکەنیی و خۆســەپێنی

بوونـــــەکوللـــە و سن و ئافـــات!
لوشدانی سەروەت و داهـــــــات
بۆ گـــەل، لە خەروارێك مشتێك!!
حیزباندنی هـــەر هـــەموو شتێك
پاوانخوازیی و کوێخایـــــــەتیی
ژێرپێنانی کوردایــــــــــەتیی
هەڵپـــەی کورسی و ڕکابــــەری
گەندەڵی و نادادپـــــــەروەری!!
وڵاتیان کردە جـــەهـــــــەننەم
گەلیان خستە خمخانـــە و خـــەم
شیرازەی وڵاتـیـــان تێـکـــــدا
هـــەموو شتێکیان ڕێکدا و لێکدا !!
ئیتر بێزاریـی بـــــەرپـــا بوو
پەست بوو، هەرچی هۆشی لا بوو
هـــەرکەســــە و لـــەبـــەرێ خۆوە
هـــــــاواری لێ بـــــــەرز بۆوە
دڵســـــــۆزان و مشـــوورخـۆران
لە هـــەموو شوێن، هـــەموو جۆران
لــــە پێـنـاو بـــەرژەوەندی کورد
پرۆژە و یاداشتیان پێشکەش کرد
زمـــان و قـــەڵـــەمیان خستـــەکار
هـــــــــەزاران نووسین و وتـــار
جار لـــە دوای جار و بێ وەســتان

خستیانــه پێش کاربەدەســـتان
دەســـــەڵاتیان ڕادەچڵـــەکـاند
کـەچی هــــەر خۆیان نەجوڵاند!
هێندە خەمسارد و بێ خــەم بوون
دەتگوت، لە گوێی گادا خەوتوون!
حـەیف، ئەوان هیچیان نـەبیست!
ویستی جـەمـاوەریان نــــەویست
خـۆیـــــان بــــە لاڕێدا دەبرد
دەستیان بـــە چاکسازیی نەکرد
نـەك هێندە، زۆر بـێ باکانـــــە!
دوور لــە ئـــاکاری کوردانـــــــە
تۆمــــــەت و چەواشــــــەکاریی
لـە زمـــان و زاریــــان دابـــاریی
ئــــەوەی ڕووی ڕەخنەی تێکردن
بە(دەست) بـەخراپ، ناویان بردن!
هـــەر بۆیـــە خەڵکی کوردســتان
چـەقۆی گەیشتە ســـەر ئێسقان
ســـەبر و تەحـــەمولی نـەمــا
نـە متمانـــەی ما، نــــە تـەمــا
یـــەك ڕێی لەبـــەردەم مایـەوە
چارەســــەر بوو، بەلایـــــەوە
دەنگ هـــەڵبڕێ لــە شــەقامدا
خۆپیشـــاندانـێ ئــەنجامدا

حەڤدەی شوبات[1]، پێش ئەو، دواتر
توورەیـــی گـــەل بوو بـــە ئـــاگر
خــــەڵك و جـــەمـــاوەری بێحاڵ
بـــــــە دەنـگـــی دلێر و زوڵاڵ
وتیان: ئـــەی دەســــــەڵات ئیتر
مـــۆڵـــــــەتت نـــادەینـــیّ چیـتر
ئیدی تێبگـــــە، بە قـــەولی کورد
ئاوای ناخۆی، ئەو بابەت مرد!!!
بوغرایـــی و شولّ لێهــــەڵکێشـان
بۆت ناچێتەســـەر، وەك پێشـــان
گەندەڵی و بیّ دادیی، تاکـەی!؟؟

---

[1] پێـــشنیوەڕۆی رۆژی پێـــنج شـــەممە ٢٠١١/٢/١٧ لەبـــەردەرکی ســـەرای ســـلێمانی، خۆپیشاندانێك دەستی پێکرد، دوانیوەڕۆ توندوتیژی و تەقە و هێرشکردنە سەر بارەگـای حیزبـی و جۆرێـك لـە بەلاڕێـدابردنی لێکەوتـەوە، مـەخابن شـەهید و برینـدار هـەبوون و دەسەڵات بیّ ڕەحمانە لولـەی چـەکی ئاراسـتەی سـینگی جـەماوەر و لاوانـی وڵات کـرد، لەمەوە خۆپیشاندانەکان - کە پەنگخواردووی باری نالەبار و قەیرانـە قووڵـەکان و شـەڕی داهات و دەسەڵاتی ساڵانی ڕابردوو و ئێستا بوون - بەجۆش و خرۆش و بەربڵاوتر بـوون و زووربـەی شاروشارۆچـکانی گرتـەوە، سـەرای سـلێمانی کرایـە مەیـدانی ئـازادی و ئـیتر مەیدانەکانی ئازادی لە شاروشارۆچکەکان، بوونە مـەکۆی دەربـڕینی تـوڕەیی و نـاڕەزایی توونـدی جـەماوەریی و ئەنجامـدانی نوێـژی هـەینی و وتـار و دروشـمی ئـاگرین، دژ بـە گەندەڵی و گەندەڵکاران و حیزبگـەرایی و پـاوانخوازیی و چەوسـاندنەوەی میللـەت و ئـەو قڕی و پڕی و نادادپەروەریی و حوکمڕانییە شلۆقەی لەسایەی دەسەڵاتی چـەند حیـزب و بنەماڵە و کەسێکەوە، لە دوای ڕاپەڕینەوە دەستی لە قورگی گەل ناوە.

بۆ سڵ لە خوا و خەڵك ناكەی!؟
داخوازیی ڕەوای جەماوەر
بە كردەوە بخە سەر سەر
واز لە قسە و بەڵێنان بێنە
كار و كردەوە ڕانوێنە
باوی قسە و بەڵێن بەسەر چوو
تازە تیر لە كەوان دەرچوو!!!
گەندەڵ، قاتڵ، تاوانباران
لە هەر شوێن و پایە و كاران
ڕاپێچیان كە، بۆ مەحكەمە
تازە پاشەكشە ئەستەمە
چاكسازیی و گۆڕانكاریی نوێ
بە زمانی كردەوە بدوێ!!
گوێ لە جەماوەر ڕادێرە
پاك و پیس، لێك هەڵاوێرە
تەسلیمی سەردەمی نوێ بە
میللەت لە كوێ بوو، لەوێ بە
شار و دێ و هاونیشتیمانیان
داوا و خواست و ژیان و گیانیان
لە خزمەت هەموانیان دابە
بیسەلمێنە حوكمەت بابە!!!
بۆ چارەسەری ڕیشەیی
نیشتیمانیی بەو پیشەیی

خاکیی بــــەو خادیم و خـــەمخۆر

نـــــــەك مشـــەخۆر و دیکتاتۆر

ئیدی، ڕووی چەك لەگەل مەکــە!

خیانەتـــــە و جەریمـــە و لەکــە

ئـــــــەوەی خوێنی گـــەل بڕێژی

گلۆڵــــــەی کەوتۆتـــــــە لێژی

توند و تیژی لـــە هـــــەر لابـــێ

مەحکومـــــە و حەرامـــە و نابـێ!

ئـــەوە گەلـــە و هـــاوار دەکات

دەڵێ: لەمــــــەولا، دەســــــەڵات!

حیزب و دەزگا و بنەماڵــە و خێڵ

نەتکەنـــە بیشە و ئـــــــاوی لێڵ

ئیرادەت نـەکـــــەن ورد و خــاش

نەتکەنـــــــە دێوجامە و مەقاش!

حیزب چـــەنگ لە قورگت نـــەنێ

کاســـەلێس دەورت نـــەتـــەنێ!!

خزمەتکاری میللەت بــــەو بەس

نەبیە کۆیلـــــــەی میزاجی کەس

وا نەبی و وا هـــــەنگاو نەنێی !!

مسۆگـــــــــــەرە ڕادەقـــەنێی!

بۆیـــە، گوێ بۆ میللـــەت شل کە

مـــــەدالیای میللـــەت لـــە مل کە

تـــەسلیمی ســـــەردەمی نوێ بــە

میللـەت لــــە کویێ بوو، لەویێ بە !
داوای جـەمـــاوەر ئـــەمانـــەن
ئەم پرس و خواست و خـــەمانـەن
داوای گشتیی و هــــــەق و ڕەوان
چۆن پشتگیری ناکەم لەوان! ! ! ؟
تازە گـــەل بێدار بۆتـــــــــەوە
بـــەگـــژ ستەمـدا چـــۆتـــــــەوە
لە گـــــەندەڵی هـــاتۆتـــــە دەنگ
شڵەقاندویـــــەتی گۆمی مــــــەنگ
دیـواری بێـدەنگیی شـــکــــاندوە
دێوەزمـــــەی ترسی بـــــەزاندوە
بەویستی خوای پــــــــەروەردگار
میللـــــــەتێکی ئـــــــاوا هۆشیار
پـــاشـــــــــەڕۆژی ڕۆشـن دەبـێ
هـــــــەر هاوڕێی سەرکـــەوتن دەبێ

# سەلامی خوا لە (شێخی سەرگەتی)[1] بێ

٢٠١١/٩/١٥

بۆ کۆچی زانـــایـــــەکی سینە بـەفرین
قەڵــــەم نووسی، بە چاوی پڕ لە ئـەسرین

دیسان زانـــایـەکی تێکۆشــــەری کورد
سەربەرزانــــــە ماڵئاوایی لەگـــەل کرد

[1] شێخ صدیق ئیسماعیل ناسراو بە(مامۆستا شێخ صددیقی سـەرگەتی) سـاڵی ١٩٢٧ لـە گوندی (سەرگەتی)ی ناوچەی هەورامان لەدایکبووە، لە پێناو خوێنـدن و وەدەسـتهێنانی زانستەکاندا چەندان شوێنی کوردستان گەڕاوە، کەسێکی خەمخۆر و بـوێر بـوو لـە پێنـاو ئـایین و گـەل و نیـشتیمانەکەیدا، بۆیــە دوای راپەڕینەکـەی ١٣/ ٥/ ١٩٨٧ی هەڵەبجـە، بەمەبەستی جیهاد و خەباتی چەکداریی بەدژی رژێمی بـەعس، هیجـرەت دەکـات و لـەناو ریزەکانی کاروانی رابـوونی ئیسلامیی کوردسـتاندا چـەندان پۆسـت و بەرپرسـیاریی پـێ دەسپێردرێن، کاک (بابەشێخ)ی کوڕەگەورەی لەو کاروانەدا لـە شـەوی ١٩٨٧/١١/١٩/١٨ لە سنووری خورماڵ شەهید دەبێت، مامۆستا جگە لەوەی کەسایەتیەکی شۆڕشگێڕ بـوو، کەسـایەتیەکی عیلمـی و فـەقیهیش بـوو، پێگەیـەکی بـەرزی لـە نێـو خـەڵك و هـاوڕێ و هاوســەنگەرانیدا هــەبوو، لـەدوای ٢٠٠١ ەوە ئەنـدامی ئەنجومــەنی شــورا و بەرپرســی دەسـتەی دادوەری کۆمـەڵی ئیـسلامیی کوردسـتان بـوو، سـەرەنجام سـەرلەبەیانی رۆژی دووشەممە ٢٠١١/٩/١٢ بەهۆی نەخۆشیەوە لە شاری سلێمانی کۆچی دوایـی کـرد، دواتـر بەرێز و شکۆوە و لە مەراسیمێکی جەماوەریی دا لە گوندی (سەرگەت)ی زێدی خـۆی بـە خاك سپێردرا.

ئەم زانایـــەش  کە دەخــەم میللەتـــی بوو
( مامۆستا شێخ صدیقی سەرگەتـــی) بوو

سەلامی خوا لە (شێخی سەرگـــــەتی) بێ
سەلامی خوا لە هەوڵ و هیممـــــــەتی بێ!

خەرمانێك بوو، لــە زانست و لـــە ئیخلاص
دەریایــــــەك بوو، پڕاوپڕ دوڕڕ و ئـەڵماس

خەڵك دۆست و خاکیی بوو، شەهید پەروەر
وره بــــەرز و تێکۆشـــــەر بوو، کۆڵنەدەر

ســـــەرکردە و پێشمەرگـــە و صددیق و زانا
ســـــەر و ماڵی لە ڕێی خوای گـــەورە دانا

# هەقخوازیی

تا سەرکـــەوتوو و ســەرفراز بن
ڕۆڵــەی بە وەفــا و هەقخواز بن!

قەت ڕوو لە هـــەق وەرمـــەگێڕن
لەگـــەڵ هــەق گەوهــەر و زێڕن!

هەق لەهەر کوێ و لای هـەرکێ بێ
ئەوێ و جێ و ئەوتان هـــاوڕێ بێ

ڕق لە هـــەق دانــەگرن هــەرگیز
لەگـــەڵ هــەقخوازان ریزبن، ریز!

هەر ڕۆژگارێکـــە و هەر ســەردەم
دەنگ و ڕەنگی هەق بن هــەردەم

نەفس و دنیا، شـــەیتان، شۆفار
نەتانخەنە ســەر ڕێچکـــەی خوار

هەقتان لێ نەکـەن بــە ناهـــەق
بڕواتان بــە هــەق نـــەبێ لـــەق

هەر هـــەق ئاسۆی گـــەش و روونە
ناهەق ســــــەرشۆڕ و زەبوونـــــــە

سەرەنجام هـــــەق سەردەکـــەوێ
هـــــەق ســــــەبر و ئارامیی دەوێ

هەرکـــــەس رێی هەق بگرێتەبـــەر!
سەربـــــەرزە لە دنیا و مـەحشـــــەر

# پشکوتنی (ئامەد)[1]

٢٠١٣/١٢/٢٤

که (ئامەد) هاته ڕووی دنیا، خەمێکی قوڵ و خەندەم دی
لایـــەك شاڵاوی ئەنفال و لایـــەك مـــەرگی دڕندەم دی

که (ئامـــەد) هاتـــە ناو کۆڕی پـــەرۆش و ناڕەزاییمان
لەگـــەڵ قەندیل و هەڵگورد و سەفین دا، پێکەوە دیمان

وتی: تیرۆری بابـــــەم و پشکوتنی منی (ئامـــــەد)
دەبێته کڵپەی شۆڕشی بیر و قەڵـــــــەم، هەتا ئەبەد

---

[1] بەبۆنەی لەدایکبوونی (ئامەد)ی کوڕی ڕۆژنامەنووسی تیرۆرکراو (کاوە گەرمیانی) نووسراوە، که ١٧ ڕۆژ دوای تیرۆرکرانی باوکی و لە ٢٠١٣/١٢/٢٢ بە بێنازی هاتە دنیاوە. شایانی باسە (کاوە مەحەممەد ئەحمەد- کاوە گەرمیانی) ڕۆژنامەنووسێکی چالاك و سەرنووسەری گۆڤاری (ڕایەڵ) بوو و لە شەوی ٢٠١٣/١٢/٦/٥ لە کەلار، دڕندانە درایە بەر دەستڕێژی گوللە و شەهید کرا، ئەمەش ناڕەزایی فراوانی جەماوەریی و ڕێکخراوە نێوخۆیی و نێودەوڵەتیەکانی لێکەوتەوە و تاوانەکە بەتوندی ڕیسوا و شەرمەزارکرا و کەمپینی ناڕەزایی و دادگایی کردنی تاوانباران ڕاگەیەندرا و چالاکی جۆراوجۆر ئەنجامدران.

# تەمەن

٢٠١٤/٤/١٤ رانیە

تەمـــەن، نەمامێکە دەڕوێ
چرۆ دەکات و دەپشکوێ
گــــەڵا و لق و پۆ دەردەکا
گەورە دەبێ و سێبـەر دەکا

میوەی هیوا دایدەپۆشـــی
دێتە ڕێی خۆشی و ناخۆشی
لە نێوان ڕەشەبـا و شەماڵ
لایـەك شیرینە و لایـەك تاڵ

تەمـــەن، هــەوراز و نشێوە
وەك ڕێبوارێکــە و بـــەڕێوە
لە پڕ، ون دەبێ لە چــاوان
ڕێبوارەکان هـەموو ئاوان!!

تا لەگەڵ تەمـــەن هاوڕێیین
با بـــەزمــانی گوڵ بدوێیین
بەرلـــەوەی لەم ژینە بمرین
ڕێز لەکات و تەمــەن بگرین

# داعش چییە؟

مانگی ٨ی ٢٠١٤ رانیە

داعش چییە، پرۆژەی مەرگــە!؟
دڕکی چـــاو و دڵ و جـەرگـــــە
بـــەڵا و دەرد و چـــــاڵ و گـۆڕە
داو و تـــەڵـــە و تـــەپکــە و تۆڕە
ســـەربـــەگێچـــەڵ، شـــەڕانگێزە
تیر و شـــــــیرە، زەرگ و نێـــزە
فێڵــــــــە و پیـلان، ڕق و کینـــە
ئافـــــــــاتی بەهــــــاری ژینە
باشـــوو و خەرتـــــــەل و داڵاشە
دەسکــــــەلا و پرد و مــــەقـاشە
شــــــــاڵاوی شـــەوی دەیجورە
تا ئەوپـــــــــەڕ لە ئیسلام دوورە
ڕەحمــــــەتی ئیسلام، شـەڕی ئەو!
لێك جیاوازن، وەك ڕۆژ و شـــــەو
تاریکی ئـــــــەو، نووری ئیسلام!
ئـــاشکرایـــــــە لای خـاس و عـــام
(ئیسلام) بــــەو خێر و ڕەحمـــەتە

به پێی ئـــەو، شومی و زەحمەتە
بۆیە قورئـــــان، سیرە و سوننەت
لێی بێ بـــەرین، بە هەقیقـــەت
هـــەوری بـــەری خۆر و مانگە
بـــە ســـــەربڕین بەنــاوبــانگە
کەنگێ ئیســـلام و ئینسانیـــەت!؟
وەك ئەو مرۆڤی سوتاندوون، قەت!
کوللـــەی ئاشتی و ژیـــان و گیانە
فیتنەیـــە و سەراپـــا زیانــــــە
دڕندەیـــــــە و تینوی خوێنـــە
ڕەفتـاری، ویـژدان هـــەژێنــــــە
بێ هـــەست و نـــەست و دڵڕەقە
فـام کـــاڵ و لاڕێ و ناهــــەقە
دژی مـاف و ئـــــازادی یــــە
دەستـی زوڵم و بێـدادی یـــــــە
دژی کـورد و کـوردســـــــــتانە
تـــەونی نەخشـــەی ناحـــەزانە
هێـزێکـی دەست درێژیـکـــــارە
مایـــــەی نەگبـــەتی و ئـازارە
تـرس و تـۆقـــــــاندن و گـڕە
تـــەقینـــــەوە و کوشت و بـڕە
دەستنوێژی خۆی بەخوێن دەشوا!!
خـۆی کـردۆتـــــە وەکیلی خوا !!

بــــەزەیـی نـەهێشتـۆتـــــــەوە
سینگی چاکـــــــەی بێشتۆتـەوە
بـــەهـــــەشتـی گاڵــەداوە گشت
دۆزەخـی خستـۆتـــــە سەرپشت!
گاڵتەجـــــاڕیی ناوەتـــــــــەوە
خـۆی بـــە تـەنیا مـاوەتـــــــەوە
زانـایـانـی ســـــــەرڕاســت و ژێـر
ئیســــــــلامخـوازانــــی ڕۆشنبیر
لە هـــەموو شوێن، بە هەموو ڕەنگ
تێکـڕا لــــە داعش هاتنــە دەنـگ
بـە بـەڵگـــــەی ڕوون و وردەوە
ســەرلـەبـەریـــــان ڕەتکردەوە
بــە ڕاشکـاوی و مــەردانــــەوە
دژی داعش وەســــتانـــــــــەوە

# پێشمەرگەم

مانگی ٨ی ٢٠١٤ رانیە

بەشانازییەوە پێشمـــەرگەم
سەربەرزم بـەم ناو و بـەرگەم
بـۆ ئـایین و گـــــەل و وڵات
گیانی خۆم دەکـەمـە خەڵات

لە داگیرکـــــەری چاوچنۆك
سەنگـەر دەگرم تا دوا تنۆك
ورەم وەکـو قـەندیل بـەرزە
ورەم کێـو دێنێتـە لـــــەرزە

بـەگژ دوژمندا دەچمـــــەوە
دژی ستـــــەم دەوەستمەوە
بۆ ئـازادیی گـەل دەبمە مۆم
دەبەخشم سـەر و ماڵی خۆم

پـــــارێزەری کوردســــتانم
چاومن، گەرمیان و کوێستانم
هــەر گەردێك لەم ئــاو و گڵە
بەشێکــــە لەم جەرگ و دڵــە

شــەهیدان سەرمەشقی ڕێمن
بنکە و سەنگەر لانـە و جێمن
ئــالاّم بـــــەرز و شەکاوەیـە
هێزی گـــەلی بــە دواوەیـــە

# ئەوینی باوەڕ

٢٠١٤/١٢/٢٣

بە تاســـە و ئەوینەوە دێم
بەڕەنگی مەدینـــەوە دێم
بەتیشکی زێڕینـــەوە دێم

چ ئەشقێکـــــە لـــە دڵمایە !
ئەشقی کێ وەك هی من وایە ! ؟

ئەوینێکـــە بێ هـــاوەڵە
لـــەگـــەڵ خوێنمدا تێکەڵە
بۆ سینەم، بـارانەی پەڵە

زێڕ و یاقوت و مـــەڕمـــــەڕە
ئەمـــە ئـــەوینی بـــــاوەڕە !

لە هەموو سات و رۆژگارێ
خێر و خۆشی لێ دەبـارێ
شیفایـــە بۆ هەموو ژوارێ

هەمیشە لە بــــەرزی دەفڕێ
ئـــــاوازی دڵنیایی دەچڕێ

دەروونی گەش کردوومەوە
بێزاریی ڕەش کردوومـــەوە
پەستیی لە بیر بردوومەوە

خوایـــە، هەر دەستەملانی بم!
هــاودەمی جـوانیی و ژوانی بم

# هیوا

٢٠١٤/١٢/٢٣

هیـوا، توانـــا و هێـز و پێـزه
هیـوا، ئـــاسۆی لـه ئـامێـزه

هیـوا، بـڕسـت و وزه‌یــــــه
هیـوا خه‌نده‌یـــه، بزه‌یـــه

هیـوا، هه‌وا و نان و ئـــــاوه
ده‌ست و قاچ و دڵ و چـــاوه

هیـوا، هـــه‌وڵ و تێکۆشـــانـه
هیـوا، وره و کۆڵنـــه‌دانــــه

هیـوا، دۆست و خزم و که‌سـه
دوای خوا، هیوات هه‌بێ به‌سه

بـــه هیـوا، ده‌بوژێینــــه‌وه
بـێ (هیـوا) ده‌کوژێینــــه‌وه

وه‌رن هه‌تـــا لـــه ژیندا بین
هه‌میشـــه هـاوڕێی هیـوا بین

# کورد و کوردستان

۲۰۱٥/۳/۱۲ رانیه

باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا
یەک هەوارن، یەک هاوارن، یەک داوا

قەندیل، سەفین، دالآخان و ئارارات
یەک ناسنامەن، یەک مەشخەڵن، یەک وڵات

مەهاباد و هەولێر و قامیشلو و وان
چاو و دڵی کوردستانن، کوردستان!

پێشەوا قازی، شێخ سەعید، شێخ مەحموود
یەک ڕێبازن، یەک ئاوازن، یەک سروود

سۆرانی، لوڕی، کرمانجی، هەورامی
یەک بە یەک کوردی یە، دەنگ و پەیامی

گەل و شۆڕش، پێشمەرگە و ورە و خەبات
یەک سەنگەرن، دژی دوژمن هەموو کات

گیان و جەستەن، کورد و کوردستانی من
دەفڕن بەرەو سەربەخۆیی و سەرکەوتن

خامەی نالی و مەولەوی و حاجی و (خانی)ین
تینووی ئاشتیی و ئازادیی و ئاوەدانیین

# پەیامی ڕێ

٢٠١٥/٤/٢ رانیە

خوا و پێغـەمبـەر و ئیسلام و قورئــان و سوننەتمان، گیانن
کانگـــەی بیر و بــاوەڕمانن، هەناســـە و هـەوێنی ژیانن

کـورد و کـوردســتان و ئاڵا و پێشمەرگە و شەهیدمان، چاون
بۆ ئێمــە ناسنامــە و ناون، بـــە خوێن لە دڵمان نووسراون

سەربەخۆیی و دادپەروەریی و ئاشتیی و ئازادیی و پێشکەوتن
درووشمی هــەوڵ و خەبـــات و تێکۆشانمانن، بێ سرەوتن

تــەبـایـی و پێکـــەوەژیان و مافی مرۆڤ و ئـــــاوەدانیی
خـۆری کاروانـی ژینمانن، پڕن لـــە بــەهــا و لــە جوانیی

ئەم پەیــام و پەیڤانــەمان، بەرنــامــە و هــەنگاو و هێمان
خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی و ورە و هیوا، توێشووی ڕێمان

# ئەی نیشتیمان

رانیە ٢٠١٥/٧/٢٥

ئـــەی نیشتیمان! بە بۆنی خاکی تۆ مەستم
لە ژوانی تۆ، بــالْ دەگرن خەیـــالْ و هەستم

چاوم، لەگـــەلْ پرشنگی خۆری تۆ هـــەلْدێ
سینەم، لەگـــەلْ شنــەی شەمالْت دەپشکوێ

دلْم، لـــەگـــەلْ تاڤگـــەی کوێستانت لێدەدا
ئـــــەوینـی تـۆ، ڕازی ئـــــەوینـی پێدەدا

گیانم بـــەگیان، سلاوت لێ دەکا هـــەردەم
ئامادەنیم هەرگیز دەست لە دەستت بـەردەم

لە ئاسمانتا شکۆ و ســــەروەریی دەبـــارێ
هـــەر بـــەردێکت پشکۆیـــە بۆ پێی زۆرداری

هـــەر بستێکت مـــەلْبـەندی دەیـــان داستانە
خوێنی شـــەهید خۆری کـورد و کـوردسـتانە

خۆشم دەوێـی ئـــەی ولاتـی ڕەنگینـی خۆم!
بەشانازی و سەربەرزییەوە پێشمـەرگەی تۆم

# کەی حکومەت ئاوا دەبێ؟؟

٢٠١٥/١٠/٨

لە دوای ئـــەم هـــەموو خەبـــاتە
سەرنج دەن لـــەم دەســـــەڵاتە!

دەســـەڵاتێك خـــەمسارد و فـــەل
بۆتـــە حەزیـــای گـــەردنی گـــەل

تاكـــەی بـــەم شێوە لێ دەخورِێ
بەكێ و چی، دەنازێ و دەخورِێ!؟

گەر هـــەر لـــەو هەوایـــە برِوا!!
ســـەری خۆیی و میللـــەت دەخوا

برِوانن لـــە بـــــەزم و رِەزمی!!
لـــە حـوكم و سیستـەم و نـــەزمی

حیزب و حكومـــــەت تێكـــەڵـــە
بە مانـــــای وشـــە گـــەندەڵـــە

سیاسیی و بازرگان یەك زاتە ! !
مافیا سەرداری وڵاتە !

لە ئاست هاواری گەل کەڕە
عەودالی گۆنگەڵ و شەڕە

وەکو جەوالی بن دڕاوە
ڕاوکەری نێو ئاوی قوڕاوە

بە تۆمەت هەڵبەستن، فێرە !
لە سینگی گەل دەگرێ سێرە !

سەروەریی خۆی دەسڕێتەوە
داری ژێر پێی دەبڕێتەوە ! !

بێخەم خەوتووە لەسەر تەختی !
میللەتی خستۆتە سەختی

قەیران بە دوای قەیران دادێ
ئاسۆ ڕەشتر دەبێ تا دێ ! !

ڕەنجی خەبـــات و خوێنی کورد
ژێرپێ دەنێ و دەهـــــاڕێ ورد!

کـەی حکومـــەت ئاوا دەبێ!؟
وابـێ! خۆری ئـــــاوا دەبێ!!

میللـــەت نــــەفرەتـی لـێ دەکا
دواجـــــــار کارێکـی پـێ دەکا

(بـــا) نەیکا بـــە دەواری شڕ!
ئاوایـــــە ملهوڕیـی، مل هوڕ!!!

# شەوی ئەنگوستەچاو

٢٠١٥/١٠/١٢

ڕیز بوون قــــەیران و ئـاریشـــە
وڵاتیان کـردۆتـــە بیشــــــە!!

یاســـــا خـراوەتــــە ژێـر پێـوە
قـــــڕی و پــــڕی، لێـوان لێـوە

کورسـی و پـــارە و حـــەز و میزاج
ڕۆژیانــە و گـەل باج دەدا، باج!!!

قوڕ لە(گەل) هەردێ و خەست دەبێ
دەسەڵات هەردێ و مـەست دەبێ!!

سوڵتان هـــەر ڕەش هەڵدەگـەڕێ!
قۆڵ هەڵدەماڵێ لـە شـــــەڕێ!!

بـــــەڵام ڕۆژگـــــار دێت و دەڕوا
زۆرداران دەهــــــــاڕێ و دەخـوا

وایـــــان بۆ ناچێته ســــــەرێ
تـەخت و بـەختیان هــەڵدەوەرێ

لە دوای شـــەوی ئەنگوستەچـاو!!
پڕشنگ دەدا تیشکی هــەتـــاو!!

# ئاشتیی و تەبایی

سلاو لــە ئاشتیی و لە ئاشتیخوازان
دۆستانی ئاشتیی، جوامێر و ئــازان
ئاشتیی و تەبــایی، هیوا و هــەوێنن
مژدەی سەرکەوتن بۆ هــەموان دێنن

با بە مەشخەڵی ئاشتیی و تەبــایی
ژینمان بکــەینــە نوور و ڕۆشــنایی
تەنها یەکڕیزیی و یــەکبوونی خۆمان
دەبنە بنچینەی سەرکــەوتن بۆمان

یەکڕیزیی خۆری گــەل و وڵاتــە
ناکۆکی ژەهر و بــەڵا و ئافاتــە
ڕێبوارانی ڕێی تــەبــایی، مــەردن
با مەردایــەتیی، بخەینە گــەردن!

ئاشتیی، شــەماڵی بــەختیاریی گشتە
تــەبــایی، هێــز و ورە و بــڕشتە
بە دادپــەروەریی و لێبوردەیی و ماف
ئاشتی دەچەسپێ، نەك لاف و گەزاف

# پەیام

پەیـامێکە و دەبێ پـەیوەستی ئەو بین
هەموو ساتێ دەبێ هەر مەستی ئەو بین
لایــەك دەبێ ببێتە دەسـت و چــاومان
لایەکی دی، هەر چاو و دەستی ئەو بین

# ئەوینی گیان

هەرکەس دەستی لە دەستی ئیسلام شل کا
وەك ئـەوەیــــە پــەتی پەستیی لە مل کا
خودایـــــــە ! تا دەگاتە دوا هـەنــاسـەم
ئەوینی گیانی من بێ و هـــەست و تاسـەم!

# ئەوین

دڵم مــەستی ئـــەوینێکی بــەتینـە
ئەوینێکـــــە، گڕی بەردەوامە سینە
ئەوینێکـــە، هەقیقــەت بۆتە رۆحی
چرۆی هیوا و پەرۆش و زار و شینە

## ڕاستیی

ڕاستیی نەناسی، لاڕێ و کەساسی!
تۆ، بە ڕاستییەوە دووڕ و ئەڵماسی
وەکو هەنگ شیلەی ڕاستیی بچنەوە
بۆ لە ڕاست ڕاستیی، نابینا و کاسی!؟

## زانا

سڵاوی خوا لە زانا بێ، کە زانا
لەخۆ دەگرێ هەزاران ڕەمز و مانا
بە هەق زانا جیهانێکە لە بەرزی
بەمەرجێ کردەوە و هەڵوێستی ڕانا

## ڕەحمەتی نوور

هەتا ماوم، هەتا دەخرێمە گۆڕم
لەڕووخساری نوورانی نوور دەتۆڕم
ڕەحمەتێکە بەنووری ڕەحمەتی نوور
جیهانگیرە، چلۆن ڕێگەی دەگۆڕم!

# چوارین

چاکە بە چاکتر، خراپەش بــە چاکـە
وەڵام بـدەوە و لــە خراپـــــە ڕاکـە
هاوڕێ و هاودەمی چاکە بە هەردەم
ژین هــەر بە خۆری چاکــە ڕووناکـە

ناخی دیکتاتۆر وەك قــەتران ڕەشە
ئەو بۆ خوایــەتی، دەكا بانگــەشە
هەر کەس تەسلیمی فەرمانی نەبێ !
پیسترین سزا و جەزرەبــەی بەشە

ئەوانەی خاکین، دڵ ساف، دڵ نەرمن
خــاوەنی ڕێز و خولق و خــۆی گــەرمن
خاکیبوون، میوەی سروشتی پاکــــە
کەســانی خاکیی، چـــــاو و جگەرمن

بفـــەرموون ئاخـۆ لوتبەرزیی لەبـــەرچی!
دەبێ کێ بێ، سەری لەو بەزمـە دەرچی !؟
ژیرێك وتی: لە ژیران نایـــــــە هـــەرگیز !
لوتبەرزیی و ژیر! لە ژینێکیش، بەسەرچی!

ورد و وریابـــە و بەجێ هـــەنگاو بنێ بۆ پێشەوە
با نەکەویە نێو کەمـــەند و کەند و لەند و بێشەوە
سەختە ڕێ، واتێنەگەی شامی شەریفەو بێ بەلا!
تامی سـەرکـــەوتن بەتامی تاڵی ژان و ئێشەوە!

ئـەوەی ئەهلی وەفـــا بێ، ئەهلی ڕێزە
وەفـــاداریی، هێمای هـــەستیی بەهێزە
ناسۆری بێ وەفـــــــایی گڕ دەدا دڵ
ئەمــــــــەکداریی، ئەوین و پیت و پێزە

لە دنیا خاکیی بـــەو خۆت لێ نەگۆڕێ
سەر و خواری هەیـــە و دنیا دەگۆڕێ !
بـەڕێز و خـۆشەویستە خـەڵکی خاکیی
لەخۆبایی، لای خوا و خەڵك دەدۆڕێ !

# پەندی پێشینان

٢٠١٥/١١/٨

پــــــەندی پێشیـــنان مرواریین
دیـــاریی کورد و کوردەوارییـن

ڕەونـــــەقی ڕەســەنـایــەتین
کوردایـــــەتی و مەردایـــەتین

زادەی بیرتیژیی و ئـــــەزموونن
کانیاوی بێگـــــــەرد و ڕوونن

قسەی نەستەق و پڕ لــە مانــان
وتـــــەی خەڵکی دانـا و زانـان

یاقوت و گەوهـــــــــەر و زێڕن
نەکـــەن ڕوویان لێ وەرگێڕن!!

تاق تاق نـــــەبێ، دەنا هـەموو
لە ڕاستیی لانـادەن بـــــەموو

کورد پەندی بۆخۆی دانابێ!
ڕاستە (چەم بێ چەقەڵ نابێ)!

شیلەی گوڵ، ڕاوی هەنگوینن
ڕەزای سووک، خوڵقی شیرینن

تام و بۆی نانی تەندوورن
دیداری دۆستانی دوورن

دەنگی زەنگوڵ و شمشاڵن
ڕاپەڕی کابانی ماڵن

چۆڕەی شیر و شڵپەی مەشکەن
تێلەکە و جەواڵ و ڕەشکەن

باعەی مەڕ و فیتووی شوانن
وەک جوانیی کوردستان جوانن

تامی بابۆڵە و کەشک و دۆن
خەلە و خەرمانی گەنم و جۆن

بازوو و مەچەکی جووتیارن
پاچ و بێڵی کرێکارن

کـــەیفی باخ و باخـــــــەوانن
بـــــەزمی ئاش و ئاشـــــەوانن

حـــــەیرانـــی پیادە و ڕێبـوارن
حیلـــەی ئـــەسپی بابای سـوارن

ڕازی گـــــەرمێن و کوێســــتانن
بۆنی شەمامـــــەی بێســــتانن

گمـــەی کۆتر و قاسپــەی کەون
وەك تریفـــــەی مانگـــەشەون

چیرۆکـــی نـــەنك و بـــاپیرەن
بریسکـــــەی خەزێنەی پڕ لیرەن

شەوچـــــەرەی نێـو دیوەخانن
ڕیز و قـــەتـــــــارەی کاروانن

جەژنـــــە پیرۆزە و جەژنـــانەن
ئاکـاری بـــــــەرزی کـوردانەن

گـورِی هــــــــەرەوەزی لادێن
هـــەر بـــە تـامتر دەبن، تـــا دێن

لە هـــــەموو گفتوگۆ و كۆڕێ
ئـامـــــادەن و دێنـــــە گۆڕێ

بـاس و خواسـی ئـــاڵۆز و درێـژ
بە پـــــەندێكی پڕ مانا و چێژ!

هەڵدەبڕێ، لە شـــایی و شینان
هەزار ڕەحمەت لە پێشینان! ! !

# خەمخۆریی

ئێمە کاتێ کەسی چاك و بەکەڵکین !!
کە خەمخۆری خۆمان و خـاك و خەڵکین

بـزانن گـیان و ویـژدان و دڵ و هـۆش !
بە خەمخۆریی خەڵك (ئاوا)ن، دەنا بۆش

ئەوانـــەی هەر خەمی خۆیان لە دڵ دا
یەکێکـــە، لێرە بن، یاخود لـە گڵ دا !

خۆپـــەرستیی، بوونمان دەدا بـــە بادا
ژێر ئەوانـــەن، خۆیان لـەم دەردە لادا

دەبێ جەرگمان بەژانی گـــەل وەژان بێ
بۆ چەوساوان گیانمان تووشی هەژان بێ

چی بۆخۆمان پێمان خۆشە، هەمان شت
پێمان خۆش بێ، بۆ ئەوانیش کت و مت

ئاوا دەبین بە یـەك جەستە و دڵ و گیان
سەرفرازن ئەوانـــــەی ئاوەها ژیان !!

# ویست

ئـــــــادەمیزاد، بــــــــە ئیختیار و ئیرادە
ژمارەیەکـــــــە و(بوون)ی هەیە و ئـــــازادە

ئەوەی (بوون)ی بە (بوون)ی خەڵکە پەیوەست!
سەرابـــــــە، سێبـــــەرە، تارمایی بێ هـەست

پـــەنــا بـە خوا لـە قـــــەهری زاتی دانـــا
لـــــەوەی (ویست)ی بـــە ویستی خۆ وەلانا!

نەکەن قەت ئەڵقـــــەلەگوێ و گوێ لەمست بن
هــــەمـوو دەم خـــــاوەنی بیر و بڕســت بن!

لەکن ژیران، ویســت و ئەقڵـــــە، شـکۆی ژین
بە بێ ئیختیار و ئیرادە، مەگـــــــەر چین!؟

بەهەق کۆیلــــــەی هەقیقی دیـــارە کامەن!
ئــەوانـــــــەی بـێ ئیرادەن، داشـی دامەن!

ئەوانــــــەی هەر (بەڵێ قوربـــان) دەزانن!
نــەزانن، بـۆ خـودی خۆیـــــان خــەزانن!

هــــەرکـــەس کەسی ناکەسی وای لــە دەورە
تووشـی دەبن، شکستـی گـــەورە گـــەورە!!

تـــا ئیرادە و ئیختیاری خـۆن لـــــە دەستـدا
هەین، گــەر نا، هـەموو بوونمان لەدەست دا!!

# کات

۲۰۱۵/۱۱/۱۱ - هەولێر

کات، گـــەوهەری دەریای ژینە
ترپـــەی دڵـە، هـــەوای سینە

کات، شمشێرە و تەمەن دەبڕێ
مەلێکــــــە بـەردەوام دەفڕێ

هــەتـا دنیا دەبـڕێتــــــەوە
ناوەستێ و ناگـــەڕێتــــەوە

ئەوانــــــەی هۆشمەند و زانان
هەتا ئـــەو کاتـەی لە ژیانان !

کــاتـی خـۆ بــە فیڕۆ نـادەن
بـۆ چاکـــە شێری ئـامادەن

چرکە بە چرکە، سات بە سات
(کات) دەکەنـە چرۆی ئاوات !

# خەرمانی کات

(کات) گەوهەرە و نەکەی هەرگیز بەبای دەی
کەی ڕەوایـــە بە کاڵای بێ بـــەهای دەی !؟

کوشتنی کـات، خـۆکوشتنە ســـەدا ســـەد
بـێ ئـاگـایـی، دەبـڕێتــەوە ڕەگ و قــــەد

تا خـــــاوەنی خـــەرمانی (کـات)ی خۆتی
پاشـــای، دەنـا، شـــەپڕێوی شێن و ڕۆتی

کات خەڵاتە، هـــەل و دەرفـــەت، ئەمانـەت
هەر چرکەیـــەك دابڕانـە، کوا زەمانـەت !؟

هـــەزار هـــــاوار بـــە پولێکـــە، کـــە ڕۆیی
خودایـــە، قـــەت نەبینێن ڕەنجـــەڕۆیی !

# خزمایەتیی و هامووشۆ

بۆ خـزمایــەتیی و ســـەردانـی خـزمان
لە لووتکە دابــەو نـەکــەویــە نزمان !

ســـەردان، نەکـەیتە قــەرز و دەستەواو
بڵێ: من ئـــەرکی سەرشانمـــە و تـەواو !

لای دراوسێ و دۆسـت و ئاشـنا و ئازیزان
نەبیە هـــەنـــارە ترشـــەی پاییزان !

ئەو دێ و ئەو نایە و زۆر چووم و ناچم !
وامـــەبـــــە و بڵـــێ: بـۆ وا پێداچم

من خۆم ئەو ئەرك و مافــەی لەسەرمە !
دەچمــە ژێر باریی و خەمـــە لە بــەرمە

هەرکــەسێ نایکا کـــەیفی خۆیـــەتــی
ئەمــە تاوانــــــە و لە ئەستۆیـــەتــی

هەرکاتێ (ســاردی) کەوتە نێو قەومێ!
نێوان تێك دەچن، زۆر خراپ دەقــەومێ

بە خزمـــەتی باخ، باخـــەوان مـەردە!
باخی بێ خزمــەت، پەژمووردە و زەردە

چەند لە سەردان و هامووشۆ (ڕشت)ین!
هێندە بۆ یــەکدی هـــــاوکار و پشتین

# جەوهەری مسوڵمانەتیی

٢٠١٥/١١/٢٥

یەکتاپـــەرستیی و ڕەوشت و کار و هـــەڵوێستی مـــەردانە !
جەوهـــەری مسوڵمانەتیین، لە نـــاو و ڕواڵـــەت مـــەڕوانە !

ئـــەوەی خۆی کـــردە وەکیلی خـــودا و دەرگاوانی بەهەشت
سەرلێشێواوە و دەیـــــەوێ ئـــاوی زەوی ڕۆکاتە تەشت !

مسوڵمانی ڕاستەقینە، دەریـــــای ڕەحمـــەت و پـــەرۆشە
ئـــەوەی هـــەر ڕق دەبارێنێ، چـرای دەروونی خـــامۆشە

پێغـــەمبەرێك، کـــە (رحمه للعالمین)ە، سەرمـــەشقە !
دڵی پڕ میهر و موحیببەت، بـــە هـــەق سەوداســـەری ئەشقە

ئیسلام کە بەرنامـــەی خوایـــە، بۆگشت زەمین و زەمانێك !
چۆن دوور بێ لەحوکم و سیاسەت، بەفەتواو فەهمی کەسانێك ! ؟

ئیسلام دینێکی هـــاوسەنگـــە و دەبێ مسوڵمان هاوسەنگ بێ
نابێ لـــە بـــەرامبەر زوڵمی ستـــەمکاراندا، بـــێ دەنگ بێ !

چۆن کاربـــــەدەستی ستەمکار، وەلی ئـــەمری ئیمانداره !؟
ئـــــەوەی بیر و بـڕوای وابــێ، خەڵـــەتاوە و خــەتابـــــاره

دنیا جێی تاقیکردنــــــــەوەی ئـــــادەمیزادە، هــــــــەر بۆیە
تۆبزی لێکردن ژێرپێ نێ و هـــــەر بانگــــــــەواز ئەرکی تۆیە

ئـــــادەمیزاد و ئـــــازادیـی، بــــە یەکــــــەوە لـــەدایکبـوون
ئـــــەوەی ئازادیی زەوت کا، دژی هـــــەقــــــە، بێ چەندوچوون

# لادێ

٢٠١٥/١١/٢٧

لەكن من وایـــــە، دڵ شـەیدا و هـەتا دێ
کـــەیف و سەفـــام زۆرتر دەبێ بــە لادێ

تام و بۆن و بەرامـــەی خۆش، هـەوای پاك
لە لادێ یــــە و لەوێ یــە ڕەونـەقی خاك !

کوردی پەتی، قسەی نەستەق، پەندو چیرۆك
لە لادێ یــــە و لەوێ یــە باس و دیرۆك !

خـولقــی شیرن، دڵــی ســاف و سەخـاوەت
هـــەرەوەز و هـــاوکـاریـــی، داب و داوەت

باڵندە و ئاژەڵ، دەشت و شـــاخ، ڕەز و باخ
لــە لادێ یــە و لەوێ دەڕوا خـــەم و داخ !

لادێ یــــە کانگــەی بەرهـــــەمی خۆماڵیی
بـــە بـێ لادێ، وڵات خـــاپــوور و خاڵیی

بـــە دێ و دێهات و لادێ و گـوندی ڕەنگین!
بە خــاك و خەڵکەوە، جوان و بە سەنگین!!

خوایـــــە هـــــەر ئاوەدان بێ، کوردەواری !
پـڕشنگ بدەن هـــــەمیشە گوند و شــاری

## سروودی گوندنشین

من خـــەڵکی لادێـی ڕەنـگینم
ســـــەربڵنـدم، گـــونــدنشینم
بـــە ئارەقـــــە و ڕەنج و تینم
دەنـــەخشێنم ئـــاسۆی ژینم

سروشتی جـوانــی دێ و دێهات
لام جوانتر دەبێ سات بە سات
هـــەمیشـــە خۆشیم پێ دەدات
بـــە لادێ وە، جوانـــــە وڵات

لادێ، لانـــەی کوردایــــــەتی
مــــەڵبەندی ڕەسەنایـــــــەتی
مەکۆی وەفـــا و مەردایـــەتی
سڵاو لـــــەوەی شەیدایــــەتی

چۆن من لە لادێ باردەکەم !؟
چۆن وا خۆم کۆڵەوار دەکەم!؟
بـــــەهێزی بـــــازوو کار دەکەم
خزمـــــەتی گوند و شار دەکەم

بــەروبوومــی خــۆمــاڵیی من

بــــە ڕەنجی شــانــی پیاو و ژن

بۆتــە دەسکــــەوتێکی مــەزن

نەکــەن لە ئاستی سپڵــە بن!!

# میوانداریی

٢٠١٥/١٢/٣

میوانداریی، خەسڵەتێکــە جوان و مـــەزن
لایان بـــەرزە، ئەوانـــەی خاوەن ئـــاوەزن

نیشانـــــەی ڕەسەنــایــەتیی و نەجابـەتە
خەرمانێکـــــە و پڕ لە مانا، ئـــەم بابەتە

بە ئاســـــانی وەدەست نایـــە، مەردایەتی
دەبێ پـــەرێز، ببێتە بەڵگـــــە و شایەتی !

سەخاوەت و کەسایـــەتی و هیممەت بەرزی
هی کەسێکن دڵی لـــە چاکـــــــە نەلەرزی

ڕێزگـــرتن و خزمـــەتی میوان، بـێ گومان
فەرمانی خوا و پێغەمبەرن، ئـەی مسوڵمان !

کورد گوتەنی: (خوڵقت گەنم و نانت جۆ) بێ
دەبا میوان، چـــاو و دڵ و جـەرگی تۆ بێ

سوپاس بۆ خوا، کـــورد میللەتێکە خانەدان
پڕ خانەخوێی دڵ ئاوەدانـــە کوردســـتان

# کوێستان

٢٠١٥ – سلێمانی

دڵم لەگـــــەڵ سروشتی کوێستان تێکـــەڵە
کـوێستان لای من، هــــەواری دڵـە، هـــاوەڵە

ئـــاو و هـــەوای سازگار و تاڤگـــە و ڕەونەقی
موعجیـزەیـە و لاڵم لـــە وەسفی، ئەلهـــەقی

هـــــەر دیمەنێك، دنیایـــەك ڕازە و ڕەنگ و بۆ
هــــەریەك بەســـەد ئـــاوازەوە، بۆت دێتە گۆ

لە جوانیی دا، جوانیی کوێی سروشت پێی دەگا!
کــەسێ بـــەدڵ ئەشقی نـەبێ، کوا تێی دەگا!؟

شاخ و داخ و خـاك و خۆڵ و گیا و گوڵ و (بـا)ی
کەیف و سـەفـام دەخـــاتە دڵ، بـە زاتی خوای!

بـە خۆم نییە و بـە سیمای شەیدا و مەست دەبم
بـــە تێکدانی، یەك دنیا قـــەڵس و پـەست دەبم

دەسا خـوایـــە، کـوێستانی کـوردسـتانی من!
هــــەر ئاوەدان، دوور بن لـــە پێخوستی دوژمن

# قەڵادزێ و تراژیدیا و
# هەرەسی دیکتاتۆریەت



(قەڵادزێ و تراژیدیا و هەرەسی دیکتاتۆریەت) نامیلکەیەکی شیعری بوو و ساڵی ٢٠٠٧ سەرپێ یی چاپ کراو لە ٢٤/٤/ی هەمان ساڵ لە قەڵادزێ دابەشکرا، ساڵی (٢٠١٢)ش بە لێ زیادکردنی کورتە مێژوویەکی قەڵادزێ و پشدەر و دیزانێکی جوانەوە، چاپ کرایەوە و لە کۆنفرانسێکی تایبەت بە ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدانی قەڵادزێ و پشدەر لە ٢٦/٦/ی هەمان ساڵ و ساڵرۆژی راگواستنیاندا، لە قەڵادزێ دابەشکرا، ئەم چاپەی دووەم لە دیزانی (ئەکرەم فەرەیدون)و چاپخانەی کوردستان و ژمارەی سپاردنی (١٥٨٤)ی ساڵی ٢٠١٢ی کتێبخانەی گشتی سلێمانی و تیراژی (٥٠٠) دانە بوو و لەسەر ئەرکی ناوچەی قەڵادزێی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان چاپ کرا، لێرەشدا پەراوێزی بۆ زیاد کراون.

## پێشکەش بۆ بە:

- گیانی بەرزەفڕی شەهیدان و کەس و کار و بنەماڵە سەربەرزەکانیان.
- ئەو کاربەدەستانەی رووی دەسەڵاتدارانی ستەمکار سپی ناکەنەوەو بۆ پەند و ئامۆژگاریی، ئاوڕ لە سەرەنجامی شومیان دەدەنەوە.
- ئەوانەی تیغی ورەیان بە زەبروزەنگ دەمەزەرد دەبێتەوەو ئە ستێرەی هیوایان لەبەرزی دا دەدرەوشێتەوە.
- ئەوانەی لەپێناو راستیی و دادپەروەریی دا دەژین و دەمرن.

# کورتەمێژوویەکی قەڵادزێ و پشدەر[1]

لەبارەی ناوی (قەڵادزێ)وە، بیروڕای جیاواز هەیەو چەند بۆچوونێک خراونەڕوو، یەکێکیان پێی وایە خودی ناوی قەڵادزێ لەدوو وشەی (قەڵا) و (دز) هاتووە، (قەڵا) هەر بەمانای قەڵایەو (دز)یش لە(دژ)ی فارسییەوە هاتووەو ئەویش هەر بەمانای قەڵا دێت.

بۆچوونی تر هەیە پێی وایە(دز)ەکەش هەر (دز)ەو واتە لەقەڵای (دز)ەوە هاتووە.

رایەکی دیکەپێی وایە لە(قەڵا + دووزێ)وەهاتووە، کە مەبەست لە یەکەمیان قەڵا دێرینەکەی رۆژئاوای شارەکەیەو (دووزێ)ش مەبەست ئەو دوو رووبارەیە کە بەدەوری قەڵاکەدا دێن و لەخوار قەڵاکەوە تێکەڵی یەکتر دەبنەوە. ئاشکرایە ناوی (پشدەر) لە(پشت + دەربەند)ەوە هاتووەو مەبەست لێی ئەو سنوورە جوگرافیەیە کە دەکەوێتە پشت ئەو دەربەندەوە بەرووی رۆژهەڵاتەوە.

لەبارەی دروستبوونی قەڵادزێ و قەڵادێرینەکەیەوە، لە (المرشد الی مواطن الاثار والحضارة)دا هاتووەئەم گردە پاشماوەی نیشتەجێبوونی ئاشورییەکان و پێش ئەوانیش بووە، دەشگونجێت ئەو شوێنە شاری (زامبلی) بێ کە لەکاتی هێرشەکانی (سەرجۆن)ی هەشتەمدا ناوی هاتووە، هەندێکی تر وای بۆ دەچن لەسەردەمی (خان بداغ)ی کوڕی فەقێ

---

[1] بۆ ئەم بابەتە سوودی زۆرم لە (کۆستی شارێك)ی دادوەر: تەها بابان – ٢٠٠٤ و رۆژنامەی بیست و چواری چوار – بڵاوکراوەی تایبەتی راگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان– ٢٠٠٧/٤/٢٤) و (خواناسان و ناودارانی کورد، ناوچەی ئالانی سەردەشت و پشدەر)ی مامۆستا ئەحمەد مەلا صالح گەناوی و هەروەها مامۆستا ئەحمەد مەحەممەد دەروێش قندۆڵی و د عەلی مەحمود عەلی قندۆڵی (١٩٥٤–٢٠١٢/٢/٢٣)ی رەحمەتی و ژمارە (٥١)ی گۆڤاری شمشارە، کە هەرسێك مامۆستای ناوبراو بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە، وەرگرتووە.

ئـەحمـەدی دارەشـمانەوە دروسـتکراوە، کـە نـاوبراو خۆشـی گونـدی (گربداغ)ی لە نزیک ئەو شوێنەوە بنیات ناوە.

بەپێی هەندێک سەرچاوە، دوای ئەوەی عوسمانیەکان لەساڵی(١٨٩٢ – ١٨٩٣) گـەمـارۆی پـشدەر دەدەن و دەسـتی بـەسـەردا دەگـرن، نـاوی شارەکەیان بۆ (قضاء الحمیدیة) گۆڕیوە، بەپێی سەرچاوەی تر دوای گواستنەوەی بارەگای سوپای عوسمانی لەمەرگەوەبۆ قەڵادزێ، ناوەکەیان بۆ (قضاء المعمورة العزیزة) گۆڕیوە نەک (الحمیدیة) هەروەکو (عبدالرزاق الحسنی) لە کتێبەکەیدا باسی کردووە.

هەروەها لە کتێبی(ناونانی منداڵانی کورد)دا هاتووە کە قەڵادزێ لە ساڵی (٥٧٢)ی زایینی دا ناوی (نامرێ) بووە.

قەڵادزێ یاخود قەڵادزە، لەرووی جوگرافییەوە دەکەوێتە ناو دەشتی (پشدەر)ەوە و بە زنجیرە چیاکانی (ئاسۆس و بلفەت و مامەندەو چواس و هەرمێن و قەندیل) دەوردراوە و شارێکی کوێستانییەو لە رۆژهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شاری (سەردەشت)ی رۆژهەڵاتی کوردستاندا.

قەزای قەڵادزێ سەر بەپارێزگای سلێمانی یەو (١٢٤) کیلۆ مەتر لێیەوە دوورە، لەئێستادا پێنج ناحییەی هەیە کە بریتین لە (هێرۆ، ژاراوە، ناودەشت(سەنگەسەر)، هەڵشۆ، ئیسیوە) لەگەڵ (١٩٤) گوند.

(رەفیق سابیر) رووبەری ناوچەی پشدەری بە(١٥٠٠) و کتێبی (العراق قدیما و حدیثا) کە لەساڵی ١٩٤٧دا دەرچووە، بە(١٢١٦) کیلۆ مەتری چوارگۆشەداناوە.

لەرووی شوێنەواری مێژووییەوە جگە لەقەڵا دێرینەکەی قەڵادزێ (قەڵای دینکە لەگوندی هەڵاوێژە، بەرشاخان لەهێرۆ، بێموش لەگوندی بێموش، گردی حەسار لەقەڵادزێ، زندان لەگوندی بادەڵیان، سەید ئەحمەدان لەگوندی سەید ئەحمەدان و...هتد) شوێنەواری مێژوویی قەڵادزێ و ناوچەکەن.

پشدەرییەکان بەشێوەیەکی گشتی لەعەشیرەتەکانی (نوورەدینی، میراودەلی، مامەش، مەنگوڕ، ئاکۆ) پێک دێن و ناوچەکانی (مەرگەو بیتوێن و باڵەکایەتی و کەمێکی شینکایەتی) بەسەر پشدەرەوە هاوسنوورن و جگە

لەزێی بچوک کەپشدەر و چیای ئاسۆس لێک جیادەکاتەوە، چەندان رووباری تر وەکو: (گاڕفێن، ژاراوە، قەڵادزێ) لەپشدەرەوە دەڕژێنە زێی بچوکەوە، ئاو و هەوای پشدەر سازگارەو ژینگەی پاکە، کوێستانەکانی و زنجیرەچیا سەرکەشەکانی دەور و پشتی، جگە لەوەی سیمایەکی جوانیان پێداوە، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند و ئاوەدانی گیا بەهارییەکانی وەکو: (کەنگر و کاردو و کارگ و ڕێواس و باڕێزەو لووشەو هەندرێشەو...هتد)ن و هەواری گەمێن کوێستانی رەوەند و مەڕدارەکان و لەوەڕگەی ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتن، هەروەها خاوەنی چەندان سەیرانگای ناوازەو ڕێگای سنوورییی وەکو: (گەناو و قندۆڵ، گۆڕیلکێ، کێلێ، سونێ و شێنێ) یە.

دەڤەری پشدەر لەرووی مەدرەسەو حوجرەو زانای ئایینی یەوە خاوەنی پێگەی تایبەتی خۆیەتی و یەکێکە لەمەڵبەندەکانی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و شیعر و ئەدەب و رۆشنبیریی لەرێی ئەو زانا و مەدرەسە ئاینیانەوە، دەتوانین وەک نموونەش ئاماژە بەچەند زانا و ناوەندێکی عیلمی ئەم دەڤەرە بدەین:

**یەکەم: مەدرەسەی گەناو**

ئەم مەدرەسەیە لەڕووی زانستیەوە وەکو حەوزەیەکی عیلمی وابووە، گەورەترین زانای بەناوبانگی ئەم مەدرەسەیە(مەلا زەینەدینی بلات)ی بووە، کە تاکەزانای سەردەمی خۆی بووەو نازناوی (شەیخول ئیسلامی) پێدراوە و هاوتای (ئین و حەجەری هەیتەمی) بووەو کەمێک دوای هەزارەی یەکەمی سالی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

دووەمین گەورەزانای ئەو مەدرەسەیە (مەلا غەزایی گەورە) بووەو نازناوی (مەولانا)ی پێدراوەو سێهەمین گەورەزاناشی (مەلا مەحمودی خواهەرزاد - غەریب) بووە، کەهەم شاعیرێکی گەورەو هەم زانایەکی بەناوبانگ بووەو تەنانەت (کاک ئەحمەدی شێخی سلێمانی) بۆ خوێندن چۆتە ئەم مەدرەسەیە و هەر لەسەردەمی ئەویشدا لەبەر زۆری مامۆستا و فەقێکانی، مامۆستایەکیان بەناوی (مەلا برایمە رەشی قندۆلی) وەک پاشا هەڵبژاردووە و پێ یان گوتووە: برایم پاشای قندۆل و مۆری هەبووەو ناوبراو نامەی بۆ والی سلێمانی دەولەتی عوسمانی نووسیوە، ئەم مەدرەسەیە تا کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکان هەر قەرەباڵغ بووەو جموجۆڵی زانستی تێدا بەردەوام بووە.

**دووەم : مەدرەسەی دەشتێو**

لەم مەدرەسەیە دا (مەلا حوسێنی دەشتێوی یەکەم) کەساڵی ١٩٠٤ی زایینی وەفاتی کردووە، وەک زانایەکی بەناوبانگ، ناوێکی دیارە و ناوبراو کاتێک بەهۆی بارودۆخەوە دەکەوێتە شاری بەغدا، لەوێ بەهۆی زیرەکی و وەدەستهێنانی بەرزترین نمرەی تاقیکردنەوەیەکی زانستی لەوسەردەمەدا، دەکرێتە سەرۆکی زانایانی بەغدا و عێراق و بەڕێوەبەری مەدرەسەی (ئەعزەمیە).

**سێهەم : مەدرەسەی کەستانە**

لەم مەدرەسەیەدا (مەلا مەحەممەدی کەستانە) زانایەکی بەتوانا بووەو مەدرەسەکەشی ناوەندێکی زانستیی سەردەمی خۆی بووە.

**چوارەم: مەدرەسەی هێرۆ**

کە (مامۆستا شێخ بیلالی هێرۆیی) سەرپەرشتی کردووەو بەخۆیی و مەدرەسەکەیەوە رۆڵی گرنگی گێراوە و بەناوبانگ بووەو ناوبراو پێگەیشتووی مەدرەسەی گەناویش بووە. لەلایەکی دیکەوە پشدەر لەرووی کەسایەتی بەناوبانگیشەوە پێگەی خۆی هەیە، بۆ نمونە: فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە، کەلەسەردەمی حوکمڕانی خۆشیدا (دارەشمانە) ناوەندی حوکمڕانی بابانەکان بووە.

قەڵادزێ و پشدەر لەسەردەمی (رووسەکان و عوسمانیەکان و ئینگلیزەکان) دا زۆر جار تووشی شەڕ و شۆڕ و بۆردوومان و داگیرکاریی بوونەتەوەو هەمیشە مەڵبەندی بەرگری و قارەمانێتی بوون، بۆ نموونە: لەساڵی ١٩٢٢دا شەڕێکی گەورە لەنێوان سوپای داگیرکەری ئینگلیز و هێزی پشدەریەکاندا لەدەربەند روویداوەو ئینگلیزەکان تێکشکاون و بەرەو کۆیە هەڵاتوون، ئەم ناوچەیە بەگشتی تا ساڵی ١٩٣٨ بەسەربەخۆیی و دوور لەدەسەڵاتی حکومەت ماوەتەوەو لەو ساڵەدا لەسەردەمی مەلیک غازی و حکومەتی(جەمیل مەدفەعی)دا، بەهێزێکی زۆر ناوچەکەدەستی بەسەردا گیراوەو دام و دەزگای حکومەتی تێدا دامەزرێندراون و یەکەم قائیم مەقامی ناوی (هەمزەبەگ) بووە، ساڵی ١٩٤١-١٩٤٢ قوتابخانەو ١٩٤٨ نەخۆشخانەی لێکراوەتەوەو هەر لەساڵی ١٩٤٨ هێڵی تەلەفۆنی بۆ هاتووە، ١٩٥٠ رادیۆ هێنراوە بۆ ئەو شارەو ١٩٥٦ کارەبای بۆ هاتووە، ١٩٥٧ ناوی (داودێ)ی بۆ راکێشراوە، لەسەردەمی شۆڕش و لەساڵی ١٩٧٤ یشدا زانکۆی سلێمانی گوێزراوەتەوە بۆ قەڵادزێ، بێگومان ئەمەش پایەیەکی گەورەی زانستی دابوو بەقەڵادزێ و پشدەر.

ژمارەی دانیشتوانی قەڵادزێ بەپێی هەندێک سەرچاوە لەساڵی (١٩٥٠) دا بە(٥٠٠٠) و لەساڵی (١٩٦٧) بەپێی کتێبی ( اصول اسماء المدن والمواقع العراقیة) بە(٦٢٥٠) کەس دیاریکراوە، ژمارەی تێکڕای دانیشتوانی پشدەریش لەساڵی (١٩٤٧) بە(٣٦١٠٣) هەزار کەس دانراون و لە ئێستاشدا

واته٢٠١٢ هی قەڵادزێ بۆ (٧٠٠٠٠ – ٧٥٠٠٠)و هی پشدەریش بەگشتی بۆ زیاتر لە (١٠٠٠٠٠) کەس بەرز بۆتەوە.

رژێمی دیکتاتۆری بەعس لەسەعات نۆ و چل و پێنج دەقیقەی پێش نیوەڕۆی رۆژی چوارشەممە١٩٧٤/٤/٢٤، بەچوار فڕۆکەی جۆری سیخۆی روسی ژمارە٧ و بەسەرپەرشتی راستەوخۆی (سەددام حوسێن)ی دیکتاتۆر، کارەساتێکی سامناک و خوێناوی بەسەر قەڵادزێ دا هێنا و بەبۆمبای ناپاڵمی قەدەغەکراو بۆردوومانی شارەکەی کرد و لەئاکامدا زیاتر لە(١٦٣) شەهید کە(٩)یان لە خانە وادە ی ئە حمە دی حاجی سابیری رە حمە تی و(٩)تریشیان قوتابی زانکۆ بوون و زیاتر لە(٢٥٠) بریندار زیانی گیانی لێکەوتەوە، لەگەڵ روخانی (٩) بینای حکومی و لەسەرروو هەموویانەوە زانکۆ و زیاتر لە (٢٣) ماڵ و (٤٧) دوکان.

رژێمی لەناوچووی بەعس، سیاسەتە شوم و شۆڤێنیەکانی دژ بەکورد و کوردستان بەگشتی و ئەم دەڤەرەسەربڵندە بەردەوام بوون، لەپیلانێکی نوێدا سیاسەتی راگواستنی پیادەکرد، لەساڵی ١٩٧٨ وەتا ١٩٧٩ زوربەی گوندەکانی بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکانی (پێماڵک و بەستەستێن و تووەسووران و چوارقورنە) راگواستن و سەرجەم گوندەکانی بە مزگەوتەکانیشەوە سوتاندن و وێرانکردن.

جەماوەری شاری قەڵادزێ هەموو ساڵێک لەیادی کارەساتی ٤/٢٤دا هەڵوێستیان وەردەگرت و نارەزاییان دەردەبڕی، بەڵام نارەزایی ١٩٨٢/٤/٢٤ زۆر جیاواز بوو و راپەڕینی تێدا بەرپاکرا و شار بەیەکجاری خرۆشا، بوو بەرێپێوان و هوتاف کێشان، (گوللەو پەت و سێدارە+ ناترسێنێ ئەم شارە) (بیست و چواری چوارە+ جێ کەڵبەی سەگی هارە) (شەهید خوێنی دەرژێنێ + ئازادی بەدەست دێنێ) (هێزی گەل لەبن نایە+ شەهیدبوون دکتۆرایە) و چەندان دروشمی تر، بەم جۆرەدڵی دوژمن هێنرایە لەرزەو دوو ئافرەتیش لەریزی خۆپیشاندەراندا بەناوەکانی (مامۆستا سنەوبەر و دایکە ئامینە) شەهیدبوون، پاشان پریشکی ئەم راپەڕینە زووربەی شارەکانی دیکەی کوردستانی گرتەوە.

دوای وەستانی شەڕی هەشت ساڵەی عێراق – ئێران، جارێکی تر ڕژێمی بەعس پیلانی ڕاگواستنی تەواوی پشدەری بەسەرجەم شارو شارۆچکەو ئۆردوگا زۆرەملێکانیەوە دارشت و ئەم پیلانەشی لەمانگی(١٩٨٩/٥ – ١٩٨٩/٦/٢٦) جێبەجێ کرد و سەرلەبەری خاپوورکرد و ناویشی نا (مەنتیقەی موحەڕڕەمە)!

دانیشتوانەکەشی جگە لەوانەی ئاوارەی کوردستانی سەر بەئێران بوون و سەری خۆیان هەڵگرت، پەراگەندەی ئۆردوگاکانی (بازیان ١ و بازیان ٢ و باینجانە)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی و (خەبات و جدیدەو کەورگۆسک و تۆبزاوا و دارەتوو)ی سەر بەپارێزگای هەولێری کردن.

کاتێکیش لەساڵی ١٩٩١ بەویستی خوا هەلی ڕاپەڕینێک دژ بەرژێمی بەعس بۆ گەلی کورد ڕەخسا، جەماوەر و شۆڕش کەوتنە بەرنامەڕێژی و خۆئامادەکردن، ڕۆژی ٣/٤ لە ئۆردوگای زۆرەملێی خەبات خۆپیشاندانێک کرا و تیایدا لاوێک بەناوی (بەختیار عومەر هورێوەیی) شەهید بوو، بەڵام بەعس بەزەبر و زەنگ خۆپیشاندنەکەی دامرکاندەوە، تا لەرۆژی ١٩٩١/٣/٥ شاری ڕانیەو دەوروبەری ڕاپەڕینیان دەستپێکرد و سەرجەم دام و دەزگا حکومی و حیزبی و ساربازیەکانیان دەست بەسەردا گرت و ناوچەکەیان لەدوژمن ئازادکرد و ئیتر کوردستان هەمووی ڕاپەڕی و بەویستی خوا دوژمنانی ئایین و گەل و نیشتیمان بەچۆکدا هاتن و کوردستان - بەقەڵادزێی قەڵای شۆڕش و ڕاپەڕین و قوتابخانەی ورەو نەبەزین و پشدەری مەکۆی جوامێریی و ڕەسەنایەتییەوە– دوژمنی بەیەکجاریی لەژێر پێ نایەوەو چریکەو ئاوازی سروودی سەرفرازیی، لەهەموو شوێنێ دەنگی دایەوەو ئامێزی لەبەژنی کەڵەگەتی ئازادیی و ئاوەدانیی، وەرێنایەوە.

# هۆ قەڵادزێ!

١٩٩٣/٤/٢٤

هۆ قەڵادزێ!
تۆ تاجێکی
(ئاسۆس) لە سەری خۆت دەنێ
تۆ ڕازێکی
(بڵفەت)[١] دەتکا بە خووناوەی
گوڵ و نێرگزی بەندەنێ
ئاوازێکی و لەحەماسەت
دڵی سەداها (مامەندە)[٢] ڕادەچەنێ
تۆ تۆی ئیتر
مەگری چیتر
بەسە خەمان لە دڵ مەنێ!
دەسا شاری خوێنینی مە
پێکەنینێک، زەردەخەنێ
سەر هەڵبڕە و لێ بنۆڕە و شوکری خواکە
ئاها دوژمنت بە پەتی سێدارەوە
ڕادەژەنێ!

---

[١] لوتکە چیایەکی بەرزە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی قەڵادزێ.

[٢] چیایەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی قەڵادزێ.

# قەڵادزێ... شاری خۆڕاگر

**٢٠٠٥/٤/٢٣ رانیه و قەڵادزێ**

قـــەڵادزێ، شـــاری خۆڕاگـر!
خـــاراوی شـــــاڵاوی ئـــاگـر

ئـــەی مـــەڵبەندی مـــەردایەتی
ســـــەکـۆی کۆڕی کـوردایەتی

قـــەڵای شـۆڕش و راپـــەڕین!
کـێوی ورە و بـــــاوەڕ و تین[1]

هـــــەواری وەفـــــا و جوامێریی
زۆرت چەشتوون تاڵیی و سوێریی

کارەســـــات لـــە دوای کارەســـات
بە ســــەر تۆی بێ ســــەڵادا هات

کـــام نـــاخـــۆشیت نـــەبینیـــوە!؟
لاشــــەت بـــە خـوێنی نـەخشیـوە

ئـــــەوەی تـــا هـــەتـــایە دیارە
رۆژی بیســـت و چـــواری چوارە

---

[1] ئەم نیوەدێڕەم لەم دیوانەدا گۆڕیوەو لە نامیلەکەدا (گەلێك سەگەلت پێ وەڕین) بوو.

هــــەرچــەنـدە خــۆشـیی بێتەوە
هــــەرگیز لــە یـــاد ناچێتەوە

تـــاوانی وا لـــەو ســـەردەمــە
نـــەبووە، رووشی دابــێ کەمــە!

ئـــای لـــە بڕیـــاری زۆردارێـک!!
بــە فڕۆکـــە بێتە ســـەر شارێـک

لای خــۆ، شـار و خەڵکی خۆی بێ!
کــەچی وەک ئەهریمـــــەن بۆی بێ

ئـــــــەو دیکتاتۆرە دڵ رەقـــــە
ســـەعات نۆ و چل و پێنج دەقـــە

بیست و چواری چوار، حەفتاو چوار
چوار شەممە، بە چوار فڕۆکەی هار

دوور لـــە هــەست و سۆز و دەماغ
بـــە بۆمــبا و نـــاپاڵمی یـاســـاغ

شـــــاری خستە شین و شـــەپۆڕ
ژینی هـــــاویشتە چـــــاڵ و گـۆڕ

بـەهـــــاری خۆشـیی و ئـــازادیی
بوو بـــە خـــەزان و بـــێ دادیی

زریکـــە و ناڵـــەی بێ تـــاوانان
هـــەستا لـــە گشت دەرک و بانـــان

شەقامـــەکان بـــە خوێن سوور بوون
گەلێک شوێن کاول و خـاپوور بوون

بـــە سـەدان شـــەهید و زامـدار
نەخشـــاندیان تابلۆی مـــەرگی شار

زانســـت و زانکـــۆ و قوتـــابی
منداڵ، خـۆیی و دایک و بـــابـــی

مێشک و ســەر، پەنجە و قاچ و قۆڵ
تێکـــەڵ بوون لەگەڵ خاک و خۆڵ!

* * *

(ســـەددام)ی تـــاغوتی ســـەردەم
پیلانـــی دەگێـڕان هـــــــەردەم!

خـۆیـی و رژێمی شـــەڕانگێزی
ئـــەمجـار (گونـد)ان، رادەگوێزی!

ســـاڵی حـــەفتا و هـــەشت و دواتر
وەخۆکـــەوت بـــەعسی کـــافر

هـــەرچـی دێهات و مزگـــەوتن
بـــەر شـــاڵاو و روخان کـــەوتن

خـەڵكیشی بــــە (ئیڤا) و (زیل)[1]ان
ڕەپێچــــەك دان وەكـــو دیلان

بـــەرەو ئۆردوگــــای زۆرەمل
بـــەندیخانــــەبوون، ئەمما: زل!

(پیماڵك) لەگـــــەڵ (بەستەستێن)
(ژاراوە) و(تووەسووران)[2]نیان جێن

ژمارەیـــەكیش بەردەربـــەند كران
بۆ ئۆردوگای (چوارقوڕنـــە) بران

ئەمـــەش قۆناغی یەكــەمـــە!
ئای ژین چەند سەخت و ئەستەمـە!!

دوژمن وابـوو بـــەرانبەرمــــان
بــــەلام ورە و هیوا، هـەر مـــان

بـــەڵكـــو ڕقی تۆڵــــەی پیرۆز
جۆشـــــاندی دڵی گــــەل و هۆز

---

[1] جۆرێك ئۆتۆمبێلی سەربازی رووسی بوو و خەڵكەكەیان پێ رادەگواست.

[2] چوار كۆمەڵگای زۆرەملێ بوون، رژێمی بەعس لـە ١٩٧٧ –١٩٧٩ گونـدە سـنووریەكانی پشدەری بۆ راگواستبوون و ناوەڕاستی ١٩٨٩ش هەموویانی لەگەڵ كۆی ئاوەدانیـەكانی پـشدەردا وێرانكـردن و دانیشتوانەكانیـشیانی بـۆ كۆمـەڵگاكانی هـەولێر و دۆڵـی بازیـان راگواستن.

میللەت ساڵانە لەو یادە
لە ماڵ و بازاڕو جادە

ئەو یادەی زیندوو رادەگرت
دوژمن دەکەوتە جرت و فرت

ئەمما لە ساڵی هەشتا و دوو
راپەڕینی لێ پەیدابوو

شار بە یەکجاری خرۆشا
کورەی تێکۆشانمان جۆشا

قوتابی و لاوی خوێن گەرم
پێشەنگ بوون، بێ ترس و شەرم

هەموو بە هاوار و هوتاف
بۆ تۆڵە، بۆ سەروەریی و ماف

سەروەریی وایان تۆمارکرد
شانازی بوو، بۆ گەلی کورد!

(ورە)ش کەوتە دڵی شاران
بۆ راپەڕین لە زۆرداران

* * *

دوژمنی درندە و خوێن تاڵ
پیلانی پیس بوون ساڵ بە ساڵ

هەشتا و هەشت بوو، دەستی پێ کرد
(پشـــــدەر)مـــان حیسـابی رابرد!!

پیـلانێـک بــــوو دژوار و رەش
تـا لــه هەشتا و نۆ و مانگی شـەش

بــه زەبر و زۆرەملێ و بێ خواست
تـــــەواوی پشـــدەری راگواست!!

لەگـــەڵ عەرزێ دا، تـــەختی کرد
بــــه (موحەڕڕەمه)[1] نـاوی برد!!!

خەڵکـــــەکەشی سـەربــــەرەوژێر
بــــەرەو ئۆردوگا و گەرمــــەسێر

راپێچـــــان بـــــۆ دووره وڵات
(دارەتـــوو)، (جەدیـده) و (خەبـات)

(پیرەمـــــەگـرون) و (تـۆبـزاوا)
بـەرەو(کەڵــــەک) و (حـاجیاوا)

---

[1] دوای ئەوەی رژێمی بەعس لـە ناوەڕاسـتی ١٩٨٩ هـەموو پشدەری راگواسـت و تـەخت کرد، ناوی لێنا (منطقـة المحرمـة) واتـە: ناوچـەی قەدەغـەکراو، ئـیتر هـەموو جموجـوڵ و مانەوەیەك لەوێدا قەدەغە بوو! !

(كـــەورگۆسـك) و (دۆڵی بازيـان)
بتلێنەوە لـــــە بـــێ نازيـــان!!!

بـــەش بـــەشی کردن، بەم پێ یە!
وتـی: جـــارێ ئێـرە و جێ یە!!!

بـــەو شێوە، موغریزانـــە و ورد
ئـــەنجـــامی دەدا قڕانـــی کـــورد

ڕژێمـی حیـزبـی بـەعسی فاشست
جـــەهەننەمـــی بـۆ کـــورد داخست

دایڕشتن پیـلانـــــی نـــــەگـریس
ڕاگـــواستن، تـــەعریب و تـەبعیس

وێرانـکـردنـــی دێ و شـــــــاران
ئـــەنفـــال و کیمیایـــی بـــاران

گـرتـن، کـــوشتن و دەرکـــــردن
لـــە درداران و زەنـــدەق بــــردن

لـــە پێش چـــاوی گـەورەهێزان!
کـــوردی خستە گـــــــەلاڕێزان

بـــەڵام تەقدیر لەگـــــەڵ تەگبیر
گـــەلێک جـوێـن و تێدەگـــا ژێر

(خـــــوا)یه، ئومێدی چـەوساوان
پووچـــــەڵ دەکـــاتەوە داوان

* * *

بــەعسی عەفلــەقی بــێ بــڕوا
پێی وابوو، هـــەروای بۆ دەڕوا!!

هێندە گـــەمژە و سەرەخـــەر بوو
لە خـــەشمی خوا، بێ خەبــەر بوو

تــاکــو لــە (پێنجی ئـــــازار)ا
راپــــــەڕینێک هــاتــە ئـــارا

بورکــانــی رقــی میللـــەت بوو
کۆتـــایـــی دیلـــی و زیللــەت بوو

لـــەو رۆژەدا شـۆڕش و گـــەل
یــەک دەست، دوژمنیان خستە تــەل

تـــورەیـــی خـــودا نــازڵ بوو
رۆژێک بـــوو، بــە کامی دڵ بوو

بوو بــە هــەڵمەتی بــەعسی قڕان
دەستــەڕەشـــەکان لــە بــن بڕان

وڵاتیان لـــێ خـــــاوێن بـۆوە
زوقم و سـەرمـــــای ستەم چـۆوە

بەهـــاری ئـــازادیی خـــەملّـی
هیوامـــان نـــەبردە ژێر گڵــی

بــە سۆزو بــەزەیی (بـــاری)
بـــەخششی ئـــازادیی بــاری

ڕۆژی ڕزگــارییمان هـــــەڵات
ئاوایـــــە شۆڕش و خەبـــات!!!

میللـــەت کەوتـــە شادیی و خۆشیی
کوردســــــتان بەرگی نوێی پۆشی

قــــەڵادزێ و پشدەر ســــەرلەبەر
تـاجی سەروەرییان نایـــە ســـەر

ئـــــاوابوونـــەوە ســـــەرلەنوێ
پشدەری ئێستا، جوێ یـــە، جوێ!!

ئێستا خوایـــە و خـــاک و خۆمـان
خوایـــە، بــەرقەراربـێ بۆمــان!

خوایـــــــە، هــــەر ئەتۆ شایانی!
حـــــەمد و سـەنـــای بـێ پایانی

بۆ ئـــــەم بـــەخشش و خـــەڵاتە
کـــە بـــــەرزی گــەل و وڵاتە

* * *

قەلادزێ، ئەی شاری دلێرا!
شەیدای ڕەسەنایەتی و خێر

سۆز و ورە و خواپەرستیی
سیماتن، لە خراپەش پەستی

ورەت کێو دێنێتە لەرزە
(مامەندە) بە تۆ سەر بەرزە

(ئاسۆس) بەتۆوە دەنازی
تۆ پڵنگ و هەڵۆ و بازی

(بلفەت) لە خۆشی تۆ خەنی
خۆیی و بنار و بەندەنی

(قەندیل) لە تۆ و ئەتۆش لە ئەو
بەهرە وەردەگرن ڕۆژ و شەو

(کێوەرەش) لەو نزمی و دوورە
بە تۆ بڵند و ڕووسوورە

لەگەڵ (ڕانیە)دا قۆڵ لە قۆڵ
خەمی گەلتان ناوەتە کۆڵ

تۆ دەستـەخوشـــکی (هەڵـەبجە)[1]ی
لێک دانـــابڕێن تا هـــەیە و هـــەی

بـــە هۆی مـــەزڵومیی و کارەسات
بوونـــەتـــە ناسنامـــــەی وڵات

* * *

پشدەر تۆیـــــە و ئـــەتۆش ئـــەوی
یـــــەک هێمان، یـــەک ئاو و زەوی

دوانـــــەیـــــەکـی دەستـەمـلانـن
نامـــــــەخوا پێکـــــەوە جـوانن!!

رووبـــــــار و کانیی و سەرچـــاوە
ئـــــــــاوەدانیـــیان پێـــتان داوە

هـــەر لـــە (گارفێن)[2]ەوە، کـــەوا
بـــــــەفـــراوە، شیفایـــــــە و دەوا

هەتـــــاکو دەگـــــاتە ئـــــەوپـــەڕ
هـــــەمووی جوانییە و پیت و فـــەڕ

---

[1] جگـە لـە کارەسـاتی کیمـایی بـارانی ١٦/٣/١٩٩٨، لـە ٢٦/٤/١٩٧٤یـش وەك قـەڵادزێ لەلایەن رژێمی بەعسەوە بۆردومان کراوە.

[2] رووبارێکە لە قەندیلەوە سەرچـاوە دەگـرێ و بـە خۆرئـاوای سەنگەسـەردا دێتـەخوار و لـە دەربەند تێکەڵاوی زێی بچووك دەبێتەوە.

بنـــــاره و بنــــــار دێــهاتــن
بۆیــــــه ســـــــەرتۆپی وڵاتـن!

هەر ناوچە  و هەرلا و خەت و قۆڵ
لـــــه (پیران)[١]ەوە، تــــــا (قندۆڵ)[٢]

لـــه (زەڵـێ)[٣]وە، تا (ســـــندۆلان)[٤]
لـــه ڕووی داگیرکــــــەران پۆڵان!

لـــه ڕووی بـازرگانییش دیــــاره
ڕێی (گەناو)[٥]، (سونێ)[٦]و (سالاره)[٧]

---

[١] پیران یاخود پیرانان، گوندێکه له گوندەکانی دەڤەری پشدەره رەقـەی سـەر بـه ناحیـەی سەنگەسەر و له دۆڵێکی دوورەدەست و چڕ و دارستاناوی دایه.

[٢] گوندێکـه دەکەوێتـه ئەوپـەڕی رۆژهـەڵاتی قـەڵادزێ و لەگـەڵ گونـدەکانی (هـەرزنێ و ئەشکان)ی ناوچەی (ئالان)ی سەردەشتی رۆژهەڵاتی کوردستان هاوسنووره.

[٣] گوندێکه هاوسنووره لەگەڵ ناوزەنگ و نۆکان و دۆڵی قاسمەڕەش.

[٤] گوندێکه له خوار قەڵادزێ لەسەر زێی بچووك.

[٥] گوندێکـه دەکەوێتـه رۆژهـەڵاتی قـەڵادزێ و خـەتێکی نـاڕەسمی و سـنووریی بازرگانیی یه و فرۆشگاکەش له گوندی (قندۆڵ)ە.

[٦] گوندێکه دەکەوێته دامێنی چیای مامەنده و خەتێکی ناڕەسمی و سنووریی بازرگـانیی یه و فرۆشگاکەش له گوندەکانی(شێنێ و زەڵێ)یەو به قاسمەڕەشەوه دەبەسترێتەوه.

[٧] ڕێیـەکی ئاچـوغی بازرگـانی یـه و دەکەوێتـه پـشتی قـەڵادزێ و بـه گونـدەکانی (دارەشمانه و گیره) و شـاخی سـالارەدا تێدەپـەڕێ و قـەڵادزێ و سەردەشـت بەیەکـەوه دەبەستێتەوه.

چەندانی دی جادە و پیادە
دەڵێی بازاڕی ئازادە!!

* * *

قەڵادزێ، ئاوات هێناوە!
زۆرت بەخشی لەو پێناوە

وا کاروانەکەت سەرکەوت
گزنگی خۆرت دەرکەوت

سەیری سوڵتەی ورد و خاشی!
رژێمی بەعسی رەفتار فاشی

کوا هێز، کوا سامان، کوا خۆیان!؟
کێ توانی بێتە پشت بۆیان!؟

سەیری قەتارەی دەستکەوتان!
ئیتر توڕدەن خەم و خەوتان

بۆیە قەڵادزێ وریا بە!
هەر سوپاسگوزاری خوا بە

بەعسی خستە ژێر پێتەوە
نەکەی خوات لە بیر چێتەوە!

* * *

هەرکەسێکیش کاربەدەستە
ئەگەر خزمەتی مەبەستە!

دەبێ ئــەم شـــــارەی لــە بیر بێ
دۆستی هـــــــەژار و فـــەقیر بێ

دووربێ لـــــەخراپــە و لە خیانەت
تخونی ستەم نەکــــــەوێ قـــەت

پـــاک و دڵسۆزبێ و بە چـــاوێک
بۆ هـــەموو جــەرگ سووتـــاوێک

بۆ هـــــاووڵاتی ئـــــەم خاکـــە
پێشکــــــەش کا خزمــەت و چاکــە

تەنها پــاکــی و دادپــــــەروەریی
دەبنە دەستمایـــــە و ســـــەروەریی

* * *

تا گیانی شــــــەهیدان شـــاد بێ!
تا هــەمیشە کـــــورد ئـــازاد بێ

تا دوور بین لـــــە کارەســـــاتان
نـــــەپرژێینەوە وڵاتـــــــان!

دەبێ یــــــەکریـزیی و تەبـــایی
بکەینــە هێمـــا و رێنـومـــــایی

# هەرەسی دیکتاتۆریەت

مانگی ٤ی ٢٠٠٣

سی و پێنج ساڵ بوو
دەسەڵاتی
تاقمێک شەقاوە و شەللاتی
لەم نیشتیمانەدا زاڵ بوو

سی و پێنج ساڵ بوو
هەنگوینی هەنگی (قەندیل و
سورەدێ[1] و پشتاشان)[2] تاڵ بوو

سی و پێنج ساڵ بوو
لەم نیشتیمانە سوتماک و خوێنینەدا
کزەی جەرگ و
ناڵە و نوزەی سەرەمەرگ و
کڕوزانەوەی هەتیوی بێ نان و بەرگ
لەشوێن شادیی و
لەشوێن دڵنیایی و ئازادیی و
لەجێی بزە و گڕوگاڵ بوو

---

[1] گوندێکە دەکەوێتە بناری قەندیل و سەر بە ناحیەی سەنگەسەرە.

[2] گوندێکە دەکەوێتە بناری قەندیل و سەر بە ناحیەی سەنگەسەرە، هەنگوینی ئەم گوندانە و گوندەکانی دەوروبەریان بەهۆی زۆری باغ و باغات و شینایی و گیا کوێستانیەکانەوە، نایاب و بەناوبانگە.

سی و پێنج ساڵ بوو
هەموو وەرزێکمان زستان و
چیرۆکی گوێ ئاگردانمان
بۆردومان و
زیندان و کیمیاباران و
راگوێزان و لەداردان و
بەناو ئەنفال و سوتان و
کوشت و بڕو
کۆچ و دەربەدەریی و قڕان و
ئەشکنجە و زیندەبەچاڵ بوو

سی و پێنج ساڵ بوو
فرمێسکی چاوی وەنەوشەو
کانیی و تاڤگە و کوردستانم
خوێنی ئاڵ بوو

سی و پێنج ساڵ بوو
کورد لەزێد و نیشتیمانێ دا، غەوارەو
غەوارەیەکی غەدداریش
خاوەن ماڵ بوو!!

سی و پێنج ساڵ بوو
جیهان لەئاست
ئەم تاوان و تاوانبارانەدا
لاڵ بوو!!!

هەتا بە ویستی خوای مەزن
زەواڵێک لەئاستی زاڵم
لەگەڵ رقی میللەتێکی تینووی ئازادیی و سەرکەوتن
لەگەڵ گڕی شۆڕشێکی
هاوڕێی باوەڕ و سەرکەوتن
کەوتەکارو
دۆستێک لەدۆست
بوو بەدوژمن!!

(بۆش) ێک پڕ بوو!!!
گەورەهێزێک
سەد هێندەی تر
هار و دڕ بوو!!
لەناوچوونی دیکتاتۆرێک
خاڵی هاوبەشی دوو هێڵی یەکتربڕ بوو!!

لەپڕێکدا
لەشاڵاو و لرفەی بوڕکان و گڕێکدا
دەسەڵاتی سی و پێنج ساڵەی
بەعسی مل هوڕ
بوو بە دوکەڵی ئاسمانی
بابەگوڕگوڕ

لەپڕێکدا
لەشاڵاو و لرفەی بوڕکان و گڕێکدا
(سەددام حوسێن)ی تاوانبار
زاڵم و زۆردار

بۆ دوایین جار!!
لەسەر تەخت
تەختێکی ئەستەم و سەخت!
فڕێدرایەخوار
ئەمجار سەرۆکی فەرماندەو
سەرۆک کۆمار!!
پاڵەوانی (عڕوبە) و(قائیدول ئوممە)[1]!!
هەڵایسێنەری کۆمەڵێک جەنگی خوێناوی و کاولکار،
بوو بەفیرار!!
بوو بەجرج و
شەمشەمەکوێرەی کونجی تار
بوو بەنێچیری راوشکار!!

لەپڕێکدا
لەشاڵاو و لرفەی بوڕکان و گڕێکدا
(سەددام حوسێن)ی چەوسێنەر
لەبناهوونی
حەشارگەیەکی تاریک و تەسک و تەریک
هێنرایەدەر
بەسەر و ریشێکی ئاڵۆز
روویەکی رەش و پەست و پۆز
بۆ هەموو دنیا رانوێنرا
دوای ماوەیەک پشووی نێو باوەشی زیندان
بەخۆیی و دارودەستەوە

[1] بەعسییەکان تا (٩٩) ناویان لە سەددامی دیکتاتۆر نابوو و نازناوی سەیر و عەنتیکەیان بۆ دادەنان! ! !

بەو زەعامەت و هەستەوە!
خرایەنێو قەفەزی دادگای تاوانەکان
خرایەنێو کۆزا!
دادگایی کرا!
لە(تەخت)ەوە، بەرەو تەختێکی دیکە برا!!
پەتی سێدارەی بۆ هەڵخرا
سەرەنجام لەسێدارەدراو
کەوتەبەر غەزەبی خودا و رقی پیرۆز
سەڵتەنەت و سوڵتانی سی و پێنج ساڵ تاوان
کۆتایی هات و بوو بەتۆز!!
بوو بەگۆنای ماچی دەمی نووکی نێزە
دەسا خوایە!
چی سەنا و ستایش و رێزە
هەر شایانی
تۆی کاربەجێ و تۆڵەستێن و دانا و بەتوانا و بەهێزە
چەند بەخششێکی گەورەیە!
کوردستانم!
پڕشنگی خۆری ئازادیی لەئامێزە
دەسا وەرن
هەنیە بخەنەسەرخاک و
سوجدەی شوکر بۆ خوا بەرن
لەشوێنی قوڵپی گریانمان
قوڵپی کانیاوی رزگاریی و
خوڕەی زەمزەمی کارێزە
خەون نییەو
کەرنەڤاڵی هەرەسی دەسەڵاتێکی،
دیکتاتۆر و شەڕانگێزە!

ئەمە وانە و پەنددادانی
خوێنخۆرانە
نقورچە و راچڵەکاندنی
زۆردار و دیکتاتۆرانە
کە هەرکێن و
لە هەر دەوران و رۆژگارن
لە هەر شوێنێ
لە ناو هەر کۆشک و پۆشاک و جێگە و نوێنێ
پادشا و سەرۆک کۆمارن
خاوەن هەرچی
چەک و سوپای زۆر و هارن
لە ئاست خەشم و تۆڵەی خوادا
لە ڕووی زەبر و گرتنی خوای بەتوانادا
وە کو گەڵای وەریوی گەڵاڕێزانن
لە ئاست گێژەڵوکەی (با)دا

## خۆشەویستیی

## ( خۆشەویست ﷺ )



خۆشەویستی (خۆشەویست)، نامیلکەیەکی شیعری ٩٨ لاپەڕەیی بوو و ئەم شیعرانەی دەنێوخۆ گرتبوون، بە سوپاس و ڕێز و پێزانینی زۆرەوە ساڵی ٢٠٠٩ لەلایەن (نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن) لە هەولێر چاپ و بڵاوکرایەوە، کە لە تایپی (دانا ئەحمەد)و نەخشەسازی ناوەوە (شنۆ حمدامین)و نەخشەسازی بەرگ (امین مخلص)و خەتی (نەوزاد کۆیی)و تیراژی (١٠٠٠) دانەو ژمارەی سپاردنی ( ١١٨٣)ی ساڵی ٢٠٠٩ی کتێبخانەی گشتی سلێمانی بوو، لێرەشدا پەراوێزی پێویستی بۆ دانراون.

## پێشکەش بێ بە:

هەموو ئەوانەی بەزەمزەمی خۆشەویستیی (خۆشەویست ﷺ) دڵ و دەروونیان دەشۆن و، تەنها بەڕاستە ڕێی ئەودا دەڕۆن و، مشووری سەرکەوتنی پەیامەکەی دەخۆن.

# خۆشەویستیی ( خۆشەویستﷺ )

چەپکێك وشەی ئاونگیی
کە بە ملوانکەی  شیعرەوە هۆنراونەوە
لە خۆشەویستیی (خۆشەویست)
دەخوێنمەوە
پەپولەی خۆشەویستیی ئەو
لە هەر کوێ بێ
بە شوێنیەوەم
لە هەر کوێ بم
بە شوێنمەوە
مەپرسن بۆ
دەمێکە خۆشەویستیی ئەو
بەندە بە سورِی خوێنمەوە

خۆشەویستم
دێم و بەخۆم و زەینەوە
خوێن و خامە
وشە و دەفتەرو هەڵبەستم
گیان و سەرم، ئەی سەروەرم
دەستە و نەزەر لە خزمەتتا ڕادەوەستم
دەستی بەیعەتت دەخەمە نێو دەستەوە
دەستی میهرو موحیببەتت

بفەرموو بخە نێو دەستم
من موئمین و مەئمومێکی گوناهبارم
لە خزمەتی تۆی ئیماما
نوێژی تەوبەیەکی نەصوح
لە حزووری زاتی خوادا، دادەبەستم
خۆشەویستم
هەموو چرکەیەك گوێم لێ یەو
پێم دەفەرموی: من دڵسۆزترینی کەستم
پێم دەفەرموی: خەنیم لە ڕاستەڕێ بوونت و
لە لاڕێیی و سەرکەشی و تاوانبارییشت
یەجگار پەستم
خۆشەویستم
من لە خۆشی خۆشەویستیتە وامەستم
لە خۆشی خۆشەویستیتە
دڵم دەفڕێ
هەناو دەگڕێ
تیغی ئەوین
یەك بەیەکی دەمارەکانم هەڵدەبڕێ
ئاوازی بێداریی دەچڕێ،
هۆش و هەستم
خۆشەویستم
کوردستانم
پەیامی تۆی لە باوەشە

کوردستانم
سیمای بە سیمای تۆ گەشە
بست بە بستی خاك و زێدی نیشتیمانم
هەناسەی تۆی
شەماڵی ژیانەوەی گیان و
ئاونگی سۆزو تاسەی تۆی
بارانەی ژیانەوەی لەشە
رەنگی گەرمیان و کوێستانم
بێ، ڕەنگی تۆ
یەکپارچە شەوگاری رەشە
دیرۆکی سەروەریی و ژیانم
بێ، سەنگی تۆ
لە هەرچی سەنگە، بێ بەشە
تاڤگە و ڕووبارو سەرچاوەو
کارێزی زوڵاڵ و جوانم
هەرکامێکیان
بێ، هاژە و خوڕە و دەنگی تۆ
ئینسان نازانێ هەر هەشە !
خۆشەویستم
لەم خاکەدا
هەرچی شاخ و چیای سەر بڵند و سەرکەشە
بێ بەرزی تۆ
نزمتر لە (تەپۆلکە)شە

خۆشەویستم

لە دەورانی ڕەشترین سات و سەردەما

لە شەوگاری ئەنگوستەچاوی ستەما

لەوساتانەی مرۆڤایەتی

نرخ و ڕێزو سەنگی نەما

لەدایك بووی . . .

خۆشەویستم

لەدایكبوونت بەهاری

سۆزو بەزەیی و پەرۆشە

لە دایكبوونت هاواری

شۆڕش و هەوڵ و خرۆشە

لە دایكبوونت هەڵاتنی

گزنگی خۆری ئەبەدی هیدایەتە

لە دایكبوونت مزگێنی و

مژدەی بەختیاریی ئینسانە لە سایەتا

........

خۆشەویستم

ئەی پێغەمبەر!

ئەی گەورە و سەردارو سەروەر

پێشەوا و پێشڕەو و ڕابەر

تۆی خۆشەویست

ناڵە و نزولە و هاواری

تێکڕای چەوساوانت دەبیست
تۆی خۆری هیدایەتی حەق
ڕۆشنبوونەوەی سەراپای  تاریکاییەکانت دەویست
تۆ ئەو پێشەوا و پێشڕەوەی
چەپکێك گوڵی سەدە و زەمانی زێڕینە
بوویە هەڵگری پەیامێك
وێڕای تەقەللای نەمان و بوغزو بەرپەرچدانەوەی
بێ پسانەوە
بێ ترس و تێڕامانەوە
بەبێ لە خەیاڵدابوونی، گەڕانەوەی
دەڕواو لەبەرە و پێشچووندا
ڕەوتی کاروان و ڕەوڕەوەی
ڕەوتی کاروان و ڕەوڕەوەی
........
خۆشەویستم
هەرچەند ڕێگات سەخت و هەڵدێرو عاسێ یە
کەچی سات لە ساتێ چاتر
پێت بەگوڕترن لەم ڕێ یە
خۆشەویستم
ئەتۆ نوور و تەوحید و ڕەحمەتت پێ یە
کەچی (جەزیرەتول عەرەب)
هەزاران (ئەبو لەهەب)و
(کەعبەتوڵڵا)ش

(سێ سەد و شەست) بتی لێ یە
خۆشەویستم
ئەتۆ هیدایەتی خواییت لە ئامێزە
پڕی سینەت
سۆز و خۆشەویستی و ڕێزە
کەچی (ئەبوجەهل)ی دێزە
لوتی لەتەوقی ئاسمانەو
سەریشی بۆ(لات)و (عوززا)[1] لە عەرزێ یە
ئەمە مێژوو
مێژووی پێشوو و ئێستا و ئاییندە و داهاتوو
وا تێمەگەن ئەم ململانێ یە، نوێ یە
چاوتان تیژو ورە پۆلاً و ڕێگاش ڕۆشن
ئاشکرایە سەرەنجامیش
سەرکەوتنی هەتا هەتایی، بۆ کێ یە ! !
........
خۆشەویستم
تاڤگەی میهرەبانیی خوایی
خەرمانی نوور و ڕۆشنایی
ئاوازی بەسۆزی مارشی
ئاسودەیی و دڵنیایی
ئەی هەوێنی

[1] دوو بتی گەورە بوون و هاوبەشدانەرانی مەککە دەیانپەرستن.

ئاشتیی و برایەتیی و تەبایی
ئەی سەر قافڵەی ژینی دونیا و ڕۆژی دوایی
ئەوەی زمانی بە ناوی پاکی تۆ نەپژێ
ئەوەی سینەی، هەوای کوێستانت هەڵنەمژێ
ئەوەی لە پڕشنگی نووری دەستووری تۆوە وەرنەگرێ،
ڕێنوومایی
تاهەتایە
دەتلێتەوە
لەناو زۆنگاوی گومڕایی
........
خۆشەویستم
ئەی ڕەونەقی جەرگ و هەناوی (ئامینە)[1]
ئەی مزگێنی
شەبەقی چاوی (عەبدوڵڵا)[2]
ئەی گەنجینە و هەتاوی ماڵی (حەلیمە)[3] و
پاکترین هەناسەی سینە
ئەی هاوەڵی، مێرد منداڵیی، دوانزە ساڵیی، (ئەبو تالیب)[4]

---

[1] ئامینەی کچی وەهەب – دایکی پێغەمبەرمان (موحەممەد)ﷺ

[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول موتەلیبی کوڕی هاشم– باوکی پێغەمبەرمان (موحەممەد) ﷺ

[3] حەلیمەی سەعدیە، ئەو ئافرەتەی شیری داوەتە پێغەمبەرمان (موحەممەد)ﷺ

[4] ئەبو تالیب مامی پێغەمبەر بووە، دوای وەفاتی عەبدول موتەلیبی باپیری، ئەو سەرپەرشتی کردووە.

باوەڕپێکراوی (خەدیجە)[1] و
خاڵیی لە زەهرەی خیانەت و بوخل و کینە
ئەی لاوی دامەزراوی
زرینگ و بەزیپك و گورج و گۆڵ
ئەمینداری
کۆمەڵگایەکی گەندەڵ و هێڕو هڕۆڵ
خاکەلێوەی تێڕامان و
وردبوونەوەی تەنیایی ئەشکەوتی (حیراء)[2]
دڵی بێدار
ئەی تروسکایی هەقیقەتی بەردەم هەزارەها داهۆڵ
گوڵدانی دەستی حیکمەت و وەحی و (إقرأ)[3] و (جوبرەئیل)
تاڤگەی بەفراوی بەزەیی و
چاوی خۆرو
دەستی سپی  و سۆڵ
پەیڤە نەرم و نوورانیەکانی بانگەواز
ڕێکخەری کۆبوونەوەکانی ماڵی (ئەرقەم)[1]

---

[1] خەدیجەی کچی خوەیلد، خوای لێ رازی بێ، پێش ئەوەی ببێ بەیەکەم هاوسەری پێغەمبەرمان (موحەممەد)ﷺ ، ئافرەتێکی دەوڵەمەندو بازرگان بوو و پێغەمبەرمان بۆ ئەو بازرگانی دەکرد.

[2] ئەشکەوتی حیرا دەکەوێتە چیای نوور لە مەککە، بۆ یەکەمجار لەوێ سرووش بۆ پێغەمبەرمانﷺ هات و پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (العلق)ی بۆ دابەزین.

[3] (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) سورەتی العلق – ١.

سیاسەتمەداری  کارامە و سەرڕاست و بە جموجۆڵ

گەمارۆدراوی گەمارۆی

هەمەلایەنە و سێ ساڵەی، نێو شیو و دۆڵ

ئەی میوانی بەردبارانکراوی دیوانی

خانەخوێ یە، خوێن تاڵەکانی (تائیف)[2] و

گەشتیاری گەشتی (ئەقسا)و ئاسمانەکان و شەورەوی

هاورێی (بوڕاق)[3]ی توندوتۆڵ

ڕابەری ورە و متمانەو

نزای (شاهت الوجوه)[4] و پرژانی خۆڵ

بەوری سەفەری هیجرەت و ئەشکەوتی (سەور)[5]

بیابانی چۆڵ

---

[1] کە ژمارەی مسوڵمانان بوو بە (٣٠)کەسێك، پێغەمبەرمان)ﷺ لە ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم) لە مەککە بە نهێنی کۆیدەکردنەوە و فێری ئیسلامیی دەکردن.

[2] تائیف، لە پەنجا کیلۆمەتری شاری مەککەیە و یەکەمجار (پێغەمبەرمان)ﷺ لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا کۆچی بۆکرد، بەلام لەوێ زۆر نامرۆڤانە لەگەڵیدا جولانەوە و ئازاریان داو دەریانکرد.

[3] بوڕاق، ئەو ئاژەڵەی (پێغەمبەرمان)ﷺ لەگەشتی شەورەوی و بەرزبوونەوەدا لە مەککەوە بۆ بەیتول مەقدیس و بە پێچەوانەشەوە، سواری ببوو لە ساڵی دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتی دا.

[4] شاهت الوجوه، واتە: ئەو ڕوانە ڕەش و ریسوا بن، (پێغەمبەرمان)ﷺ لەکاتی جەنگی بەدری گەورەی ١٧ی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی دا، ئەم دوعایەی لە کافرەکان خوێند.

[5] ئەشکەوتێکە لە دەرەوەی مەککە، (پێغەمبەرمان) ﷺ لەکاتی کۆچدا لە مەککەوە بۆ مەدینە، سەرەتا لەگەڵ (ئەبوبەکری صدیق) لەوێدا خۆیان پەنادا.

ئەندازیاری یەکەم دەوڵەتی (مەدینە)
وەرزی برایەتی و تەبایی،
توێنەرەوەی شەختە و سەهۆڵ
بەهێزترینی فەرماندەی جەنگ و ئاشتی
جوامێرترینی سەرکردە،
کاریگەرترین ئینسان و
ئەی خاوەنی جوانترین ڕۆڵ
ساتێك بە نێو چخوردی جەنگەڵدا هاتی
ساتێك لەنێو، دڵی بەردینی شەوی جەهلەوە هەڵهاتی
لەگەڵ شنەی ژیانەوەدا
چاو لە چاو بووی و قۆڵ لە قۆڵ
خۆشەویستم لەو کاتەوە
خەمی هەموو مرۆڤایەتیت ناوەتە کۆڵ! !

خۆشەویستم
دوێنێ، زریان لە دوای زریان
خەزەڵوەرو پایزی گیان
دوێنێ، گریان لە دوای گریان
داباریني فرمێسك لە چاوان بەکوڵ
وەرینی گوڵ
حەزینیی دڵ
تۆرانی بزەی لێوی ژیان
دوێنێ، دەمدی ئەملا و ئەولام

هەموو(حەزیا)ن

هیواو حەزیان

بەسەرما داباراندنی

مەرگ و زیندان و کەلەپچە و وەیشومە و زیان

بەلاّم ئەمڕۆ لەگەلّ دوێنیّ

لە ڕووی ناسۆر و ئێش و ژان

تەواو لێك جیان

ئەمما سات و هەناسەکان

لە ڕووی ورە و هیوا و بڕوا

سوپاس بۆ خوا

هەموویان (چیا)ن

........

خۆشەویستم

دەمانەویّ

دەست بە بالاّی

خۆشەویستیی تۆوە بگرین

دەست بە بالاّی

ئالاّی والاّی، تۆوە بمرین

خۆمان و ژیان

خۆمان و گەل

خۆمان و خاك

وەك گەلاوێژی ئاسمانی سامالّ و پاك

ئاسۆی جوان و گەش و ڕووناك

درەوشاوە بین
لەم سەفەرە خێرایەدا
ڕێبوارێکی دڵ بێدار و حەساوە بین
لە جیات ئەوەی
دیل و پەست و چەوساوە بین
هەموو لامان
دەستەملانی گەردنی کێلی ئازادیی و
ئاوەدانیی و سەروەریی لێوەشاوە بین

خۆشەویستم
من لێرەوە
لەنێو تریفەی خوێنی گەشی شەهیدانی دلێرەوە
لەنێو جەولەی
پێشمەرگەی (قەلاّتووکان)[1] و
(مەلەکان)[2] و (قەرەداغ)[3] و (شلێر)[1]ەوە

---

[1] گوندێکە لە بناری قەندیل و سەر بە ناحیەی سەنگەسەرەو ۱۹۸۷و۱۹۸۸ بارەگاکانی هێزی (حەمزە)ی بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەوکاتی لێبوون.

[2] گوندێکە لە ناوچەی خۆشناوەتی و سەر بە قەزای ڕەواندزێ یەو ۱۹۸۷و ۱۹۸۸ بارەگاکانی هێزی (شافیعی)ی لێبوون.

[3] ۱۹۸۷و۱۹۸۸ بارەگاکانی هێزی (قەرەداغ) ، کە دواتر ناوەکەی بۆ (فاروق) گۆڕدرا، لەگەڵ کۆمەڵێك مەفرەزەی چەند هێزێکی دیکەی بزووتنەوەی ئەوکاتی لێبوون.

لەنێو ڕیزی
زانا و لاوی ئیسلامخواز و جوامێرەوە
لەنێو دەریای شەرم و شکۆی
ئافرەتانی ڕەوشت بەرز و بوێرەوە
لەنێو چاوی
خۆر و مانگ و ئەستێرەوە
لەنێو زێدی کوردستانی،
پڕ لە جوانیی و
کانیی و تاڤگە و زەنوێرەوە
لەنێو هەگبەی ژان و ناسۆری ئەم هەموو
فێڵ[1] و پیلان و گێچەڵ و تاوێرەوە
لەنێو ئەم ژینە پڕ تاڵیی و
سوێریی و کۆسپ و هەڵدێرەوە
لەنێو مینبەر و میحرابی
مزگەوتەکان و منارەی (شێخی چۆڵ)ی هەولێرەوە
لەنێو سیما نوورانیەکانی ئەم کۆڕە،
پڕ خێرەوە
هەزارەها دروودی خوات پێشکەش دەکەم
تۆش خۆشەویستم بفەرموو جارێکی تر

---

[1] ١٩٨٧و١٩٨٨ بارەگاکانی هێزی (خالید)ی سەر بە بزووتنەوەی ئەوکاتی لێبوون و کۆنگرەی چوارەمیش هەر لە گوندی (برالەی) سەر بەو ناوچەیەی قەزای پێنجوێن لە بارەگای هێزی ناوبراو لە ٦-٨/٦/ ١٩٨٨ بەستراوە.

بڕیار و ڕاسپاردەکانت

بۆ ئەم کۆمەڵ و کاروانە، بنێرەوە

جارێکی دی

ئەم کۆمەڵ و کاروانە  پڕ لە سەروەرییە

بۆ پابەندیی و فەرمانبەریی و بەردەوامی،

ڕاسپێرەوە

........

خۆشەویستم !

هەرکەس دەستی

لە دەستی کافورییت بەربێ!

دەمی لە دەمی کەوسەری موحیببەتی تۆ بێتەوە

دڵی لە ئامێزی دەریای

میهر و ئەوینی تۆ دەربێ !

لەگەڵ دێمەکاری شەڕدا کۆبێتەوەو

وەنێو پاوانی گوناه وەربێ!

چاوی لە پڕشنگت نەدیو!

پێی لە شوێن پێکانت هەتلە!

هەڵوەدایە...

سەوداسەری، بێ ئەرزشترین سەودایە

چاوی لە چاوی خەودایە

دەستی لە دەستی شەودایە

هۆشی بێ هۆش، ئاوەزی بێ شەوق و شەقڵە

سەرەنگرێ یەو

بەنێو عاسیێ و هەڵدێری خەڕەندی ژینا
سەرەوژێر بە ناڵە و تەقڵە
لەولاشەوە
لەسەر ئەم سەودا، کەم مەودا و بەلاشەوە
شەیتان لێی دەداتە فیکەو
قاقای پێکەنین و چەپڵە!
........
خۆشەویستم !
وەك ئەستێرە
بە شوێن خۆری خۆشەویستیتەوە دەکشێم
هیچ بەربەستێك
هەرچەند تۆقی ڕق و غەزەبم لەمل کا
ناتوانیێ هەنگاوم شل کاو
لە ئەوینی پاکت وەکشێم
ناتوانیێ تیغی باوەڕ و ورەم کول کا،
پرشنگی تۆ، بزرکا لێم
........
خۆشەویستم
بە شوێن پەیام و پێتەوە
بە شوێن ئەو شەوقەی پێتەوەو
نورە و لە نوور دەبێتەوە
رێبواری سەوداسەری ڕێم
بە ویستی زاتی بیێ هاوتا

به ئیشتیاقی ئەو نوورەی وا، لەنێو چاوتا
لە دەر و دەروون و ناوتا
هەردێم، هەردێم
لە خۆشیانا شاگەشکەم و
وەکو سەفای کەروێشکەی قەرسیلی وەردێم
جێم مەهێڵەو
دەپرسی کێم! ؟
ئەویندارێکی (عاصی)یم و
هاکا لە دەریای تاوان و خەجاڵەتیدا دەخنکێم
ئومێدێکە و بە ئیزنی هەق
شەپۆلێکی شەفاعەت دێ و
منیش دەردێم
شەپۆلێکی شەفاعەت دێ و
نەوەك لە (دێم)
یاخود سەحرا
لەمەولاش هەر لەنێو بەحرا
لە بەحری نوور
دەستەملانی ژینێکی نوێم
ئومێدێکە و بە ئیزنی هەق
بە دیداری تۆ دەگەم و
نۆشی کەوسەرت دەکەم و
لەخۆم خەنی و لە خەم جوێم و
جەنناتە جێم

# قەندیل لە ڕێپێوان دا

ئازاری ٢٠٠٧

ئێستا قەندیل
بورکانی ڕق و تورەیی
بۆتە (دیجلە)و (فوڕات)و (نیل)
ئێستا قەندیل
بەدەم هاوار و هوتاف و درووشمەوە
بۆ ڕێپێوان، ڕێگا دەبڕیٚ بە سەدان میل
ئێستا قەندیل
پێمان دەڵێ :
کێ لە ڕاستیی و ڕەسەنایەتیی و ڕەوشت و
مزگەوت و منارە و مەندیل
بۆتە میکرۆبی ئایدزو
ئەنفلۆنزا و شێرپەنجە و سیل !
ئێستا قەندیل
هاوارێکە
وەک گرمەی هەوری بەهاران
پەیامێکە
وەک بانگی مزگەوتەکانی لادێ و شاران
شاسوارێکە

دەستی بەیعەت و بەڵێنی
خستۆتەناو دەستی پێغەمبەر و یاران
زریانێکە
بۆ سەر تەونی بیری بۆش و
رق و کینەی نەیاران و ستەمکاران
هەورێکی یەکجار تورەیەو
هەموو زمان و دەم و دڵە بوودەڵەکان
سوکایەتی سوکەڵەکان
دەکا ڕیسوا و نەفرەت باران
قەندیل دەڵێ :
من و کوردستانی دایك
بۆ تۆ، پێغەمبەری سەروەر!
بۆ تۆ، پێغەمبەری رابەر
هاوار دەکەین
بەڵێ، بەڵێ
قەندیل دەڵێ:
ئێمە هەموو
هاوار دەکەین پڕ بەگەروو
ئەی ئەوانەی
بوونە جرج و سن و زەروو
بوونە باشوو و کوندەپەپوو
کەی خۆر خامۆش دەبێ بە فوو!؟
کەی کەڵ مەرزەم دەبێ بە موو!؟

ئێوەی خاوەن هۆشی بۆش و
زەینی ئاڵۆز و ئاوەژوو
ئێوەی دڵ ڕەش
دڵنیابن
لە ئاستی منی قەندیلی بەرز و سەرکەش
لە ئاستی ڕەسەناتیەتیی کوردستان و
پڕشنگی خۆری گەرم و گەش
درەنگ، یا زوو
دەبنە خۆڵەمێش و ڕەژوو

# شەوڕەوی

شەوڕەوی یەو ئەوە (موسا)

لە نێوانی دوو بەرداشی (نیل)و لەشکری فیرعەونا

لە واقیعا، نەك لە خەونا

بە بیابانێك تەوەككول و

كێوێك بڕوا و یەقینەوە

ڕێ تەی دەكا...

شەوڕەوی یەو

لێرە شێوازێكی ترە

نە ڕووبارە و نە لەشكرە

نەسات و سەردەمی (موسا)و

نە خنكان و لەنێوچوونی، فیرعەونی یاخی و كافرە

وا (موحەممەدول موستەفا)

لە (مەسجیدول حەڕام)ەوە، بەرەو (ئەقسا)

بەڕێوەیە

لەم گەشتەدا

دەرگای ئاسمانەكانیشی، بۆ لێوەیە

تەنانەت وا لە ئاسمانا

لە خزمەت خوای دانا و زانا

لەدەمی واجب بوونی نوێژەكانا

لەگەڵ (موسا)دا خەریكی (تكا)ی ئێوەیە

ئەمە لای خوا !!

ئاخۆ لای مەش

ڕێزو حورمەتی (خۆشەویست) بەم شێوەیە !!

شەوڕەوی یە

گەشتێکی کورت

گەشتێکی درێژ

ڕێیەك هەوراز

ڕێیەکی لێژ

بەلأم هەرکارێك لە ڕوانگەی مرۆڤ سەختە

لە بەرانبەر ویستی خوادا

لە هەر زەمان و جێگادا

سێنا و تەختە

# پێغەمبەری پێشەوا

یادی لە دایکبوونی پێشەوامە
پێشەواکەم پێغەمبەری ئیسلامە

بەھ بەھ، لەو پێشەوا جوامێرو رەندە
خوا هەر بۆخۆی دەزانێ رێزی چەندە !

چ نوورێکە و بەنووری خواوە بەندە
خاوەن ئەخلاقی ناوازە و پەسەندە

کام خەسڵەتی جوان و بەرزو نەجیبە
لە ئەودا هەن، بۆیە گەورە و حەبیبە

قورئانێک بوو رەوشت و هەڵس وکەوتی
باشترینی فێرگەیە ژیان و رەوتی

ئەوەش چونکە پێغەمبەری خودایە
خۆرو مانگ و گەلاوێژی هودایە

هەڵبژێردراوی خودای پەروەردگارە
خامە لە ئاست وەسفی دا، کۆڵەوارە

سـ‌ــــــەر قافڵــــــەی كــــــاروانی پێغەمبەرانــــــە
(ئولــــول عەزمــــــە)[1] و ســــــەركردەی ســــــەروەرانە

خــــاوەن (مــــەقامی مــــەحمود)[2] و (تكـــا)[3] یـــــە
پێغەمبـــــەری ڕەحمەتــــــە و ڕاســــــتیی لایـــــە

عــــومری پـــــڕە لـــــە مـــوعجیزە و لـــــە فورقـــان
لـــــە هــــــەموان گـــــەورەتر، قورئانــــــە، قورئـــــان !

مرۆڤایـــــــەتی، بــــــەهۆی ئـــــــەو ســــــــەرفرازە
دینـــــــی ئــــــەوە، هەمیـــــشە بـــــــەرز و تــــــازە

وەك بــــــــارانی بــــــــەخورزەمی بــــــــەهاری
ســــــۆزو پـــــەرۆش لـــــە رووخـــــساری دەبـــــاری

لـــــە و ســــاتەوە چــــاوی بـــــە ژیـــــان هــــەڵێنا
ئاوێتــــــە بــــــوو، لەگـــــەڵ پــــــاكیی و بـــــەڵێنا

---

[1] بێگومان پێغەمبەران هەموویان خاوەن عەزم بوون، بەڵام وەك تایبەتمەندییەك بەم پێنجەیان (نوح و ئیبراهیم و عیسا و موسا و موحەممەد) (سەلامی خوا لەسەر هەموانیان بێ) دەگوترێ (ئولول عەزم).

[2] ئەو شوێن و پایە تایبەتیەیە لە بەهەشتدا دەردرێتە پێغەمبەرمان (موحەممەد) ﷺ وەك خوای گەورە دەفەرموێ (عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا) الاسراء-٧٩ واتە: بە ئومێدبە، پەروەردگارت بتگەیەنێتە شوێنێكی ستایش كراو.

[3] خوای گەورە ئیمتیازی تكا و شەفاعەتی بە پێغەمبەرمان (موحەممەد) ﷺ داوە لە رۆژی دوایی دا بۆ ئوممەتەكەیی و بۆ گوناهباران.

لەگـــــەڵ ســـــەرفرازیی دا، قـــــۆڵ لـــــە قۆڵـــــە
پـــــەیامی داد و ئـــــازادیی لـــــە کۆڵـــــە

بـــۆ بـــــەختیاریی ئـــــەم ژینـــــە و ڕۆژی دوایـــــی
بەدەســـــــتیەوە مەشـــــــخەڵی ڕێنومـــــایی

گەرەکیـــــــەتی گرۆهـــــــی ئـــــــادەمیزاد
هـــــەموو ســـــەربەرزو ڕووســـــووربێ و تـــــەبا و شـــــاد

بـــــەو بەرنامـــــەی خـــــودا ناردوویـــــەتی بـــــۆی
مـــــافی هـــــەموانی هێنـــــاوە لەگـــــەڵ خـــــۆی

تەنانـــــەت نـــــابێ مێرولـــــەش، لـــــە خـــــۆڕا
لـــــە نێـــــو بـــــبرێ و هەقیقـــــەت وایـــــە، کـــــۆڕا

شۆڕشـــــی ڕزگـــــاریخوازیی دەســـــت پێکـــــرد
ســـــوپای نـــــووری بـــــۆ ســـــەر شـــــەوگار دەڕێکـــــرد

نـــــەی هێـــــشت ســـــوکی و ســـــتەم و گاڵتـــــە جـــــاڕی
تـــــەخت و بـــــەختی ســـــتەمکارانی هـــــاڕی

نـــــەك تـــــەنها هـــــەر کۆیلـــــەیی و زینـــــدە چـــــاڵی
لـــــە بیخـــــەوە، جاهیلیـــــەتی ڕامـــــاڵی

گێڕایـــــەوە بـــۆ ئافرەتـــان شـــکۆ و ڕێـــز
بـــۆ مـــەزڵومان، بـــوو بـــە هیـــوا و وره و هێـــز

یـــــەکێکی کـــــرد بـــــەتاغوت و بـــــت و مـــــت
هـــــەموو تێـــشکان و تێـــچوون و تـــرۆو فـــت

لـــە ئاســـت زوڵـــم و ئەشـــکەنجە و تۆمـــەتی زۆر
دامـــەزراو بـــوو، تیـــشکی داویـــشت وەکـــو خـــۆر

* * *

دوای ئـــازار و هیجرەتێکـــــی ســـــەخت و دوور
بـــوو بـــە یەکـــەم ســـەرۆکی دەوڵـــەتی نـــوور

یەکـــەم دەســـتووری بـــۆ دانـــا و یەکـــەم خـــشت
یـــەك کۆمەڵگـــە و بڕیـــاری ســـەروەریی گـــشت

دیـــن و دونیـــا و سیاســـەت و خواپەرســـتیی
بەیەکـــــەوە گرێیـــــداون، (خۆشەویـــــست)ی

دیـــن و فـــەرمانڕەوایی و حـــوکم و دەوڵـــەت
گیـــان و جەســـتەن، لەیـــەك جـــویێ نابنـــەوە قـــەت

وڕێنەیـــــە، ئەوانـــــەی وا دەفـــــەرموون ! !
نـــەزانن، ئەگـــەر عەللامـــەن، مەگـــەر (جـــوو)ن ! !

خەڵك دۆستیی و دڵسۆزیی و پاكیی و ژیریی
داینان لە جێی خیانەت و دەمارگیریی

برایەتیەكی ڕاستەقینەی داهێنا
خەڵكی لە سەر لێبووردەیی ڕاهێنا

* * *

گەل و هۆز و تیرە و بنەماڵە و میران
دۆست و ئاشنا و غەوارە و خزم و جیران

موسڵمان و ئەهلی دیان، دێهات و شار
دانا و نادان ، دارا و نەدار، پیادە و سوار

باوك و دایك و ژن و مێرد و كچ و كوڕ
پەیوەندیەكانی ڕێكخستن، گەرم و گوڕ

گەورە و بچووك، خەڵك و والی و قەزاوات
گەیاندنیە ترۆپكی ماف و ئاوات

ئاوەهایە پێغەمبەرمان پەرێزی!
لاڵ بێ، هەركەس لە ڕووی بكا بێ ڕێزی

(تَبَّــــتْ يَــــــدَا أَبِــــي لَهَــــبٍ وَتَـــــبَّ)[1]

(هُــــوَ الأَبْتَـــــرُ)[2] بـــــۆ مـــــوغريز و بــــێ ئــــەدەب

مـــــــــسۆگەرە ئـــــــــەوەی دژی بوەســـــــتێ

دەگـــــەڵ شـــــۆڕی و شکـــــستدا، ژوان دەبەســـــتێ

بـــێ شـــك هەركـــەس پێـــی نـــەهێنی شـــەهادە

جەهەننەمیــــــــە و رەنجـــــــەڕۆ و نـــــــامرادە

* * *

ئۆخـــەی کـــە ئـــەم خۆشەویـــست و ســـەرکردە

تـــاجی ســـەر و، ســـەروەریی قـــەومی کـــوردە

هــــەر لــــە زووەوە، بـــــاوەڕی پێهێنـــــاوە

ئـــالآی ئـــەوی، لـــە نـــاو دڵ دا، شـــەکاوە

ســـەرنجێ دەن لـــە مێـــژووی کـــۆن و نوێمـــان

ســـەدان زانـــا و ســـەرکردە، ڕەمـــز و هێمـــان

مزگـــەوت و بـــانگ، بـــەژن و بـــالآی منـــاران

خەملآندوویانـــــە کوردســـــتان، هـــــەزاران

---

[1] سورەتی (المسد – ١) واتە: لەناوچن و وشك بن دوو دەستی ئەبولەهەب و لەناویش چوون.

[2] ( إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ) الكوثر – ٣، واتە: بەراستی ناحەز و نەیارانی تۆ (ئەی موحەممەد) وەجاخ کوێر و دوابڕاون.

چـــی خەســـڵەتی بـــەرز و ڕەســـەنمان لایـــە
هـــی دینـــی (موحەممـــەدول موســـتەفا)یـــە

بـــەو دینـــەوە ، بـــەو ڕابـــەر و پێـــشەنگە
کـــورد خـــاوەنی مێـــژوو و ســـەروەریی و ســـەنگە
* * *

حـــەیف! هـــەوڵ و تەقـــەللای وا لـــە گـــۆڕن
گەرەکیانـــــە ڕاڕەوی کـــــورد بگـــــۆڕن

تەمایانـــە و بـــە زۆرشـــێوە، لـــە کـــاردان
شـــەو و ڕۆژێ، لـــە هـــاتوو چـــوون و غـــاردان

هـــەر خـــەریکی پـــیلان و فـــرت و فـــێڵن
تـــا بـــاوەڕ و ڕەوشـــتی لا نـــەهێڵن

بۆیـــە دەبـــێ گـــەلی کـــورد هـــۆش و گۆشـــی
بـــۆ هـــەق کـــارا، بـــە دڵـــسۆزی و پەرۆشـــیی

نیـــشانی دا، وەفـــادارە و نـــەوەخرێ
دەســـت بـــە دینـــی ( رســـول الله )وە، بگـــرێ

هـــاوار بکـــا لەگـــەڵ قەنـــدیل و هـــەڵگورد

بڵێ : ئێمە، کوردستان و گەلی کورد

(موحەممەدول موستەفا)مان سەرمەشقە
بە هیچ ئاوێك خامۆش نابێ، ئەم ئەشقە

ئەوینێکە و بەرەو جەننەت دەڕۆیین
(موحەممەد) هەر شوێن کەوتووی دینی تۆیین

* * *

(موحەممەد) پێشەوام، ئەی نووری چاوان!
تاجی سەر و، هێزی ئەژنۆ و هەناوان

خۆشەویستم! خۆشم دەوێی هەموو دەم
لە سەرسەری تۆ دەگەڕێم هەتا هەم

(صراط المستقیم)ی تۆ لەوێ بێ
پەنا بەخوا هیچ ڕێچکەیەکم ڕێ بێ!

بەهەق ڕێی تۆ هەقە و ڕێی تۆیە ڕێگام
فیدای ڕێت بم، ئەی پێغەمبەری ئیسلام!

* * *

سەلامی خوات لە سەربێ، رابەری ڕەند
ژینت پڕە لە دەرس و عیبرەت و پەند

تـــۆی ســــەرکردە و سەرمەشـــق و پێـــشەوامان
خوایـــە! بیرێـــژە ســـەر، ڕێژنـــەی ســـەلامان

خوایـــە! بیرێـــژە ســـەر، ڕەحمـــەت بـــێ ڕادە
ئێمـــەش پـــەیمان دەدەینـــەوە لـــەم یـــادە

هـــەتا ڕۆژێـــك لـــە ســـەر ئـــەم زەویـــە مـــابین
هـــەر پێـــشمەرگەی پێغەمبـــەری خـــودا بـــین

* * *

خۆشـــم دەوێـــی، دڵـــم وا بۆتـــۆ دەکوڵێـــت
خـــودا یـــاربێ، دەبـــێ هـــەر ئەشـــقی تـــۆ بێـــت

دڵێـــك، عـــەوداڵ و تامـــەزرۆت نـــەبووبێ
دیـــارە دەبـــێ دڵـــی گـــاوران و جـــوو بـــێ!

دڵێـــك، تـــامی ئـــەوینی تـــۆی نـــەکرد بـــێ
مـــسۆگەر وەك ئـــەوەی وایـــە، کـــە مـــرد بـــێ!

دڵێـــك، دەرهـــەق بـــە تـــۆ بـــوغزی لـــە نێـــوە!
ڕەنـــگ قەترانـــە و ڕەقیـــشی شـــاخ و کێـــوە

زمـــان و زارێـــك دروودت بـــۆ نـــەنێرن
دیـــارە لاڵ و کۆڵـــەوار و بـــێ خێـــرن!

ئەگەر خۆشم نەوێی خۆشتر لە نەفسم
بێ شک بەدەست، ئەونەفسە، نەخسە، حەپسم

خۆشم دەوێ بەهەست و نەست و هۆشم
بەگیان و ماڵ بۆ دینت تێ دەکۆشم

ئێمە هەموو دەیڵێینەوە، پێغەمبەر!
فەرمانی تۆ، بەسەر چاو و بەسەر سەر

ئەی خاوەنی پەیامی پاک و بەفرین!
دەست بەڕێگای تۆوە دەگرین، تا دەمرین

* * *

خودایە! تۆش کە میهرت بێ سنورە
لەتاوان و قسوریمان ببورە

بمانخە بەر، شنەی شەوبای شەفاعەت
بەقومێ ئاوی کەوسەر دێ، قەناعەت

تەوفیقماندە چین لە دوای چین، گەلی کورد
پیرو لاو و ژن و پیاو و درشت و ورد

هەموو بەشوێن پێغەمبەردا بڕۆیین
مشوری دنیا و دواڕۆژمان بخۆیین

لەپیلان و چەواشەیی و هەڵدێران
ڕزگارمان کە، بەرەو خەرمانی خێران

هەتا لە هەردوولادا، شاد و ڕووسوور
نزیک لەتۆ و (رسول الله)و لە خەم دوور

خودایە! ئاوەهایە، ڕاز و ڕامان
تۆش زیادی کەی، خۆشەویستی (ئەو) لامان

بۆ (موحەممەد) بۆ ئال و بەیت و یاری
هەردەم، دروود دەکەینە دەست و دیاری

ئێمە هەموو دەیڵێینەوە، پێغەمبەر!
فەرمانی تۆ، بەسەر چاو و بەسەر سەر

ئەی خاوەنی پەیامی پاک و بەفرین!
دەست بەڕێگای تۆوە دەگرین، تادەمرین

# وەك چیا، ڕۆچۆتە ناخی خاکەوە عیشقی (نەبی)

٢٠٠٧/٤/٤ ڕانیە

خوایـــــەکی دانـــــا و بـــــەهێز و مهرەبـــــان و کاربـــــەجێ
لـــوتفی کـــرد، تەشـــریفی بێـــت و مژدەیـــە و وادێتـــە جـــێ

هـــات بەهەســـتی پـــڕ لـــەنوو رو خۆشەویـــستیی و ســـۆزەوە
هـــات بـــە دەســـتی پڕلـــەخێر و پـــەیڕەوی پـــیرۆزەوە

هـــات بـــە بەیـــداخ و پـــەیامی ســـەرفرازیی و دادەوە
هـــات بـــەهاوار و پـــەرۆش و بانگـــەوازیی و وادەوە

دەك بـــەخێریێ، ئـــەم عـــەزیز و خۆشەویـــست و ڕەحمەتـــە
خـــاوەنی ئـــەخلاقی بـــەرز و جـــوانترینی خەســـڵەتە

ئاوەڵایـــە باوەشـــی هـــۆش و دەروون و گیـــان و دڵ
بـــۆ پێـــشوازی، ســـەرلەبەر کەوتوونـــە جـــۆش و حـــاڵ و کـــوڵ

ســـەیری قـــەندیل و ســـەفین و پیرەمـــەگرون چی دەکەن
پێکـــەوە ئاهـــەنگی شـــادیی و خۆشەویستیی ڕێك دەخەن

مێژوو شـــاهێدە و هەقیقـــەت وایـــــە تێڕامێنە ورد
بەیعـــــەتیان بـــەو خۆشـەویستە، داوە کوردستان و کورد

نامـــەخوا، کـــە جوانـــە سیمای کوردەواری و دینی ئـەو!!
نێرگزی دەشـت و نسـارە ، یا تریفـــەی مانگـــەشــــەو

وەك چیا، ڕۆچـۆتـــــە ناخی خاکـــەوە، عیشقی (نـــەبی)
چی بڵێم! (یاخی)! لە جـــەهل و فیزەوە، عیشقی نـــەبـی!!

فیترەتـــی کـــورد تینـووە، بۆ زەمـزەمـی حـوببـی ڕەسـول
ئـــەو کەســـــەی تێکی دەدا، خوا بۆی بنێرێ گـــەردەلوول

ســــەروەریی و شانازییە، کورد ئوممــــــەتی پێغـــەمبەرە
ئـــــەو کەســــــەی لێکیان دەکا، خائین و لاڕێ و تۆکـــەرە

لاوی کـوردم! بــــەوپــــــەڕی بـڕوا و ئـــــەوین و تینەوە!
هیممــــــەتی مـــەردانــــــە بنوێنە، لـــە ڕێی ئـــــەم دینەوە

با وەڵامـی بــــــانگـــــەوازی خـۆشـــــەویستمان دەینەوە.
با هـــەموو پـــــــەیمانی پابـــــەندیی لەگـــــەڵ نوێ کەینەوە

# لە سەردەمێکی بێ سەلا

بەنـــاوی خودای بوونـــــەوەر
قەڵـــەم لە ڕووپـــەڕی دەفتەر
نووسی بە وریـــــایی و حەزەر
بۆ یـادی ڕەسولی ســــــەروەر

لـــــە ســــەردەمێکی بێ سەلا
پڕ لە چــــەوسانـــــەوە و بەلا
پڕ لـــــە کێشــە و شــەڕ و هەلا
نوقمی جـەهل و جەور و کەسەر

لە نێو گــــەلێکی دافـــــــەتاو
بەتـــەوقی ســــەدان داو و باو
ڕۆژگارێکـی ئـەنگوستـەچـــاو
لە دایك بوو (خـەیرول بەشـــەر)

بەدەنگی هەورەتریشقـــەی ئەو
لەرزی وەك كیسرا، دڵی شـــــەو
جەهالـــەت، كەوتە مەرگ و ڕەو
ناشـێ لــە مێژوو، بێخــەبـــەر!

كە پەیـــــامی خوای پێگەیشت
مـانـــای ڕووناكی ڕێ گـــــەیشت
هەرچی هۆشمـــەندە، تێگەیشت
مرۆڤ بــەو ئـــازادە و بەختەوەر

گـزنگـی بەیـــــــان دەركــەوت
هەركـــەس ڕووناكی بەركــەوت!
خەنی بوو، چونكــە سەركــەوت
بەمـــەرجێك خۆی دابێتە بـــەر

لــەو ڕۆژەوە، ئــــــەو پێشڕەوە
هەتا هەتایـــەش هــەر ئـــەوە
مـــەشخــــەڵی ڕزگاریـی، بـــەوە
سەرقافڵەیــــــــە و ڕێنیشاندەر

تا دووربی لـه ( بئس المصير)
لــه ژینتاڵیی و لــه زەمهـــەریر
مەبـــە داشی دامـــە و هـــەویر
خوا هۆشی داوەو عەقڵ و سەر!

ڕاستیی، بـــە هیچ مـــەگۆڕەوە
تـــاکـــو بەســـــەری شۆڕەوە
نـــەچیتـــەوە نـــــاو گـــۆڕەوە
ڕاستییش، ڕێبازی پێغـــــەمبەر

میللـــــەتـــی کـــوردمان لـەمێژە
مێـژوویــــــەکــــی دوور و درێژە
دڵـی بــە بــــــــاوەڕ سـاڕێژە
خوایــە ! هەر وابێ و موننەوەر

بـــەوپـــــــــەڕی ورە و بـڕواوە
بەشوێن پێغەمبـــــــەری خواوە
ڕێبـوارێـکـی دانــــــــــــەبڕاوە
لە ڕێی ئـــەودایـــە، تێکۆشـــەر

چـــی پیلان و فێـڵ و فرتـه
هــەرچـی خائینه و کرێ گرتـه
پـەتـی درۆن و عومریان کورتـه
به ئیزنی خوای گەوره و دادگەر

مسۆگــــەر شـکستی بـەشــه
لــه دونیا و دوارۆژ، ڕوو ڕەشــه
شەرمــەزاره و ســـەر بەهەشـه
ئــەوەی له هەق بگرێ سەنگەر

هــــەق ڕۆشن و ئاشـکرایــــــه
شنــەی شـەمــاڵی بڕوایــــــه
ڕێگای پێغەمبــــەری خوایـــه
بەکوردی و کورتی و موختەسەر

پێغەمبــــەری میهر و پــەرۆش!
دڵمان بـۆ تـۆ هاتـۆتــــه جۆش
هەموو بەگیان و هەست و هۆش
ڕاوەســـتاوین دەستـــەونەزەر

# شەماڵی سۆز و بەزەیی

١/٤/٢٠٠٧ رانیە

وایـــــادی مـــــەولود هاتـــــەوە
خۆشـــــی کەوتـــــە وڵاتـــــەوە

مـــــەولودی کەســـــێك ئـــــەمما کـــــەس!
هـــــەر بـــــەخوا وەســـــفی دەکـــــرێ و بـــــەس

چـــــی قەڵـــــەم و زمـــــان و زارە
دەستەپاچـــــەو کۆڵـــــەوارە

لـــــەودیو هـــــۆش و زەیـــــنی (مـــــە)وە
هێـــــشتا باســـــی بـــــەرزی ئـــــەوە

هـــەی لـــە (کـــۆلێن)[1]، هـــەی لـــە (قەنـــدیل)!
(گـــەز) کـــوا دەگاتـــە بـــەژنی (میـــل)!؟

جۆگەلـــــە، ناگاتـــــە رووبـــــار
یـــــەك یەکـــــەو هـــــەزاریش هـــــەزار!!

---

[1] گردۆلکەیەکە دەکەوێتە نێوان رانیە و چوارقوڕنە.

هۆش، لەناسکی نێرگز وڕە
پەنجە، لەونیگارە سڕە

هەرچۆنێکی بیخەیە ڕوو
لە دووسەد ملیۆن، دوویە، دوو!

دەبێ هەر لە خواوە بزانین
لە ئاوێنەی ئەو بڕوانین

ئەمجار دەزانین ئەو زاتە
بۆچی فەخری کائیناتە!!

* * *

شەماڵی سۆز و بەزەیی
هەڵی کرد، تەشریفی گەیی

بەدەستی پڕ خەڵاتەوە
خۆری خوایی هەڵاتەوە

بۆ هەموو سەردەم و ساتێ
مژدەی ڕەحمەتمان دەداتێ

خۆری ڕەحمەت و ڕێڕوونیی
نابێ و ناشێ، ئاوابوونیی

هەمیشە دەدرەوشێتەوە
بەختیاریی دەبەشێتەوە

هێڕ نەبێ، کێ یە نەی بینی!؟
پڕشنگی گەش و زێڕینی

شەمشەمە کوێرە، هەروایە
چاوی بەرۆژێ هەڵنایە

قالۆچە، گێژ بە بۆنی خۆش
ئاوایە هۆشی پوچ و بۆش!

* * *

بەخێربێی تاجی سەرسەرمان
گەورە و سەردار و سەروەرمان

ئەی سەر قافڵەی کاروانی نوور
تارێنەری شەوی دەیجوور

تۆ مەشخەڵی سەرفرازیت
راوەستاوین لە پێشوازیت

چاو، دەکەینە خاکی بەر پێت
با چاوی ناحەزان دەربێت

* * *

گوێ ڕایەڵی، لە دوای بیستن
لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشویستن

لەگەڵ بەرگری لێکردن
دڵسۆزانە، تاکو مردن

لەگەڵدابوونی دۆستانی
بوغزاندنی نەیارانی

نیشانەن، بۆ ڕێز و وەفا
بۆ (موحەممەدول موستەفا)

قسەی بێ کردار و بێ پەرێز!
دوورە لە حورمەت و لە ڕێز

کێ شوێن پێی ئەو، بگرێتە بەر!؟
لای ئەو بەرێزە پێغەمبەر!

# خۆرێك لەشەودا هەڵدێ

٢٠٠٧

کە شەوگار دنیای داپۆشی
ژین، شەربەتی ژانی نۆشی

هەر چوار وەرز، بوونە خەزان
داشۆرین، ویژدانی تەزان

سیمای هەقیقەت سپات بۆوە
مرۆڤ کەوتە زۆنگاوی خۆوە

دینداری هەقیقی نەما
خورافیات هات کەوتە سەما

(شەڕ) گوشی (خێر) لەچنگی دا
لەو کاتە خۆر گزنگی دا

* * *

جا لەو سەردەم و ساتەوە
گیان بەبەر ژیان دا، هاتەوە

تاریکی حەجمینی لێبڕا
هەر ڕەو و ڕووڕەشی پێبڕا

کـــــه خــــــۆریش یـــــەکجاریی هــــــەڵات
پـــــڕ بــــــوو لــــــه دادگــــــەری، وڵات

ئومێــــــــدی چەوســــــاوان پـــــــشکووت
بـــــــەیانی ئــــــازادیی ئــــــــەنگووت

ئـــــۆردووی چەکـــــچەکیلەی پێــــــچوو
ســــــووکی و بـــــێ بــــــەهایی تێـــــچوو

ســــــــەرلەبەری دونیــــــــا گــــــــۆڕا
(باتــــــــڵ) تـــــــا هەتایـــــــه دۆڕا

مــــــرۆڤ چـــــۆوه نــــــاو بــــــەرگ و کـــــاڵای
دای لەتەشــــــــقی ئاسمــــــــان، بــــــاڵای

هــــــۆش و عـــــــەقڵ گـــــــەش بوونـــــــەوە
شــــــــــەرمەزاریی ڕەشـــــــــــبوونەوە

چـــــۆن ئـــــەو گۆڕانـــــــه ڕوونـــــادا!!
خــــــوا پـــــەردەی لـــــەڕووی خـــــۆر لادا

تیــــــشکی ڕەحمـــــــەتی نـــــازڵ کــــــرد
تــــــازه ســـــەردەمی شــــەو ڕابـــــرد

ئەمجار زاتێکمان لەنێوە
نوورێکە و دەڕوا بەڕێوە

( رحمە للعالمین)ە
بارانەی ژیانەوەی ژینە

ئێمە بەو زاتە ئاشنایین
تەنیا هەر لەگەڵ ئەو دایین

* * *

بینایی دیدە وادێین!
بەرەو کوێستانت دەڕێین

ئەگەر، ڕێ گڕ و کڵپەشە
پەیامیشت، پشکۆی گەشە

دێین و هەر لەنێو دەستمانە
لیقای خواو تۆ مەبەستمانە

* * *

هۆشمان، گیانمان، زمانمان، دەڵێ:
پێغەمبەری سەروەر، بەڵێ

بەوپەڕی توانا و هێزەوە
لە موحیببەت و ڕێزەوە

لە هۆشیاریی و هەق خوازیەوە
بە ئەوپەڕی شانازیەوە

لە خزمەتت ڕاوەستاوین
پێشمەرگەی تۆین تا ماوین

* * *

سەر بەکەوسەری تۆ مەستە
گیانمان لە سەر لەپی دەستە

گیانمان لە ڕێگەت دەسپێرین
دروود بۆ گیانت دەنێرین

ئەندێشە و بیر و قەڵمان
دڵ و سینە و زمان و دەممان

بەناوی پاکی تۆ گۆشن
بێ ناوی پاکی تۆ بۆشن

لە خۆشەویستیی تۆ تا دێ
موچڕکە بە لەشماندا دێ

وەختە گڕ لە لاشە بەربێ
وەختە دڵ لە سینە دەربێ

عەشقت تێکەڵی خوێنمانە
رێ و شوێنی تۆ، ڕێ و شوێنمانە

عەشقی هەقیقی ئاوایە
دڵمان بەو ئەشقە (ئاوا) یە

عەشقی ( رسول الله)ی ئازیز
کز نابێ هەرگیزاو هەرگیز!

* * *

دڵسۆزی حاڵ و باڵمانە
دەخەم ماڵ و منداڵمانە

دڵسۆزترمانە لەخۆمان
تەنیا چاکەی دەوێ بۆمان

لێزمە بارانی پەرۆشە
بەسەر بەرزیمان، دڵخۆشە

رقیـــــه، لــــه خراپـــــه و خواریمـــــان
لـــــه گونـــــاهو تاوانباریمـــــــان

چـــــونکه بەوانــــــه تێدەچـــــین
دەخـــــوازێ بـــــەو دەردەش نەچـــــین

بـــــەرەو بـــــەرزیمان ڕێ دەکـــــا
هەریـــــەك داوامـــــان لـــــێ دەکـــــا

بـــــرواداری هـــــەقیقی بـــــین
تـــــا لـــــه بەهەشـــــت ڕەفیقـــــی بـــــین

خوایـــــه! ئێمـــــه لـــــەوان دانـــــێ
لـــــه گومڕایانمـــــان وەلانـــــێ

* * *

ئاوایـــــه! چـــــۆن خۆشـــــم نـــــەوێ
زۆرم لـــــه خـــــۆم خۆشـــــتر دەوێ

وەرن ببینـــــه یـــــاوەری
یـــــاوەری کـــــێ، پێغەمبـــــەری!

کەسێکی حەز نەکا هەو بێ
حەز دەکا یەك پارچە شەو بێ

ئەو خۆرەو شەو دەتارێنێ
هەر ڕەحمەت دادەبارێنێ

نووری لەگەڵ خۆی هێناوە
خوا ئاوا ناوی لێناوە

فەرموون لە پێشوازی دابین
خزمەتکاری بین تا مابین

* * *

ئەی میللەتی کوردی بەڕێز!
تۆ نوورت خستۆتە ئامێز

ئەو نوورەت لە دەست بێتەوە
شکۆمەندیت دەتوێتەوە

ڕەسەنایەتیت نامێنێ
لە لوتکە، دێیە دامێنێ

دەکەویە ناو کەند و لەندان
دەچیەوە نێو ڕیزی گەندان

* * *

هەر میللەت و دەستە و پێرێ
روو لە نووری خوا، وەرگێرێ

بڕیاری خوایە مەسۆگەر
ژینتاڵیی و سزای دێتە بەر

کەواتە: مەردو ئازا بە
بۆی پەرژین و شوورە و چیابە

زۆر پیلانگێڕت لە نێون
گورگ و ڕێوی و درنج و دێون

زۆر پیلانگێڕت لە دەورن
پیلانیان گەواڵە هەورن

بەمەرجێك تۆ دامەزراو بی
بەدەردی کورد دەڵێ : پیاو بی!

خەمی دین و دونیای خۆت بێ
ئەگەر هەموو دونیا بۆت بێ!

هەرچی هەیە پیلان و داو
هەموو دەبنە بلقی سەر ئاو

* * *

خوایە! ئەم گەل و ولاتە
بپارێزە لەم ئافاتە

تا ماوە، ئیسلام پەروەر بێ
هەر لە سەر ڕێی پێغەمبەر بێ

* * *

ڕێی پێغەمبەری ئازیزمان
دەکاتە بەهار پایزمان

گرێ کوێرەکان دەکاتەوە
نێوان ڕێک دەخاتەوە

خراپەی لە هیچ کەسێك ناوێ
ئۆخژن دەنێو دڵان داوێ

ورەو هیوا دەکاتە کێو
خەندە دەڕوێنێ لە سەر لێو

دڵنیایی و متمانە دێنێ
هەقیقەتان ڕادەنوێنێ

دونیـــــا و دوا ڕۆژ لێـــــك گـــــرێ دەدات
مـــــرۆڤ دەخاتـــــە كـــــار و خـــــەبات

ڕوو لـــــە تـــــاك و كۆمـــــەڵ دەكـــــا
ئـــــالآی ســـــەروەریی هـــــەڵ دەكـــــا

هەرچـــــی خێـــــرە لەلایـــــەتی
دەپـــــارێزێ كەســـــایەتیی

ژیـــــان بەگـــــشتی دادەڕێـــــژێ
دەوڵەتـــــداریی، تـــــا دەســـــت نوێـــــژێ

هـــــیچ بوارێـــــك ناكـــــا فـــــەرامۆش
ڕاســـــتەڕێ دەكـــــا، عـــــەقڵ و هـــــۆش

تـــــۆبزی و زوڵـــــم و چـــــەو ســـــانەوە
دەخاتـــــە زبڵدانـــــەوە

* * *

پێغەمبـــــەری هێـــــژا و بـــــەڕێز
بەپـــــەیامێكی وا بـــــە پێـــــز

تەشـــــریفی موبـــــارەكی هـــــات
بۆیـــــە هـــــەردەم پڕشـــــنگ دەدات

کەچی زۆر نەفام و دێزە
لە ئاست ئەم زاتە بەرێزە

زمانیان بە خراپە دەگەڕێ
سەگ، بە مانگەشەو دەوەڕێ

گەمژە، بەرد دەگرێتە قەندیل
بەکەرسەك، بەردەبێتە نیل!

بەری خۆر دەگرێ بە بێژینگ
پووشکە، بە (با) دەگرێ بەربینگ!

پەککو، هێریش بەو ئەندازە!!
خۆر لە نوور ناکەوێ تازە

ئەوانیش و هاو وێنەیان
خۆیان ، فوو و خوو و وڕێنەیان

هەقیقەت هەڵیان دەلوشێ
دەبنەوە سەپانی پووشێ!

نەك هەر هێندە (أبْتَر)[1] یشن
دۆڕاو و ڕووسیا و گەڕیشن

سەیرە، لەمەچیان پێ دەبڕێ!
هەڕێ، ناكەنەوە لە بڕێ

كەوتوونەتە داوی هەوەس
ئیتر جەهالەت بەسە، بەس!

تاكەی گیرۆدەی ئەم دەردەن
دەست لە دەستی شەیتان بەردەن

ژیر بن، بەخۆدا بچنەوە
لەگەڵ هەق دا، ئاشت ببنەوە

ئەوسا كەبوونە هاوڕێی نوور
گومڕایی تووڕدەدەن دوور، دوور!

دەڵێن : نەفرەت لە تۆ و حاشا
جاران كۆیلە و ئێستاش پاشا

---

[1] (إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَر) الكوثر – ٣، واتە: بەراستی ناحەز و نەیارانی تۆ (ئەی موحەممەد) وەجاخ كوێر و دوابڕاون.

جاران ون و وێڵ و لاڕێ
ئێستا شارەزا لە شارێ

جاران دڵ تەنگی و ڕاڕایی
ئێستا ئارامی و دڵنیایی

جاران ناحاڵی لەخۆشمان
ئێستا پرشنگ دەدا هۆشمان

جاران بەشوێن سەڕابەوە
ئێستا پەیوەست، بە ( کابە)وە

یەک خودا، یەک وەدیهێنەر
یەک ڕێ، یەک ڕووگە، یەک ڕابەر

لە ئێستا و جاران بڕوانن
وەکو ئاسمان و ڕێسمانن

وا دان دەنێن بە ڕاستیی دا
تەسلیم دەبن لە ئاستی دا

* * *

هەقیقەت، ئاوایە ڕێسای
کە پێیگەیشتی بۆی فیدای

سەری لە پێناو دادەنێی
هەموو شتی بۆ وەلادەنێی

کە چوویە نێو پاپۆڕییەوە
بە دنیاشی ناگۆڕییەوە!

هەرکەسێ وابێ هەڵوێستی
ژیری و عەقڵە، پڕبەپێستی

ئاسۆی لێکدانەوەی بەرین
بوێرەو هەزار ئافەرین!

* * *

ئەوەی مل بۆ هەقیش نادا
هەر سوورە ڕووی لەهەق لادا!!

هەر دەگەڵ پەستی و پیسی بێ
گوێ لەمستی ئیبلیسی بێ!

هەریاخی و سەرکەش و عاسێ
خۆری خودایی نەناسێ!!

باوەڕ نەهێنێ بەو نوورە !
دیارە وێرانەو خاپوورە

لەگەڵ زەینی جوێ بۆتەوە
چۆتە شکڵی (ڕۆبۆت)ەوە

چاو و دڵ و گوێی، دەقا و دەق
بوونەتە بەردی رەق وتەق

قەترانە، سینە و دەروونی
ئیدی بەشیەتی زەبوونی

* * *

حەمد و سەنای بێ ئەژمارمان
بۆ زاتی پەروەردگارمان

کە ئێمە هاوەڵی نوورین
دەست لەنێو دەستی کافوورین

دەممان بەکانیی ئۆقرەوە
ئومێدمان تادێ، لە برەوە

چاومان لەگەڵ چاوی خۆرە
چاومان بێ چاوی ئەو کۆرە

گوێمان بەدەنگی مارشی ئەو
دەزرینگێتەوە ڕۆژ و شەو

هۆشمان بەشنەی شەماڵی
پاڵفتەیە و لە غەش خاڵی

سینە بەسروەی هەناسەی
دەشکێ تامەزرۆیی و تاسەی

گیان بە گیانی، داوە وادە
دڵمان بەناوی گوشادە

پێمان لەگەڵ شوێن پێی دایە
هەر ئەو سەرمەشقی ڕێگایە

بەویستی خوا، تا (سەر) مابێ!
دەستمان لەدەستی بەرنابێ

# دواین خشت

٢٠٠٧/٤/١٥

بڕیـــــاری خوای کاربــــەجێ یە
ڕێبـواری کــۆتــایــی ڕێ یــــە

سەرقافڵـــــەیــــە و دواین خشتە
ڕەحمــــەتی خوایــــە و بۆ گشتە

ئــــاونــگـی سۆز و پــەرۆشــــــە
ئـۆخژنــی دەروون و هـــۆشــــــە

لوتکــــــەی ڕەوشت و ئاکــــــارە
هـــــەتوانی زام و ئـــــــــازارە

خـــەڵاتـی ئـــــــازادیی لایــــــە
ڕێز و شـکـۆمــــــەندیی و پایــــە

لەجیات جگــــەرگۆشــــە و منداڵ
جاهیلیـــــەتی فڕێدایـــــــە چاڵ

لەگـــــەڵ شــەو دەستەویەخەیە
هــــەناســــــەی هیوای کۆیلــەیە

چی دەفەرمووێ لە خواوەیە
پشت و پەنای چەوساوەیە

دوا پەیامی خودای پێ یە
دەبێ کێ نەزانێ کێ یە!؟

ئەوە پێغەمبەری خوایە!
(موحەممەدول موستەفا) یە

گیانم لەسەر سەری گەڕێ
سەرم لەرێی دایە، لە ڕێ!

* * *

پێغەمبەری پایە بەرز!
گوڵ و گوڵزاری چوار وەرز

هەوێنی داد و ئازادی!
تۆ خەندەی ئادەمیزادی

مژدەی سەروەریی و سەرکەوتن!
لەگەڵ تۆ، خۆشی دەرکەوتن

بەختیاریی و خۆشی هەرچەندن
هەموویان، بە تۆوە بەندن

بــە هــۆی تۆوەیـــــــە زانیمان
ڕێی ســـــەرفرازی یـــە، ئیمان

تــۆ نــەبــایـــە چیمان دەکرد
هـــــەمووی بـە گـومڕایـی دەمرد

لــــە تـۆوە ڕاستـیی فێـربـووین
بـــەرەو دوندی شـکـۆ چـووین

ژیـــــان لــە ڕێگای تۆوە خۆشە
غەیری ئـــەو هـــــەڵدێر و بۆشە

کێش ملـی هـــــەڵدێران بـگـرێ
سەرەنگرێ دەبێ، ســەرەنگرێ!

* * *

ئـەگـــەر خــاوەنـی دونیا بین
لــە بـــەژن و بـــاڵادا چیا بین

هێـز و ســـوپـاشمان لـــە دەورە
بـــەردەستمان بن میر و گـەورە

نـەك هـــەر نـەبینین ڕۆژی تۆف
بـەڵکـو جـارێك نـەڵێین: ئۆف

دنیامـــان بــــەکـامـی دڵ بـێ
هیچـــە، مادام مـرۆڤ ژێـر گڵ بێ

مەرگمان لەپێشـــــە و ناگونجێ
خۆ پـــەنـادەین لـــە هیچ کونجێ

هەقیقـــەتە، بێ کێشمـــە کێش
حەشـر و حیسابمان دێتـــە پێش

بۆیـــە ئەگـــەر لـــە خـــەم خوێین
دەبـێ لـــە یـــــەك ڕێـوە بـڕۆیین

کە ڕێی پێغەمبـــــــەری خوایـــە
ئۆبـــاڵ بـــە گێژی ملم، وایـــە!

شەیتان، شۆفـــار، دونیا و نەفس
نەمانکـــەنـــە کۆیلـــە و حەپس

تەڵـــە و تەپکـــە و داوی ئـــەوان
لە ســـەر پێ یـــە ڕۆژ و شـــەوان

بۆیـــە دەبێ وریـــــا و ورد بین
نـابـێ بـۆ نیازی وان، پـرد بین

مـادام خـــاوەن بـڕوا و هـۆشین
خۆ بە غـەیری خـوا نـەفرۆشین

تـا خـاك و میللـەت و خـۆمـان
مـاچ کـەین خـۆری ئـاسۆمـان

تـاڵیی لــــە ڕیشــــە دەرێنین
ئـــامێز لـە شـــادیی وەرێنین
* * *
میللـــەتی کوردی خۆشەویست!
ئەو ساتەی دینی خوات کە ویست

بە بـــــاوەڕ و تامـــــــەزرۆیی
(جابـــــان)[١]ی نوێنــەرت ڕۆیـی

بۆ خزمـــەت پێغـــەمبەری خـوا
لەوســـــــاوە، یـەکن تۆ و بڕوا

کاتێکیش سوپـــای نوور گەیشت
لای تۆ، کـەیف و سروور گەیشت

[١] جابانی کـوردی، هـاوەڵی پێغەمبـەرمان (موحـەممـەد) ﷺبـووە و لەلایـەن (مـەیمون)ی کوڕیەوە  کە تابیعی  بووە، فەرموودی لیٚ گێڕدراوەتەوە.

بــــه گــــه‌رمی پێشوازیت کـردن
زانیـت فــــه‌ریادڕه‌سی کــوردن

شــادەت بـــه پێغـــــه‌مبه‌ر هێنا
جـاهیلیــــــــه‌تت وه‌ژێرپێنا

په‌یــــامـی خوات گرتـــه ئــــامێز
بۆی بوویــــــه پشت و په‌نا و هێز

ده‌خیل، ده‌ست بــــه‌رداری نه‌بی!
پابــــه‌ندی بــــه، هـــه‌تا هــــه‌بی

بـۆ ژیــــانـی کـورتــی دونـیایی
نــــه‌بیــــه نێچیری گــومــــڕایی

چــه‌واشـــــــه‌یی، ڕۆژ بــۆ ڕۆژی
زیـــاتــــــر لێوت لێ ده‌کرۆژی

بـه‌ڵام تـۆ، بــــه وره و بــــاوه‌ڕ
سه‌نگه‌ر بگره له ئۆردووی شــــه‌ڕ

ڕێبـــواری ڕێبازی نــوور بـــــــه
ڕاست به‌و، به‌خوا پشت ئه‌ستووربه

تەنها خراپەیـــە و ســـــەرپێچی
تاکــە هۆیـــە، کـــــە پێی تێچی

بە بـــــەزم و ڕەزم و ڕەشبەڵــەك
هەرەس دێنیێ وشکــــە کەڵــەك!

باوەڕێك، شــــــەڕاب دایشۆریێ!
داڕزاوە و خــۆی ناگــریێ نۆریێ

سووربیێ، لە سەر سنوورشکێنی!
مسۆگـــــەر خـــۆی دەدۆڕێنی

بـــــاوەڕێك، تـــــاوان دای بێــژن
بڕوای چی و چی پیێ دەبێژن!؟

بـــــاوەڕێك، گویێ نــــەداتــە هیچ
بخزێتــــــــە قــوژبن و بن میچ

ئەگـــــەر دنیاش ژێرە و ژوور بیێ
ئەوهەر لەخەم خۆی بیێ و دوور بیێ!

بۆ خـوا و خـــەڵك نــەکا کۆشش
بـایی پولێکـــــە و بوونـــی چش!

* * *

ئەو بـــاوەڕەی سەرکـەوتوویــە
باوەڕێکـــــە، کـــە زیندوویـــە

تیغـی ڕەسـەنـــە، خـــەمخۆرە
دژی خـراپــــــە و زوڵم و زۆرە

تـــا ئـــــەو ڕۆژەی لــــە دنیادا
ڕێگـای هـەقیقـــــەت بـەرنـادا

خوایـــە گەلی کورد هەتا سـەر!
ئـــــەو ڕێبازە بگرێتە بـــــــەر

# پێغەمبەری ئازیز

٢٠٠٨/٣/١١

ئەی پێغەمبەری ئازیز        ئەی پێشڕەو و ڕابەرمان
ڕێباز و پەیامەکەت        خێرو خۆشی یە و خەرمان
بۆ هەموو کێشە و دەردێك        چارەیە و شیفا و دەرمان
سەلامی خوات لە سەر بێ،        پێغەمبەری سەروەرمان

سەرقافڵەی پێغەمبەران        پێغەمبەری کۆتایی
تۆ شایستە و شایانی،        پێشڕەوی و پێشەوایی
گزنکی سەرفرازیی،        تۆ خۆری ڕێنومایی
بۆ باوەڕ و ئازادیی،        بۆ برایەتی و تەبایی

ئەی پێغەمبەری مەزن،        ڕەحمەت و میهر و سۆزی
بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی        یەك بەیەك گەل و هۆزی
هەوێنی ئاشتەوایی،        بۆ قەیران و ئاڵۆزی
دەبێ هەموو ئینسانێك        لە تۆدا خۆی وەدۆزی

ئەی سەر مەشق و مامۆستا،        بێ تۆ وێڵ و نامۆین
مەشخەڵی نوورت پێ یە        بە شوێن تۆدا دەڕۆین
تۆ ئاسۆی کامەرانی،        ئێمەش هاوڕێی ئاسۆین
بەڵێن بێ، تا بمێنین        ڕێبواری ڕێگای تۆیین

# ناوت وەکو گوڵ لە دڵ دا پشکووت

٢٠٠٨/٣/١٢

ناوت وەکو گوڵ، لە دڵ دا پشکووت
لە دیدەماندا، وەك بەیان ئەنگووت
دەروون جۆشاوە، دڵ دەفڕێ لە دووت
بۆیە دەنێرین سەلام و دروود
یەك پارچە دنیا دەکەینە سروود

ناوت (موحەممەد) قوربانی ناوت
چاومان لە ژێر پێت، سەر لە پێناوت
بارانی ڕەحمەت دەڕژێ لە چاوت
بۆیە دەنێرین سەلام و دروود
یەکپارچە دونیا دەکەینە سروود

ناوی تۆ خۆرە و مانگ و گەلاوێژ
لە بوونەوەردا، لە دڵ دا، لە نوێژ
دەبەخشێ نوور و ئاسوودەیی و چێژ
بۆیە دەنێرین سەلام و دروود
یەکپارچە دونیا دەکەینە سروود

ناوت گەوهەری دەریای هەقیقەت
پڕشنگ دەهاوێ و خامۆش نابێ قەت
ڕێی سەرفرازیی و ژینە ڕێگاکەت
بۆیە دەنێرین سەلام و دروود
یەکپارچە دونیا دەکەینە سروود

# ئەی ( موحەممەد )

٢٠٠٨

ئەی (موحەممەد) پێشەوام، ئەی گوڵی هیوام
تۆی سەرمەشق و مامۆستام، مەشخەڵی ڕێگام
تۆ پێشڕەو و ڕابەری
تۆ سەردار و سەروەری
تۆ ڕێگا نیشاندەری
تۆ هەڵگری بەیداخی، شکۆ و دادگەری

(موحەممەد) سەرکردەی ڕێم، بە شوێن تۆدا دێم
دنیا ڕێگـــــــە بگرێ لێم، هــــــەمیشە دەڵێــم
تۆ مامۆستا و پێشەنگی
تۆ چرای شەوەزەنگی
تۆ لووتکەی بەها و سەنگی
تۆ لەدژی نەفامی و، ستەم دەجەنگی

(موحەممەد) گیانم فیدات، قوربانی ڕێگات
دواین پە یام و خەڵات، لە ڕووی تۆ هــەڵات
تۆ دڵسۆزی هەموانی
بارانەی میهرەبانی
هێمای ژیانەوەی ژیانــی
بەسۆزو پەرۆشەوە، لێمان دەڕوانی

# که هاتی

بێ نـــــاز هاتی، بەڵام بوویە دەستی نـاز
دەگەڵ کۆیلە و هەژاران بوویە هــاوڕاز
بۆ چەوساوان بوویە پشت
بوویە مشورخۆری گشت
راستیت لەگەڵ خۆدا هێنا
ئەخلاقت بۆ کردین وێنا
پاکیت دەرخست
بەویستی خوا، ڕاستییت سەرخست

کە هاتی دنیا وەك شەوبوو، ئەتۆش خۆر
سەری دنیای تەنیبوو ئاهــو ناســــۆر
بەدەردی کۆیلایەتی
دەیناڵاند مرۆڤایەتی
مرۆڤەکان ببوونە دوو بەش
زاڵم و مەزلۆوم و سپی و ڕەش
تۆش هیوا و نوور
بۆ هەمیشە و نزیك و دوور

هاتـی وەك بارانـــــە بۆ خـــاكـی دەروون

مرۆڤ لە ڕێی تۆ، دۆزیەوە باوەڕ و بـــوون

ژین مانای دابوو لەدەست

مرۆڤ تووشی جەهلێكی خەست

هاتی و نەفامی ڕەویەوە

لە ئاسمان و لە زەویەوە

شەوقی دا، ڕووت

لە گشت لاوە زانست پشكووت

# خوایه دابارێنه خوار

٢٠/١٠/١٩٨٨ نمێنجه، خانێ

له ڕۆژهەڵاتی کوردستان

خوایـــــه دابارێنـــــــهخوار　　ڕهحمـهتی خـۆت، بــێ ئـهژمار
بۆســــهرگیانی (موحهممــــهد)　　وهکـــــو بـــــارانی بــــــههار

دهپارێینـــــــهوه خوایـــــه !　　دهســـتمان دهســـته و دوعایــه
خوایــــه ! داوامــــان وایـــــه　　پـــــــــــــڕدڵ و دهڕوون و زار

پێغهمبـــهر نــووری چـاومان　　هێـــــزی دڵ و هـــــــهناومان
هـــهروا مـــاوه لــــه ناومـــان　　بـــه کـــــردار و بـــــه گوفتـــار

بــــێ پــــهرده ئاشـــــکرایه　　وهکــــــو ڕۆژی ڕوون وایــــــه
پێغهمبــــــــهری خودایـــــــه　　(ئهحمـــــهد)ی نهخوێنــــــدهوار

نێــــــــردراو و ترســــــێنهره　　مزگێنـــــــــی و مــــــژدهدهره
فێرعـــــــــهون بهزێنــــــــهره　　پێغهمبـــــهری شۆرهســــــوار

ناســــراوه لهســـــهر زهمـــین　　بـــه (موحهممــــهدول ئــهمین)
(رحمـــــــــه للعـــــــالمين )　　پێغهمبـــــــهری پایــــــــهدار

# پێغەمبەری خودایە پێشەوامان

٢٢/١٠/١٩٨٨ نمێنجە، خانێ

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

پێغەمبـــــــەری خودایـــــــە پێـــــــشەوامان
قـــــەلای پۆڵایینــــــە بـــــیر و بڕوامـــــان
قورئـــــان و ســـــوننەتە چـــــارو دەوامـــــان
بـــــە ئیـــــسلام دەگەینـــــە مـــــافی ڕەوامـــــان

ئایەتـــــەکانی خـــــودای پـــــەروەردگار
ســـــوننەتەکانی پێغەمبـــــەری ســـــەردار
هـــــەتاکو دواهەناســـــە وایـــــە بڕیـــــار
دەکەینـــــە ئاوێنـــــە بـــــۆ کـــــار و گفتـــــار

هـــــەتا مـــــاوین لـــــە دونیـــــادا و دەمێـــــنین
ئامـــــادەنین ســـــەری خـــــۆ، دانـــــەوێنین
بـــــە خـــــوێنی ئـــــاڵ، بـــــە بـــــەرگی ســـــووری خـــــوێنین
دەیـــــسەلمێنین کـــــەخاوەنی بـــــەڵێنین

رێبازی ئێمە، رێبازی ئیسلامە
رێگای ئیسلام، دەرمانی هەموو زامە
کاروانی خەباتی مە، بەردەوامە
دەیڵێینەوە هەمیشە ئەو پەیامە

هەرچەند دونیا فیرعەونی زۆری تێدان
زۆر سک و سەر، لەژێر پۆستاڵ و پێدان
کیمیایی، دەربەدەربوون، بەند و لێدان
ساردمان ناکەنەوە و رێبوار لە رێدان

ئێمە پێغەمبەرە، رێ پیشاندەرمان
سەرۆک و پێشەوای زانا و ڕابەرمان
ئەو سروودەی هەمیشە وا لەبەرمان
پێغەمبەرە، نووری چاو، تاجی سەرمان

ئێمە یەکتا پەرستین، موسڵمانین
لەسەر رێبازی خاوێنی قورئانین
رای دەگەێنین هەتا لەجیهانین
تەنها (موحەممەد) بەڕابەر دەزانین

# خۆشەویست و ڕابەرمان

١٩٩٠ خانێ

خۆشەویست و ڕابەرمان
سەرکردەو و سەروەرمان
نووری چاو، تاجی سەرمان
بەندی دڵ و جگەرمـــــان

تاقە پێشەواو ڕابەر
هەتا ماوین لەلامان
پێغەمبەرە، پێغەمبـەر!
پێشـڕەوە و پێشەوامان

ڕێبـەری ئادەمـــیزاد
هـەڵگری مەشخەڵی داد
سەرلەشکری ڕێی جیهاد
دژی زوڵم و ئیستیبـداد

(ئەبو جەهل) ڕەتێنـەر
هــەتا ماوین لەلامان
پێغەمبەرە، پێغەمبـــەر!
پێشـــڕەوە و پێشەوامان

بت و بتـــخانە شكێن
كەلەپچە و زنجیر پسێن
ماف وەرگر و ماف ئەستێن
ئازادیی و دادگەری هێـــن

مژدەدەرو ترسێنەر پێغەمبەرە، پێغەمبـــەر!
هەتا ماوین لەلامان پێشـــڕەوە و پێشەوامان

دەست بە نوری هوداوە
وابـــەستە، بە خوداوە
دەم بە بانگ و سەداوە
سەركردەی لێوەشـــاوە

خەمخۆرو ڕێنیشاندەر پێغەمبەرە، پێغەمبـــەر!
هـــەتا ماوین لـە لامـان پێشڕەوە و پێشەوامـــان

# بۆ دوامینی پێغەمبەران

١٩٨٥ سلێمانی

ئــــــەی پێغەمبــــــەری ئیـــــسلام!
ئـــــــەی دوامینــــــی پێغەمبــــەران
تـــــۆ خۆرێـــــك بـــــووی ڕەوانتـــــەوە
شـــــــەوەزەنگی چەوســـــــێنەران

*****

ئـــــەی کانگـــــای زانـــــین و ڕەوشـــــت!
ئـــــــەی مامۆســـــــتای ئـــــــادەمیزاد
ئـــــــەی ڕەوانـــــــەکراوی خـــــــودا
چەســـــــــپێنەری ئـــــــازادیی و داد

*****

ئـــــــەی ترســـــــێنەرو مـــــــژدەدەر
تـــــۆ بـــــانگی ڕزگارییـــــت دەگـــــوت
دەتفـــــەرموو هـــــەر خـــــوا بناســـــن
مـــــەبن بـــــە بەنـــــدە بـــــۆ تـــــاغوت

*****

لەنیوەدورگـــــــــەی عـــــــــەرەبی
خـــــۆری تـــــا هـــــەتایی هـــــەڵات
هـــــەر لـــــەخوا دەوەشـــــێتەوە
خـــــەڵاتی بـــــەم شـــــێوە خـــــەڵات

*****

خوایە! قوربانی میهرت بم
لەگەڵ ئەم خۆرە پیرۆزە
بۆ هەرلاشەی رەق و مت بم!؟
بەرانبەر ئەم شەوق و سۆزە

*****

خودایە! زۆرە سۆزی تۆ
لێواو لێو ئاسمان و زەوی
هەر شایانی سۆزی تۆیە
نیوەشەوێ ڕۆژ دەرکەوی!

*****

شەوی ڕەشی ئادەمیزاد
بەوخۆرەت کردە ڕووناکی
سەیرە گێژاوی نەفامان
ئەوی نەخستە هیلاکی

نەفامترین حەشەماتی
ئەم سەرزەمینەی دانا کرد
چ دانایی یەك! نرخی مرۆی
بۆ بەرزترین لوتکە برد

*****

پێغەمبەرێکی ئاوەها
هەموو کردار و ڕەفتاری
بۆ ئەوسا و ئێستا و داهاتوو
بوونە نەسیمی بەهاری

*****

لەبێ وێنەیی پێغەمبەر
سەیرماوە جیهان هۆشی
پێغەمبەرێك جیهانێکی
پەرتەوازەی کردە خۆشی

*****

ڕاستە پێغەمبەر عەرەب بوو
بەلاَم نەك تەنها بۆ عەرەب
بۆ هەموو دنیای ڕامالێن
(ئەبو جەهل) و (ئەبو لەهەب)

*****

ڕەگەزپەرستی و جوودایی
بیرۆچکە و ڕێچکەڵە و لاڕێ
هەموویانی پێچایەوە
بۆ سەر یەك شەقام و شاڕێ

*****

بـــــۆ ڕاســــــته شــــــەقامی ئیـــــسلام

ئیــــــسلامیی پـــــــەیامی ژیـــــــان

پـــــــەیامێك، وشـــــــەی ئـــــــازادی

بەتــــــــەواوی جیهـــــــان گـــــــەیان

# خەرمانی خۆشەویستیی

٢٠٠٩

خۆشمان دەوێی زیاتر لە خۆمان (خۆشەویست)!
خۆشەویستییت، خەرمانە بۆمان (خۆشەویست)!

خۆشەویست، خۆشترین ئاوازە و سەدا
دەریایەکە و لە دڵماندا شەپۆل دەدا

بیابانێکی وشک و ڕەقت خەملاندەوە
خۆشەویستیی و نوورت لە نێودا چاندەوە

چەوساوەکان، لەگەڵ تۆدا هەستانەوە
چەوسێنەران، بەرانبەرت وەستانەوە

بەستەڵەکی زوڵم و بێ دادیت تواندەوە
سیمای ڕاستییت بۆ هەمیشە ڕانواندەوە

ئــەوەی چــاو و دڵ و گــوێ و عــەقڵی، کــراوە بــوو
بــوو بــە هاوڕێــت، دەســتی بەشــەوقی چــراوە بــوو

چ بەدبەختــە! کەســێکی پــشت لــە نــوور دەکــا!
کــەی ژێــر مــاڵی، بــە دەســتی خــۆی خــاپوور دەکا!؟

خۆشەویـــستییت، تـــادێ لـــە دڵـــدا، ڕۆدەچـــێ
لــە عەشــقی خــوا و تۆیــە دڵ خــوێنی بــۆ دەچــێ.

# کوردستان لە پێشوازیی دا

٢٠٠٩

سـوپاس بـۆ خـوا کوردسـتان، بـە گـەرمی و بـەڕێزەوە
ڕێگـای پێغەمبـەری خـوای، گرتۆتـە ئـامێزەوە

(قەنـدیل) شـاهێدی دەدا، لەمێـژە دەسـتەملانن
فـەرموون لـە کەرنـەڤاڵی یـادی مـەولود بـڕوانن!

(سـەفین) چـەپکە نێرگـزی درووود دەکاتـە دیـاری
بـۆ گـەلی کـورد و تێکـڕای وڵاتـی کـوردەواری

(پیرەمـەگرون) پـەیمان و بەیعـەت نـوێ دەکاتـەوە
نرکـەی تـەکبیرەی (ئاسـۆس)، تـادێ دەنـگ دەداتـەوە

(حەسارۆسـت)و (زمنـاکۆ) وەختـە بـاڵ دەگـرن، دەفـڕن
لەگـەڵ (جـودی) دا مارشـی ڕەسـەنایەتی دەچـڕن

(سـورێن )و(هەنـدرێن) لەگـەڵ،(مـەتین) بـەوپەڕە مەسـتن
گـشتیان وەکـو منـاران، بـەو نـوورەوە پەیوەسـتن

خودایـە! ئـەم میللەتـەش، هـەر پەیوەسـتی ڕێـی تـۆ بـێ
لـە زیانبـاری بـەدووربێ و هـەر خێـر و خۆشـی بـۆ بـێ

# مەدالیای کودستان



(مەدالیای کوردستان) ئەو کۆمەڵە شیعرە بوون لە دووتوێی ١٨٦ لاپەڕەدا، ساڵی ١٩٩٨ لە سلێمانی چاپ و بڵاوکرانەوە، کە لە تایپ و دیزاینی (مەحەممەد جەمال - مەحەممەدی قرتاسیە)و چاپخانەی (سیما)و سەرپەرشتی چاپ (کاوە پێنجوێنی)و لەسەر ئەرکی خێرخوازێك و ژمارەی سپاردنی (١٢٥)ی ساڵی ١٩٩٨ی وەزارەتی رۆشنبیری بوون. لێرەشدا پەراوێزی زیادم بۆ داناون و بەگشتی پێیاندا چوومەوە.

**تێبینی:**

١- ئەم چوارشیعرەی خوارەوە ساڵی ١٩٩٨ لە (مەدالیای کوردستان)دا بڵاوکرابوونەوە، ساڵی ٢٠٠٩ لە (خۆشەویستی خۆشەویست)دا چاپم کردنەوە، بۆیە لەنێو ئەودا هێناومنەوە.

+ بۆ دوامینی پێغەمبەران
+ خوایە دابارێنە خوار
+ پێغەمبەری خودایە پێشەوامان
+ خۆشەویست و رابەرمان

٢- تایپی دووبارەی (مەدالیای کوردستان) بۆ ئەم دیوانە (پێشەوا حەمەد) کردوویەتی.

٣- شایەنی باسە لە مەدالیادا نازناوەکەم بە (وەرزێر پشدەری) نووسراوە، ئەوسا ماوەیەك ئاواش بەکار دەهات، بەڵام ئێستا نا، چونکە نازناوەکە (شەریف وەرزێر)ەو هیچی دی.

## پێشکەش بێ بە :

شەهیدانی ئیسلام بە گشتی.

موجاهیدانی ئیسلام لەهەر کوێ یەك بن.

ئەو دایك و باوکانەی رۆڵەکانیان قوتابی قورئانن.

رابوون و پەیڕەو و دایکیان.

ئەو تیپە سروودانەی کە خاوەنی دەنگی رەوا و رەسەن و زوڵاڵن.

# پێشەکی

ئیسلام کە بەرنامەی کۆتایی و دوایین و تەواوترین نوسخەی هیدایەتی خوای پەروەردگارو دادگەرە بۆ مرۆڤایەتی، بێگومان کالآیەکە پڕ بەبالآیی و دەر و دەروون (ظاهر و باطن)ی ئینسان و هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان و گوزەرانی گرتۆتەوە و مشوری ورد و درشتی خواردوە و هێندەی نوکی دەرزی یەشی لێ نەبواردوە.

جا دیارە ئایین و بەرنامەیەکی وا هەمەلایەنە و گشتگیر (شامل) پێویستی بەهەموو ئامرازو شێوازە زۆرو جۆراوجۆرەکان هەیە، تاکو وەك پێویست بتوانرێ سەرەتا ڕابگەیەنرێ و پاشان وەك حوکم و سیاسیەت بچەسپێنرێ و دواتریش بپارێزرێ و بەرگری لێ بکرێ و دەنگ و سەدا و پەیامیشی بە چوارقورنەی دنیا بگەیەنرێ!

هەر بۆیەش دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەمتەرخەمی نەکردووە لە بەکارهێنان و کەڵك وەرگرتن لە سەرجەم ئەو هۆو وەسیلە ڕاست و ڕەوایانەی کە کارو بانگەوازی ئیسلامیی پەکی لەسەریان کەوتووە, یەکێکیش لەو هۆو ئامرازانە بریتی بوو لە شیعرو هەڵبەست، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە گرینگی و کاریگەری هونەری قسەکردن بەگشتی فەرموویەتی(ان من البيان لسحرا) ( بوخاری گێڕاویەتەوە) واتە: هەروەك چۆن جادوو کاریگەریەکی پەنهان و سەرسوڕهێنەری هەیە، ڕەوانبێژییش بەهەمان شێوە.

ئاشكراشه كه شاعیران چ له سەردەم و ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا(ﷺ)و چ له دوای ئەویشدا ڕۆڵ و كاریگەرییەكی بەرچاویان هەبووه له ڕوونكردنەوه و ڕاگەیاندنی ڕاستییەكانی ئیسلام و بەرپەرچدانەوەی تانه و تەشەرو تۆمەت و پڕوپاگەندەی ناحەزان لـه لایـەك و لەلایـەكی دیكەشـەوه وره وەبـەرنان و ئـازاو تیـژكردنی مـسوڵمانان بەگـشتی و موجاهیـدان بەتایبـەت و هـەڵنان و هاندانیان بۆ دینداری و پارێزكاریی و فیـداكاریی و... هتـد، بەتایبـەت لـەنێو شاعیرانی ڕۆژگاری پێغەمبەردا (ﷺ) (حسان بن ثابت) ڕەزای خوای لێ بێت شوێن و پایەكی دیارو بەرچاوی هەیەو پێغەمبەری پێشەوا بەچاكترین شـێوه بەهره و توانا و بلیمەتایەتی (حەسان)ی دەكارهێناوه له بواره جیاجیاكـانی شیعرداو بەتایبەت له دەمكوتكردن و بەرپەرچدانەوەی قسه و توانج و پلاری موشـریكەكاندا، كـه بەشـیعر ئاڕاسـتەی ئیـسلام و مـسوڵمانانیان دەكـردو پێغەمبەری كاربەجێش(ﷺ) بەهەمان چەكی خۆیان بـەرەنگاریان دەبـۆوەو هەمیـشەش شـاعیری پێغەمبـەر(ﷺ) شـاعیرانی ئـەهلی شـیركی بـۆڕ دەدا، چونكه بێگومان كەسێك بەرگری له حەق بكا وەك ئەوەنیه كه لەسەر (باطل) دەكاتەوه، حەق هەمیـشه قـسەی ئـەهلی خـۆی بـەهێزو پێـزو سـوارو تـەیار دەكات به پێچەوانەی (باطل)ەوه.

**جا خوێنەرانی بەڕێزو خۆشەویستی كۆمەڵگای كوردەواری!**

سوپاس بۆ خـوا كـه هـەر لـەو ڕۆژەوه كـاروانی هەسـتانەوه و بێـداریی و هۆشیاریی دینـدارییش لـه وڵاتـی كوردسـتان و لـه نێـو میللـەت و كۆمـەڵگای كوردەواری خۆشمانـدا كەوتۆتـه ڕێ، وێـڕای نوسـەرو بانگـەوازكارو دوانـدەر (خطیب)ەكان، شان به شانیان شاعیرو هۆنەریشمان پێ بەپێی ئەو كاروانه و بگره جاری وابووه له پێشیەوەش بوونه هاوەڵ و هاوڕێی و ئەگەر نووسەرو بانگبەرو دواندەران، سـەرگەرمی تێگەیانـدن و هۆشـیاركردنەوه و بەرچـاو و

عـەقڵ ڕوونکردنـەوەی مـسوڵمانان بـوو ون، شـاعیرە هەسـت ناسـك و وردو وریایەکانیشمان خەریکی هەست بزواندن و دڵ جووڵانـدن و گـەرم داهێنـان و جوورئەت وەبـەرنانیان بـوون بـۆ مـسوڵمانەتی و خـەبات و فیـداکاریی! پـێم وانیە هیچ کەسیش نکوڵی لە دەورو و کاریگەری ئـەو هەڵبەسـت و سـردوودە بـــەجۆش و خـــرۆش و پـــڕ ســـۆزو پەرۆشـــانە بکـــات، کـــە شـــاعیرە خۆشەویستەکانمان و تیپە سروودبێژەکان لە بۆنە و موناسەبەتەکاندا بـەدڵی گـــەرم و پـــڕ حەماســـەت و دەنگـــی زوڵاڵ و خـــۆش و هەســـت بـــزوێن خوێندوویاننەوە، لە هاندان و تیژکردن و دەمەزەردکردنەوە و مشت و مـاڵ و تیـف تیفـەدانی دڵ و دەروونـی گـەنج و لاوەکانمـان دا، لـە هـەموو بـوارو لایەنەکانی جموجۆڵ و چالاکی ئیسلامیی دا.

### جا خوێنەرە سەنگین و شیرینەکان!

ئەم بەرهەمەی بەردەستیشتان کۆمەڵێکـە لـەو شـیعرو هەڵبەسـتانەی کـە برای خۆشەویستمان کاك(عوسمان سەلیم موحەممەد) کە لە نێو بزووتنەوەدا بە (شەریف) ناسراوە و نازناوی شاعیرییشی (شەریف وەرزێر)ە، لە گەرمەی کارو چالاکی ئیسلامییانەی خۆی لە درێژەی (١٢) ساڵ پتردا لە کات و شوێن و حاڵ و مەقامی جیا جیـاو جـۆراو جـۆردا نووسـیوونی و گوتـوونی، جـاوەك پێشینان گووتویانە : (گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەڕژێ)و (کاك شەریف)ێك کە تافی لاوێتی[1] لـە نێـو سـەرما و گـەرما و ئـێش و ژان و دەردەسـەری و

---

[1] چونکە کاك شەریف کە خەڵکی گوندی(قندۆڵ)ی سەر بە قەڵادزێ و لـەدایکبووی سـاڵی (١٩٦٩)یـە، کاتێك کـە لـە سـاڵی (١٩٨٧)دا هاتـە ریـزی جیهـادەوە، وەك زوربـەی بـراو هاوەڵانی دیکەی تەمەنی هەرەتی لاوێتی لە تاڵی و سوێری و گرفتاری و ناڕەحەتییـەکانی

کوێرەوەرییەکانی جیهاد و کارو خەباتی ئیسلامیی و پێشمەرگایەتی دا بەسەر بردبێ و ڕۆژانی دژوارو سەخت و پڕ مەینەتی و گرفتاریی ( قەلاتووکان) و (بەستەمەلە) و (کەڵەکێن) و (شێخ ئایش) و (بادیناوا) و (خدراوا) و (قوڵە هەرمێ) و ( نێو زەنگ) [1] و...هتدی گوزەراندبێ و لەو حاڵ و بارودۆخانەدا شیعری گوتبێ، دیارە شیعر گوتن و هەڵبەست هۆنینەوەکەی هەڵقوڵاوی خەبات و خەم و خوێن و شەونخونی و شەبەیخونێن و زۆرجیان لە شیعر و هۆنراوەی کەسانێك کەلە نەرمی خەوتوون و لە گەرمی خواردوویانە و لە جەوێکی ئارام و بێ گرفتاری و دەردەسەری دا شیعریان گوتوە و نووسیوە، عەرەبیش لە مێژە گوتوویانە ( لیست النائحة کالثکلی) شینگێڕ وەك جەرگ سووتاو نیە !

بەهەرحاڵ من نامەوێ لێرەدا مەدحی کاك شەریف و شیعرەکانی بکەم، چونکە سەبارەت بە خۆی هەرچەندە بە پیاوێکی باش و فیداکاری دەزانین، بەلام هەر خوا بەندە ناسەو (لانزکی علی الله احدا)، بەنیسبەت شیعرەکانیشەوە – کە تیپە سرووددییەکان ژمارەیەکان لێ کردوون بە سروودو لە بۆنە جیا جیاکاندا دەخوێندرێنەوە، وە من ئەو سروودانەی کە لە شیعرەکانی وی دروست کراون، بەسروودی بە پێزو تام و چێژی ئیسلامییان دەزانم، کە چ لەڕووی فۆڕم و شکڵ و چ لە ڕووی کاکڵ و نێوەڕۆکەوە تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوون، بە پێویستی نازانم لێیانەوە بدوێم و هەڵیان

---

سەرەتای سەرهەڵدان و گەشەسەندنی هێزی چەکداری بزووتنەوەی ئیسلامیی دا بەڕێکرد.

[1] ئەمانە ناوی چەند شوێن و گوندێکن کە لە سالانی پێش راپەڕینی (١٩٩١)دا، بنکەو بارەگاکانی هێزی(حەمزە)یان لێ بوو، کاك (شەریف)یش یەکێك بوو لە موجاهید و پێشمەرگە چالاکەکانی ئەو هێزە فیداکارو پڕ پیت و پێزە.

بسەنگێنم، بەڵکو ئەوە بەشاعیر و پسپۆڕەکانی شیعر و هەستی گشتی خوێنەران دەسپێرم، بەڵام مەبەستم لەم بڕە ڕونکردنەوەیە ئەوەبوو کە هەم برای شاعیر بەخوێنەران ئاشنا بکەم و هەم هاوکارییشیان بکەم کە بەهۆی شارەزابوون بەبارو دۆخ و حاڵ و باڵ و چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی شاعیرەوە چاکتر و ئاسانتر لە شیعرەکان و مەبەست و واتا دوور و نزیکەکانیان بگەن، هیواداریشم بە هۆی چاپ و بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمەشەوە زۆر لە تیپە بەڕێزو خۆشەویستەکانی سروودبێژمان چاوێکی جیددی بە زۆربەی سروودەکانیاندا بگێڕنەوە، کە پێم وایە بەشێکیان لە ڕووی فۆرم و نێوەڕۆکیشەوە زۆر کرچ و کاڵ و بێ هێز و پێزن و لە دەنگی زوڵاڵ و خۆش بیستن بەولاوە شتێکی ئەوتۆی دەست گیرنابێ و هەندێکیشیان زیاتر مۆرك و تابیعێکی فەلسەفییانەیان پێوەیەو پتر بەفەلسەفەکردن دەچن تا شیعر گوتن!

لە خوای میهرەبانیش داواکارم کە ئەو کارەی کاك شەریف قبوڵ بکات و بۆ مسوڵمانانیش بەرەکەتی تێبخات و تۆفیقیشی بدات کە لەمەودوا بەرهەمی چاکترو بەهێزو پێزتریشیان پێشکەش بکات، کە هەرچی زیاتر لەگەڵ واقیع و پێداویستی کاروچالاکی ئیسلامیانەمان دا گونجاوو پڕبەپێست و وەك پێویست بن و کاکڵدارو بەبڕست بن.

**عەلی باپیر**

**هەڵەبجە**

**١٠ ی جەمادی دووەمی ١٤١٩ ك**

**٣٠ ی ئەیلولی ١٩٩٨ ز**

# خوێنەرانی سەنگین و براو خوشکانی بەڕێزم![1]

وا بەپشتیوانی و هاوکاری خوای پەروەردگاری بالادەست، زۆربەی زۆری شیعرەکانم – کە لەکات و ساتی جۆرا وجۆرو سەروخوارو هەورازو نشێوی ڕێگای پیرۆزی هیجرەت و جیهادی – دە دوازدە ساڵێکدا – نووسراون، چاپیان بەچاوان دی و بەدیدارتان شاد بوون.

دیارە بەشێکی شیعرەکانیشم لە گێچەڵەکەی کۆتایی (١٩٩٣)دا بەرشالاوی حەزیای تالان کەوتن و فەوتان!

جا ئومێدەوارم بۆم ببنە صەدەقەی جارییە و لە بارانیاندا هەبێ بکەونە بازنەی ڕەزامەندی خواوەو(پەنا بەخوا) لەسەریان قەرزدارنەبمەوە لەڕۆژی دوایی داو بەر ئایەتی (الشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ...) (الشعراء–٢٢٤) نەکەوم، لە ئێوەش دوعای خێر و ڕاوەستاوی و ڕانەوەستانم گەرەکە و خواش پشتیوان و کۆمەکی هەمووان بێ.

لێرەدا ئاماژە پێکردنی ئەم چەند سەرنج و تێبینی یەش بەپێویست دەزانم:

١– بەشێکی شیعرەکان، بە تایبەتی ئەوانی پێش ڕاپەڕین، کە بەشێوەیەکی نارێك و سەرپێ یی بڵاوکراونەوە و گوتراون، لەم چاپەدا کەم و زۆر دەستم بەسەردا هێناون، کەواتە: سەرچاوەی سەرەکی و ڕاست و دروستی شیعرەکانم ئەم بەرهەمەیە نەك ئەوان.

---

[1] ئەمەش ئەو پێشدەستیەیە کە خۆم لە ساڵی ١٩٩٨ لە (مەدالیای کوردستان)دا نووسیوومە.

٢- هاتنەسەردنیای ئینسان، بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیەتی کە هەموویان لە خواپەرستیی دا (بەمانای فراوانی) کۆبوونەتەوە، شیعریش لای من ئامرازێکە لە ئامرازەکانی بەجێهێنانی ئەم ئەرکانە و کە ناڵێکە لە کەناڵەکانی بانگەواز و لەسەر ئەم بنەمایە شیعرم نووسیوە و دەنووسم، هەربۆیە بەچەند شێوازێك و لە ژێر ڕۆشنایی بیروباوەڕەکەم دا، ناوی خوام لێ هێناوە و بەنێو دنیای چەمك و موفرەدەکاندا کەوتوومەتە گەشت و گەڕان و هەڵگێڕو وەرگێڕ.

٣- کەڵە شاعیرانی پێشوومان، کە ئەغڵەبیان مامۆستا و زانا بوون، هەمیشە مایەی شانازیمانن و هەڵگری ناسنامەی ئیسلامەتی خۆیان و گەلەکەیانن و هیچ کەس ناتوانێ بەغەیری ئەم ناسنامەیە، ناسنامەیەکی تەزویر و قەڵب و نامۆی تریان لەپەنای چەند شیعرێکیاندا کە نووسیویانن بەسەردا ببڕێ، بێگومان دان بەو ڕاستییەشدا دەنێین کە لەشیعرەکانی ئەواندا بۆ نموونە: لەبەشی (غەزەل) کە بەبەژن و بالاو جوانی ئافرەتدا هەڵدەلێن و نووسیویانن، دەگەڵ بیرو باوەڕی ئیسلامیی دا تێك ناکەنەوە، بەڵام ئەمە هەرگیز مەرامی گلاوی ئەوانە ناگەیەنێ کە دەیانەوێ ناوو ڕێڕەوی ناڕەوای تریان بەناهەق بەسەردا بسەپێنن، چونکە وەکو چۆن ئەودەمە شێوازی شیعرنووسین (کلاسیکی)و لەسەر وەزنە تایبەتیەکان بووە، بەهەمان شێوەش پێیان وابووە کە دەبێ بەوشێوە شاعیر لەهەموو بوارو بەشەکاندا شیعر بڵێ و بنووسێ! یاخود دەشێ ئاوا لەدینەکە حاڵی بووبن، یاخود بەخراپ و گوناهیان زانیوە و بەڵام هەر نووسیویشیانە، دیارە هەریەکێکیشە هەڵە ناکا، پێویستە لێرەدا ئاماژە بەو ڕاستی یە بکەین، کە شیعری ئیسلامیی هەموو ئەوانەن کە لەژێر ڕۆشنایی بیروباوەڕی ئیسلامییدا

دەنووسرێن و دژو پێچەوانەی نابنەوە، ئیتر با لەهەر بوارو دەربارەی هەر شتێك كە هەیە نووسرابن.

٤- سروود بە شێوازێكی جیا لەبەشەكانی تری شیعر، دەچێتە نێو جەماوەرەوەو وێڕای دەقەكە، دەنگ و ئاوازیشی دەنێوخۆگرتووە، ئەمەشیان بایەخ و كاریگەری تایبەتی داوەتێ، بۆیە ئێمەش بەو گرنگییەوە لێمان ڕوانیوە، سوپاس بۆ خوا تیپی سروودی ئیسلامییش خەملیون و، كەوتوونەتە تاودانی ئەسپی بەرهەمهێنانی بەرهەمی بە پێزو ڕەسەن.

بێگومان دەبێ ئەوانیش هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابن، كە بەرهەمی بەهێزو پێزتر پێشكەش بكەن، دیارە پێداویستییەكانی ئەوشێوە بەرهەمەش، دەقی بەهێزوپێز لە ڕووی ناوەڕۆك و ڕێزمان و ئاوازی خۆش و بەهێز و تازە و دەرهێنانێكی هونەری و داهێنەرانەیە، ئیتر بە ئومێدی ئەوەی هەمیشە نیەت و نیازمان پاك بێ و شیعر و سروود و ئاوازمان بەهێز و چاك بێ و مایەی ڕەزامەندی خوای تاك بێ.

# بۆیە دەڵێم

٩ / ٣ / ١٩٨٧ تووەسوران [١]

ئەمن مرۆم
دوور لە تێڕوانینی پووچی
تیۆرێکی کۆر و درۆم
گوایە کەوا مەیموون زادەم!
نا نا! من دایەم (حەوا)یەو
بابەم (ئادەم)
من، منم، ئادەمیزادم
ئەو تاقانە زیندەوەرەم
سەرتۆپی ئەم بوونەوەرەم
کەوتۆتە ئەستۆی نەژادم
ئەرکی جێ نیشینایەتی
خوا داویەتێ
کالآبەقەد بالآیەتی

---

[١] تووەسووران: ئەو کۆمەڵگا زۆرە ملێ یە بوو، کە بەعسیە دڕندەکان، گوندی (قندۆڵ)ی ئێمەو زۆر گوندی تری وەکو: (گەناو و دەوژان و رازان و سەرشیو و ئەشکەنەو باوزێ و ئیسێوەو چەکوان و بێکڵۆو هەڵشۆ و سونێ وکانی توو و بێناسەو...هتد)یان بۆ راگواستبوو لە ساڵی ١٩٧٨، دیارە ساڵی (١٩٨٩)ش جارێکی تر لەگەڵ کاولکردنی پشدەردا، ئەویشیان کاولکردو بۆ (بازیان)یان راگواست و ئێستا وەکو کۆمەڵگا نەماوەو تەنها گوندێکی لێ یە.

خودا ڕۆیناومە سەرزەوی
زەویەکی چۆن! ؟
تابلێی کۆن
لەگەڵ ئەوەش:
ئاوەدان، ئاوەڵا، کەویی
ئەگەر سەراپای بوونەوەر دەسووژن نێم
بێت و خۆهەتڵەکەم لەوی
نادۆزمەوە
شوێننێکی تری وەك ئەوی
جا لەوێڕا بێ پسانەوە
من و زیندەوەرانی تر درێژەمان بەژینمان داوە
بەچی! ؟ بەوەچە نانەوە
دیارە ڕۆژێك ئەم هەوارە پڕ هاوارە جێ دەهێڵین
ئەمەش بەپیر و جوانەوە
بەڵام بۆ کوێ! ؟
بۆ هەوارێکی تازە و نوێ
(تێلەکە)شمان بەشانەوە
ئەمەی گوترا ڕاستییەکە بەڵگە نەویست
یاسایەکە لە بارەگای
خودای خاوەن ئیرادە و ویست
دەبێ کێ بێ! ؟
لەم ڕاستییە گومانی هەبێ لە دڵدا
بێ وەی بەڵگەیەکی پێ بێ

ئی لاڕێ بێ!
بەدەروونێکی وێرانە
لەم هەڵویستە لاملی کا
ئەگەر وابوو!
چی لە دەست دێ بڵێن بیکا
بەڵام، بەڵام
بەقەد قەبارەی بوونەوەر
من دڵنیام
زۆر چاك لەم کارە گەیشتووم
بێگومانم ئەمڕۆ زیندوو،
سبەی مردووم
دوای زەمانێ
پەردە لادەدرێ لە سەر ڕووم
کە لەگۆڕ هێنرامە دەرێ
دەبرێمە دەشتی مەحشەرێ
بەکۆڵمەوەیە تووێشووم
لەبۆم ڕادەنوێنرێنەوە
کردەوەکانی ڕابڕدووم
ئەنجامی لێپرسینەوەش
یا سەرفرازیی و ڕووسووریی
(پەنا بەخوا) یاخود سەرەنجامێکی شووم
جاکەوایە
ئەوا ئێستا پەنا دەبەم بۆ ئەم خوایە

هێندەی هێزی لالانەوەم لەنێودایە
هاوار دەکەم پڕ بە دڵ و زمان و زار
جار لەدوای جار
پەروەردگار!
بڕوام پێتە
هەموو دڵم ئێستا جێتە
مۆخم، دڵم
لە شك پاكە
مەلی گومان، لە مۆخ و دڵما فڕیوە
ئێستا باوەڕ
تاقە توێشووی (توربێن)مەو
بەتەنێ ئەوم بژیوە
بڕوادارم
تێکڕای لەش دەڵێ وەك زارم
بەندەی تۆم! پەروەردگارم!
مسوڵمانم
ڕەگی باوەڕ چۆتە نێو مۆخ و ویژدانم
چۆتە ناو گیان و ئێسقانم
چۆتە نێو گۆشت و خوێنمەوە
بۆیە دەڵێم :
ئەمجار هەموو سروودەكان
بۆ ملوانکەی ملی باوەڕ دەهۆنمەوە

# دوکەڵ

دوێنێ
دوکەڵی چڕی ئاگرێك
لە لوتکەوە تا دامێنێ
ئامێزی لە (کۆسرەت)[1] دابوو
وەستابووم و
ڕۆژنامەگەرێکی بیانیم لابوو
لێم هاتەپێشێ بم دوێنێ:
وا دیارە
نەتەوێ کورد لەو بنارە
کارگەی نەوتی وەگەڕکەوت!؟
منیش ئاخێکم هەڵکێشا
قرچەی لە هەناوان هێنام
بڕبڕەی پشتم پێی هێشا
بۆ پرسیارێ تر ڕووی لێنام
وتی: چی یە
هەر لەخۆڕا

---

[1] چیای کۆسرەت سەر بە قەزای دوکانە و دەکەوێتە پشتی ناحیەی خەلەکانەوە.

ڕەنگت گۆڕا
چرژای، پرژای
بۆ وانی یە ! ؟
وتم: نەخێر
نەتپێکاوە
ئەمە بەهۆی تۆپ بارانی
داگیرکەر و زۆردارانی
کوردستانی بێ نازەوە
هەڵگیرساوە ! !

# له كوردستانی ئێمەدا

١٩٩١ / ڕانیە

له كوردستانی ئێمەدا
له وڵاتی پڕ نەهاتیی و
ئاوارەیی و تاوڵ و ڕەشماڵ و خێمەدا
له وڵاتی... جەنگ و شەڕ و كارەساتان
له وڵاتێك... ئەوەندەی تێكڕای وڵاتان
چەوسانەوەی دەنێودابوو
دێوەزمەی شوومی زۆرداریی
چەنگ و زاری
له گەردن و قورقوڕاگەی میللەت نابوو
له نیشتیمانێك، كه زەوی تێدا دووبارەبوونەوەی
تاوانی (هێرۆشیما) بوو
لەو وڵاتە... ویستی خودا و تەمای خەڵكی بێ نەوابوو
میللەت ڕابێ
میللەت ڕابوو
تەپڵی سەری حیزبی بەعسی دیكتاتۆریان
له گۆرەپانی خەبات و نەبەردی دا
له بەردی دا!

# ڕێبوار

١٩٩٢/ڕانیه

من ڕێبوارم
پیادەم، سوارم
دنیا دیدەم
دیدەم خستۆتە سەر سینگی تێکڕای سێران
خاوەن خەزێنەی ئەزموونم
نەك ڕێبواری دوێنێ و پێران
ڕێبواری باریکە ڕێ نیم
ترسم هەبێ لە هەڵدێران
من ڕێبواری ڕاستە شەقامێکی خواییم
ڕێ ڕۆشنە
ڕێ ڕێڕەوی ملیۆنەهای وەکو منە
بزر نابم
ڕێ ون ناکەم
سەیرە چلۆن منی مرۆی هۆشیار و ژیر
لە ڕاستە شەقامێ ڕاکەم!
کوێرانە خۆم بەهەڵدێر و بیشەڵانی
چڕی شەوەزەنگا داکەم!

**نا نا، نەخێر!**

**دانای[١] زانا**

**من هەروەك چۆن، بەدیهێنراوی زاتی تۆم**

**بەسۆز و میهرەبانیشت**

**ئاوەهایە بڕیاری خۆم**

**ڕێبوارێکم**

**تەنها لە ڕێی تۆوە دەڕۆم**

**تەنها لە ڕێی تۆوە دەڕۆم**

---

[١] دانا: لێرەدا لە جیاتی کاربەجێ(حکیم) بەکارهاتووە نەك بەمانای(ژیر)، چونکە سیفەتی عەقڵ و ژیری بۆ خوای بێ وێنە و هاوتا دروست نی یە بەکاربێت.

# لافیته

١٩٩٣ / سەرئەشکەوتان

من کوێستانییم
دۆستی بەفراو و قەڵبەزە و مێرگ و کانییم
بەخواردنەوەی ئاوی سوێرو
هاڵاو و بای گەرمەسێرو
هەڵمژینی هەوای تەڵخ
ئاشنا نیم
بەرزە فڕم
هەڵۆی دەوری دوندی چیام و
هەتا مابم
بۆ لوێچێك دان
تیکەیەك نان
چۆلەکەیەکی بەستەزمان
نەوەی نابم
.......
لە ئاسمانی ساماڵەوە دەچریکێنم
هاواری من چەخماخەیەو
زراوی هەموو کوندەبوویەك دەتۆقێنێ
دەمی مەقەستێکی تیژە
دەنووکی هەموو باشوویەك دەقرتێنێ

چەکوش و کوینە
سێ بەندە و پشتی بەراز و فیل دەشکێنێ
تیغی بڕندە و ڕەسەنە
سەری حەزیا دەپەڕێنێ
بۆنی بێژانی بەندەنە
فێنکایەتی بەسەر دڵی سیس دا دێنێ
.......
لە بەرزیم و سێرەی دیدەم
دەگەڵ تێڕامانی قوڵ و سەرەنجی ورد
ئاراستە کردوە بۆ (قەندیل)
(کاروخ)و (سەفین)و (هەڵگورد)
چاوم لێ یە
هەرکامێکیان سێ لافیتەی
ڕەش و سوور و سپی پێ یە
بۆ نەوەی نوێی نەتەوەی کورد
لافیتەی ڕەش لێ نووسراوە:
بەهەڵدێری لاپەڕەی ڕەشی ڕابردووی
مەملەکەتی وێرانەدا شۆڕ ببنەوە
خاك و خۆڵێکی سەراپا ئەنجن، ئەنجن
پەرێزێکی پیس و پلتۆخ
ئاسۆیەکی ڕەش و لێخن
تۆفانی خوێن و فرمێسك
کاروانێکی لە ڕێگا ون

نێچیرێکی بەستەزمان و
مەفرەزەیەك ڕاوکەری چەمووش و گرگن
لەبەرچاوە !
.......
لافیتەی سوور لێی نووسراوە:
پیاح لەو جانەوەرە سەیرە !
لەو ساتەوە کە تروکاوە
خەرتەل لەژێر باڵ و پەڕی شەڕی ناوە
لەسەر تەختەڕەشی دڵی ڕەش و ڕەقی
کامەی یاسا و ڕێسای ڕاوە
بە تەپاشیری دوو ڕوویی و بێ بەندوباریی و بەدخوویی
ڕەنگ و نەخشی بۆ کێشاوە
بەخۆشەویستانم بڵێم
ئەم جانەوەرە لەوساوە
بۆتە مۆرانەی خواناسیی و
خەزانی هیوای گەل و خاك
بۆتە کرمی ڕەگ و قەدی
باخی خەملێوی ڕەوشت و
بیری ڕەسەن و پوخت و پاك
بۆتە پوازی
ڕازو نیازی
تەبایی و دەستەملان بوون و خۆشەویستی کۆمەڵ و تاك
بووە بەسەڵبەی بەلەمی

ڕەوە ڕاوکەری گەنجینەی بنی دەریام
بڕواتان بێ
لەوەتای من لەم خاکەدام
ئێستا و پێشووم
نەم دی، نەمبیست
جانەوەرێکی دی واشووم
موغریزاوی بۆ خوام و خۆم
بۆ خەڵك و خەبات و خوێن و
خاك و خەرمان و خەندە و خووم
.......
لافیتەی سپی لێی نووسراوە:
بەتەنها ئەو...
ئەو پەیامەی لە سەردەمی شەختە و بەستەڵەکی ژینا
ئێمەی دەرێنا لە زاری ئەژدیهای شەو
ئێمەی پەنادا لە چەنگی
چەپەلۆکی گێژاوی خەو
بەتەنها ئەو...
ئەو بەیداخە شکۆدارە شکاوەیە...
کە پرشنگی ئاسۆی ئازادیی گەلانی چەوساوەیە
کە سوپای دادو ڕزگاریی و
هۆش و پەرۆش و بەختیاریی بەدواوەیە
کە بێجگە لەو
گەردەلوولی نەگبەتیەکی نەپساوەیە

دوا پەیامی لافیتەی سپی دەستی چیاکانی کوردستان
ئائەمەیە:
نەوەی نوێی کورد
نەوەی نوێمان
ئەو گیانەی قەت
ناکرێ جوێ بێتەوە لێمان
ئەو درووشمەی
بۆتە سیماو دەنگ و ڕەنگ و ڕەنج و ڕێمان
ئەو داینەمۆیەی دەروون و
دڵ و دیدی خستووینە گەڕ
هەر یەك ڕازە
ئەویش باوەڕ

# بروسکەی سەفین

١٩٩٣

ئەمڕۆ (سەفین) بروسکەیەکی

بۆ (قەندیل)کرد

قەندیل، قەندیل!!

گوێ ڕادێرە لە پەیامی نەوەی نوێی کورد

بۆ ژین و مان

بۆ خەبات و بۆ کوردستان

یەك بەرنامە

ئەویش: قورئان

# یەکبوون

١٩٩٣ / سەرئەشکەوتان

خۆشەویستان!!
ئەوەی دەستمان لە گەردنی
کێلی ئازادیی وەردێنێ
ئەوەی دواخشتی بنچینەو
دیواری ستەم دەردێنێ
ئەوەی بارانی بەختیاریی
بەسەر ژیندا دەبارێنێ
ئەوەی ئەمڕۆ دەپشکوێنێ
خونچەی هیواو ئاواتی هەزاران دوێنێ
بێ چەندوچوون
تەنها هەردوون
یەکەم: ساغبوونەوە بۆ خوا
دووەم: یەکبوون

# باوەڕ

باوەڕ بورکانی بەگڕە
کێوی ستەم لەبن دێنێ
وەرزی زیندووبوونەوەیە
بەهارێکی هەمیشەیی دەڕەخسێنێ
سەرچاوەیەکی سازگارە
تینوێتی ژیان دەشکێنێ
خشتی دادە
پێکهێنەری قەڵای مەحکەمی دادگەریی و
ئازادیی ئادەمیزادە

# مەدالیای کوردستان

هۆ کوردستان!!
خاراوی ژان
گیرۆدەی دۆستی نەزان و
نێچیری دوژمنی زۆرزان!
شەلاڵی خوێن
بێنازو شوێن
چاوم لێ یە لە سۆراغ دای
ئاخۆ مەشخەڵ بە دەستانی،
ڕەسەنایەتیت کێن، لە کوێن!؟
پاش سەرەنجدان
لە ڕیشی سپی (قەندیل)و
بالآی بلندی (هەلگورد)و
سیمای (جودی)و (پیرەمەگروون)و (هەندرێن)
چەند مەفرەزەیەك پێشمەرگەت بەدی کردن
بە بناری چیای خۆزگە و ئومێد و چاوەڕوانیتان
ڕادەبردن
تۆش گەلێك ورد
هەروەك چۆن کورد
ڕاماوە لە ئاسۆی گەشی ئازادیی خۆ
وەك چۆن ئاسۆ

چاو دەگێڕێ، لەچاوی خۆر
وەکو چۆن کۆر
بۆ بینایی
وەرزی پایز، بۆ شینایی
دڵی پاك، بۆ سۆزی خوایی
منداڵ، بۆ شیرو لای لایی
چاو دەگێڕێ، چاوت گێڕان
بینیت یەکیان
وێڕای چەکیان
قورئانیشی بە دەستەوە
بۆیە تۆش بەوپەڕی ڕێزو حورمەت و سۆزو هەستەوە
کاتێك کەوا
ئاڵاهەڵگری ناسنامەی ڕەسەنایەتیی خۆت ناسی
مەدالیای ئافەرینت
بە بەرۆکیدا هەڵواسی!

# سێ نەمام

١٩٩٤ / ڕانیە

لە هەواری بەهاریی دین و ژینما
سێ نەمامی هەمیشەیی و ڕیشەیی هەن
ئەم باغەیە خودا ناشتی
تەنها بە ئاوی سازگارو
پاکی کانیی باوەڕ داشتی
نەمامی یەکەم: ئازادی
هی دووەم: داد
سێیەم: ئاشتی

# بۆ سەلاحەددینی ئەییوبی[١]

٢ / ٣ / ١٩٩٣ /رانیە

هۆ باپیرە !
نەك هەرمنی نەوە و ڕۆڵە
کوڕی خاکی خوێن و تۆڵە
دڕکی دڵی داپلۆسین و ژان و ژارو ستەم و زۆر
دۆست و شەیدا و تامەزرۆ و دەستەملانی خۆر،
تۆم لەلا سەرکردەیەکی ئازاو ژیرە !
نەخێر، تەنانەت شەمشەمەکوێرەکانیش
لەهەر بەرە و پێڕ و تیرە
کامەی توند توند
ملی بە بەندی کەمەندی، پڕ خەشمی لاڕێیی گیرە
ڕەنج و ڕەندی و ڕاو ڕابوونی تۆی لەبیرە !
......

---

[١] ئەم شیعرە لە شەڕ و گێچەڵی کۆتایی (١٩٩٣) لە(سەرئەشکەوتان) لەگەڵ زوربەی شیعرەکانی ئەوکاتەمدا کەماڵەکەم لەوێ بوو، بەر شالاوی تالان کەوتبوو و فەوتابوو، بەلام بەهۆی خوێندنەوەی لە ئاهەنگی(٨٠٠) ساڵەی لەدایکبوونی (سەلاحەددینی ئەیوبی) لە ١٩٩١/٣/٣ لە سلێمانی و پارێزرانی بەهۆی کاسێتی ڤیدیۆوە لەلایەن برای بەڕێزم کاك(عوسمان موحەممەد صالح)ەوە، سوپاس بۆخوا لەسەروبەندی چاپکردنی دیوانەکەدا لە ١٩٩٨ لە ڕێی برای خۆشەویستی ناوبراوەوە، نالی گوتەنی: بەدیداری ئەم(جگەرگۆشەیە) شادبوومەوە.

باپیرەکەم!

ئەوساتەی کە بەشمشێرە بڕندەکەت

لە ژوانی ژان و ژین و

تێکچڕژانی گۆڕەپانا

ئەستۆی تاریکت پەڕاندو

ڕەوە بەرازت بەزاندو

(خاچ)ت ڕانا

ئەم دیمەنە وەك تۆمارێکی ڕاستەوخۆ

لە مۆزەخانەی دەروون و دڵ و دیدی هەموومانا

دەگەڵ سیماو ڕووخساری پڕ لە جەوهەر و جوامێریی تۆ

بوون بە تابلۆ

......

کێ بوو نەیبیست!؟

دوێنێ لەبەرامبەر ئەقسا

کەللەی کوفری ئەفسانەی خاچ

بەسێدارەی نوکی تیژی شمشێرەوە

سەدجار خۆڵی

خاکی بەری پێی باپیرەی

نەك تەنها ڕامووسین و ماچ

بەڵکو بەگشت دانەکانی

وەك نوێڵ و پاچ

هەڵدەکۆڵی

......

باپیرەکەم!
گەلێك جارو لە زۆر شوێنا
دێوەزمەی شوومی شەوەزەنگ
شاڵاوی شێتانەی هێنا
تا شمشێرە هەقخوازەکەت
لەخۆڵ نێن و
دەنگی بانگ و نرکە و هاواری پەیامە ناوازەکەت
سەرببڕن و
لاشەی لە نێو لمی بیبانی چۆڵ نێن و
هەروا سێنا
ئەم پاڵەوانیە بنوێنن
مەلی دوندی کوێستانی هەق و نەبەردی
لەناو تین و شەپۆلی لافاوی خوێنا بخنکێنن
......
ئای لە خەیاڵاتی خاوی
مێشکی وشك و داتەپاوی
پێڕی گەمژەی شەمشەمەکوێرەی بێ شەرم!
چۆن لە گێژی بەگوڕی گومڕایی دا، دەخولێنەوەو
بەدەست و مستێکی گەرم
تەمایانە و دەیانەوی و وا لەفێڵن
بەگێژەڵووکەی ڕەشەبای داخی دەروونی کرمێیان
خۆر لەبەری تۆقی ئاسمان
بکوژێننەوە و نەیهێڵن

قەت نازانن! !
جوتیاری شاخی قەندیلن و
بەبرۆ و برژانگان دەیکێڵن!
......
ناحەزانی ڕووناکی و خۆر!
واتێ نەگەن، باپیرەی کەڵە سەرکردەم، بێ وەجاخە
چاك بزانن!
هێندەی کوردستان مەڵبەندی دارستان و چیا و شاخە
ئەمڕۆ نەوەی نوێ ڕابووەو
شمشێرەکەی باپیرەیان بەدەستەوە
هەرهەموویان، کێن و لە کوێن
بەیەك دەنگ و هۆش و هاوار و هەستەوە
خەریکی درەوی دڕکی ڕێن
دەڕۆن، دەڕۆن
ئەو پەڵە هەورە ڕەشانەی
پەردەی بەری خۆر و ئاسۆن
ئەو تارمایی یە چەمووشانەی
لە بەرانبەر ڕووناکی دا
ئەبڵەق و تاساو و نامۆن
ئەو ناحەزە نابووت و سەر بەهەشانەی
لەڕووی خۆردا کوێر و کەڕ و کڕ و لاڵن
بە پرشنگی چەخماخەی تین و تەوژمی هەق و ڕاستیی
بەرەو زبڵدانی مێژوو، ڕادەماڵن

# هۆ سەرایڤۆ[1]

١٩٩٤

هۆ سەرایڤۆ!
شین مەگێڕە
بۆ لافاوی کارەساتی وڵاتی خۆ
دڵنیابە
قوڵپەی خوێنی قورگ و ئەستۆ
ویزەی گوللە و سیڕەی قامچی و
هەڵکێشانی نێزە و چەقۆ
لێزماوی ئارەقەی شەرمی
خوشکی ڕووسووری دڵ بەسۆ
لەسەرێك کەڵەکەبوونی،

---

[1] پایتەختی وڵاتی (بۆسنەو هەرسك)ە، سەرەتا لە ١٩٩٢/٤/٦وە خودی سەرایڤۆ لە سەر بنەمای رەگەزپەرستی، کەوتە بەر شاڵاو و ئابڵۆقەی صرپە دڕندەکان و لە ماوەی (٤٣) مانگدا زیاتر لە ١٢٠٠٠ هەزار کەسیان تێدا کوشت، ئەمجار زۆر لە ئاوەدانیەکانی ئەو وڵاتەیان وێران کرد و کەوتنە کوشت و بڕو قەڵاچۆکردن و دەرپەڕاندنی خەڵکەکەی، قەسابخانەکانی (سربرنیتشا و مارکال)یان ئەنجامدا بە سەرۆکایەتی (سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ)ی دیکتاتۆر، تا ساڵی ١٩٩٥ سەد هەزار کەسیان کوشت، کە ٢٠-٥٠ هەزاریان ئافرەت بوون و زۆرینەی زۆریان مسوڵمانانی کەساس و بێ دەرەتانی بۆسنە بوون و زیاتر لە دوو ملیۆنیش ئاوارە بوون و بەم شێوەیە جارێکی تر مسوڵمانان ڕووبەڕووی قڕان و جینۆساید بوونەوە.

تەرمی پاکی ڕۆڵەکانت مەڵۆ، مەڵۆ

قافڵەی ئاوارەییت تێکەڵ

بەغوربەت و شیوەن و ڕۆ

لە ئاسۆی بەرەبەیانی

ڕابوونی ئیسلامیی ئەمڕۆ

دەبنە سروود و مەشخەڵی

کاروانی هەوڵ و خەباتی خوێناویی تۆ

## بۆ كۆساری [1]

١ / ١٢ / ١٩٩٤ رانیه

هۆ كۆساری!
ئەی شاعیره بێ نازەكه
شاعیره شیرن ڕازەكه
شاعیره خۆش ئاوازەكه
لەوكاتەدا
كەوا ڕەوه بەرازەكه!
وەنێو دەغڵی
جوتیاری كێڵگەی هەق كەوتن

---

[1] خدر مەحەممەد رەشید– ناسراو بە (خدر كۆساری) ١٩٦٧ لە رانیه لە دایكبووه، هەرچەندە لە نفوس دا، بە لەدایكبووی ١٩٧٠ تۆماركراوه، بەڵام ١٩٦٧راستیەكەیەتی، تا پۆلی یەكەمی ناوەندی خوێندوویەتی، ١٩٨٧ پەیوەندی بە كاری ئیسلامییەوه كردووه، هەر لەوساڵەشدا دەستی بە نووسینی شیعر كردووه، لە راپەڕیندا رۆڵی بەرچاوی بینیوه، لە زۆر كۆڕ و بۆنەدا شیعری خوێندوونەوه و سەرجەم شیعرەكانی خۆی لەبەر بوون و خاوەن دەنگێكی زوڵاڵ و پەیامێكی پرشنگداره، ١٩٩٣/١٢/٢٧ لە گوندی (رەسواجیان)ی پشدەره رەقە لەلایەن ناحەزانی بیر و قەڵەمی رەسەنەوه شەهید كراو لە گۆڕستانی كێوەڕەشی رانیه نێژراوه، لە مانگی ١٢/ ١٩٩١ بەشی یەكەم و ١/٢/ ١٩٩٣ ش بەشی دووەمی شیعرەكانی ئەوكاتەی بەناوی (سەدای كۆساری) لە لایەن خۆیەوه لەسەر كاسێت تۆماركراون و ١٩٩٨ یش بۆ یەكەمجار دیوانەكەی بە ناوی (بورکانی شیعر) چاپ و بڵاوكراوەتەوه. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر كۆساری، بروانە كتێبی (دیداری كۆساری) ٢٠١٤، ئامادەكردنی: شەریف وەرزێر.

من دەمزانی
گێلن، گەلحۆن
خۆرەی ناوخۆن
خەزانی وەرزی ئازادیی
هەزارانی وەك من و تۆن
لەڕاستی ڕەسەنایەتی
ئەم خەڵك و خاكەدا نامۆن
وڕن، هەوتن
هێچ تێ ناگەن
لە ژێری دا
لە ئاستی ڕۆشنبیریی دا
نەك بەچۆكیان
دوورە بەنوكی نینۆكی
پەنجەی پێ كانیشیان ڕاگەن
......
من دەمزانی ئەم بەرازە دڕندانە
هی جەنگەڵی كام بنارەن!؟
ئەم شووم و گورگەمێشانە
پاڵەوانی تراژیدیای
كام نیشتیمانە زامدارەن!؟
ئەم هەرزە و دێزە و شێتانە
چەقۆ وەشێن و بێ عاری
كۆڵانەكانی كام شارەن!؟

ئەم جەللادو ژەندرمانە
بەردەبازی
پێی پیادەبوونی ئامانجی کام زۆردارەن! ؟
ئەم بازرگانە قۆڵبڕە نێودەولییانە
قوشقی خششەو
ڕووخساری کام مارکی پارەن! ؟
من دەمزانی ئائەم شەمشەمەکوێرانە
چ ناحەزێکی سەرسەختی ئەم پەیامە شکۆدارەن! ؟
......
هۆ کۆساری!
ئەی شاعیرە (بێدار)ەکە
بێداریی تۆ
دەنگ و بانگ و هاواری تۆ
پەیام و نەخشی کاری تۆ
مەشەخەڵێکی کڵپەسەندوون
هەرگیز بە فووی دەم و هەناوی هیچ لایێ
ناکوژێنەوە
درەختێکی هەمیشە سەوزن
بەبای خەزانی پاییزو
بەفر و بەستەڵەکی زستان نابڕێنەوە
قەندیلی ڕەگ داکوتراون
بە بورکان و گەردەلوولی هیچ دەورانێ
ناتوێنەوە

پێشمەرگەی زەنگاڵ لە پێ و توند و تۆڵی
ڕێگای (ذروَةُ السَّنام)ن [1]
دەڕۆنە پێش لەنێو لافاوی خوێنەوە
تەنها نین و
سەدان تیپ و هێزو مەڵبەندی پێشمەرگەی،
گیان فیدایان بە شوێنەوە

[1] ئاماژەیە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) (... وَذِرْوَةُ سنامه اَلْجِهادْ) ترمزی گێڕاویەتەوە، واتە: لوتکەی هەرەبەرزی ئیسلام، جیهاد و تێکۆشانە.

# ناسنامەی ڕەسەنایەتی

١٦ / ١٢ / ١٩٩٤ رانیە

لە ترۆپکی چیای ڕاشکاوی ڕا، دێم و
شیعری دیوانی دەروونم
خشتی بنچینە و دیواری قەڵای بوون و ئازادی یە
خوێنی دەماری پەیامە ناوازەکەم
سووتەمەنی مەشخەڵی شەو و شێواوی و بێ دادی یە
سروێك لە شەماڵی سۆز و پەرۆشی ڕێم
زەردەخەنەی جیهانێك لێوی لافاوی ئەشك و ئاهو
(قولە) و (زەڵم) و (سەروچاوە)[1]ی،
ئۆخە و ئۆخژن و شادی یە
......
گەردەلولی چەواشەیی!
ناسنامەی ڕەسەنایەتیم
دەریایەکە...
بەلیکی دەمت پیس نابێ
بەهارێکە...

[1] سێ سەرچاوەی جوان و سازگارن، یەکەمیان لە رانیە و دووەمیان لە پشتی گوندی (ئەحمەداوا)ی خورماڵ و سێهەمیشیان لە شارۆچکەی سەروچاوەی بیتوێنە.

بەبای خەزانت سیس نابێ

درووشمێکە...

سپات نابێتەوە تامابێ

خۆری ئاسمانی ئومێدە

هەریەك سات و سەد سپێدە

بەرزە تا ژین

دەمی لە کانیی ژین دابێ

شەوگاری شووم!

من ناسنامەی ڕەسەنایەتی خۆم پێ یە

من دەزانم

ڕێگای ڕووسووری و بەختیاریی

هەمیشەییمان کام ڕێ یە

من لێرەوە

لەنێو ئەم هەموو جەنجاڵی و هەڵدێرەوە

چاك دەزانم چەپکەگوڵی سەرفرازیی

لەنێو گوڵزاری بەزەیی و سۆزی کێ یە

من شەماڵی ئاوەدانیی مەملەکەتێکی خاپوورم

ئەرکی دەست و پەنجەی شەماڵ و ڕەشەبا، یەجگار جوێ یە

من هەڵگری نوورو ڕۆشنایی خۆرێکم

ئاوا نابێ و هەمیشە و بەردەوام نوێ یە

من دانیشتووی نیشتیمان و هەوارێکم

نەك هەر ئاسوودەیی ئینسان

هی دار و بەردیشی لێ یە!

لەم شەوگاری ئەنگوستەچاوی جیهانی،
بوونی زاتە بوودەڵەکان
لەم جەنجاڵی و غەوغای هێماو
سیماو درووشمە بێ ناو و پووچەڵەکان
لەم بازاڕی مزگەوتی (ضِرارْ)[1] و هەزار میحراپەدا
من ڕێبوارێکی زیتەڵی بەرچاو ڕوون و
ئاشنای ڕازی ناخی (بوون) و یاخی بوونم
بەنێو ڕقی گەردەلوول و بوڕکان و بوومەلەرزەدا
گوزەر دەکەم
نەهیچ ساتێ
چاوی گەشی خەمی دەروونی بێدارییم، چاو لێك دەنێ
نەهیچ لەشکرێ بە ئەڵقەی گەمارۆی دەورم دەتەنێ
نەقەت نوێڵێ تەلسمە بەردێك لە شاخی،
قەندیلی ڕەسەنایەتییم هەڵدەکەنێ
نە بەنووکی قەڵەمی زڕ
زمانی شڕ
دانی تیژی گەماڵی دڕ

---

[1] بەناو مزگەوتێك بوو موناقیقەکان بۆ دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) دروستیان کردبوو، دوایی بە فەرمانی خوا تێکدرا، دیارە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا شتی تری ساختەش وەکو(کەس و لایەن و ڕێکخراو) دروست دەکرێن بۆ شێواندنی ئیسلام و دژایەتی مسوڵمانان!!، خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەم بەناو مزگەوتەی کردووە (...وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا ...التوبە – ١٠٧).

دڵی دڵنیایی بوونی من، ڕادەچەنیٚ
نە بەتین و تەوژمی هیچ ڕەشەبایەك
تەنها لکی داربەڕوێکی دارستانی،
بناری بیروباوەڕم ڕادەقەنیٚ
......
هۆ داوەڵە داڵە ڕووت و ڕەجاڵەکە!
تۆ داوەڵ نی
هەی دانای داهێزاوی داوی دەستی تاریکایی!
تۆ خۆت خستۆتە بەرتین و گڤە گڤی بای بیٚ باریی
بای بێزاریی
بای خەزانیٚ
بای کاوێژی کینەی کۆنی ناحەزانیٚ
بای ئەفسانەی فەلسەفەیەك کە نازانیٚ،
ئەم نیگارە!
نەخشەی نەخشی کام ئەندازیاری دانایە!؟
تا هەنیەی بۆ، لە ڕووخساری خاك بخشێنیٚ
ئەم مرۆ ژیر و شاکارە!
دەوارنشینی هەواری کامە نیاز و کام بنارە!؟
ئەمڕۆ و وادەی گزنگی بەرەبەیانی ئاسۆی دوێنیٚ
ئەدی سبەی ئەم کۆچەرییە کۆڵ لە کۆڵە، توندوتۆڵە
ئاخۆ بەخێر، سەربەرەوژێر، بۆ چ شوێنیٚ!؟
ئای لەفەلسەفەی ئەفسانێك!
کە لە ئاقاری وەڵامی چەخماخەی پرسیاری بوونا،

دۆش دامێنێ

لەجیاتی وەی، هەورە تریشقەی

وەڵامی ژیرانە بێنێ

هەتڵە دەبێ و

دەبێ بەرەو خاکی خەم و تەم و تاو تارمایی ڕاکا

لەجیاتی وەی، ڕستەی بەڵگەی

ڕازی ڕاستیەکان ڕانوێنێ

دەبێ گێژانە ملی خۆی،

بەخوڕی گێژی ڕاڕایی و گەرووی چەواشەیی داکا

......

هۆ ڕێبوارە نەشارەزایە نامۆکە!

تۆ نامۆ نی!

ئەی هاوڕێ یە سەرەڕۆکە!

ئەم ڕەنگە قەترانیە لەبەر، چاویلکەی بیروچاو لادە

لە گوێ...

لۆکە

تفەنگ بەتاریکی یەوە مەنێ و سێرە بگرە

بەدووربینی ویژدانی زیندوو و ئازاوە

سەیری ناخی بوونی (خۆ) کە

ئەم سەرچۆپیەی کەودەنێکی کورتەباڵا گرتوویەتی

بۆ ئاهەنگ و داوەتی پیرەمەگروون و سیمای ئەم بیرە نەزۆکە

ئەم سیمینارەی سیاسیەکی ساختەچی سازاندوویەتی

بۆ نواندنی ئازایەتی پاڵەوانی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە

وڕێنەیە...

خەیاڵ و خەڵەفاندنە...

تۆفانی تاڵاو و خەمە...

جادووی جەنگێکی ئەتۆمی زەین و فام و

(نوگرە سەلمان)[1]ی ئیبادەی ماك و بوونی بنیادەمە

خنکاندنی (هیرۆشیما)و

دۆزەخی قرچانی جەرگی دایکی هەڵەبجەی تاوانی،

خولی یارییە جیهانییەکانی سەردەمە!

......

هۆ دیمەنە قەشەنگەکان!

ئاخۆ دیدی گەشی ئێوە

لە پەنجەرەی (دید)و (گوڵ)و (چۆڕە ئاوێ)

چۆن دەڕوانێتە ڕووخساری،

ڕەنگە ئاڵۆزو بودەڵ و دەبەنگەکان

چۆن دەڕوانێتە ئاکاری

---

[1] یەکێکە لە لە زیندانە هەرە شوم و کۆنەکانی عێراق و دەکەوێتە بیابانی نزیك سنووری نێوان عێراق و سعودیە و سەر بە ناحیەی (سەلمان)ی شاری سەماوەی پارێزگای موسەننایە، ئەم بەندیخانەیە یەکەمجار لە بیستەکانی سەدەی رابردوو لەلایەن دەوڵەتی داگیرکەری ئینگلیزەوە دروستکراوە، رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەگشتی و بەعسیە دژی دین و کورد کوژەکان بەتایبەتی، کردبوویانە قەسابخانەی بەرهەڵستکاران و خەڵکی بێ تاوان، دیارە بەشێکی بەرچاوی (بەناو ئەنفالەکان)یشی تێدا زیندانی و دواجار زیندە بەچاڵ کران، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٨٨دا!

ئەکتەرە بێ بەندوبارو
لەقتە شانۆیی یە نەنگەکان!؟
چۆن دەڕوانێتە ڕاداری
بیری تارماییە تاساوو
تەنە بێ ناوك و سەنگەکان!؟
چۆن دەڕوانێتە جواناوی
مەرگی ئەم نزارە چڕە!؟
(مانگی چواردە حەوجێ بەئەنگوستێ ناکا)
ئێوە بەسینەی لە جۆش و
شنەی شەماڵی پەرۆش و
خوناوەی چاوی وەنەوشە،
باوەشێنی بێداریی ئەم جەنگەڵە سامناکە دەکەن
ئێوە بەخەندەی لێوی تابلۆی گەردیلەکان
گەمەی پڕوشەی کلوەبەفرە نەشمیلەکان
مەلەی ئەفسوناوی هەردووك بیلبیلەکان
تەمەنی خۆ، لە ڕێی ژوانی
ئەوینی هۆش و ژیری دا، بەسەر دەبەن
ئێوە ئەوەندی پانتایی کام بیابانی لە چاو ونە
کام ڕووباری، دوور و درێژ و مەزنە!
کە بەدیداری ویژادنی مرۆ دەگەن!
زیاتر لەوان
لە قوڵایی خاکی پاکی ویژدانێکی بەویژدانا
خاوەن ڕەگەن

چما چی یە ! ؟
ئەم گیاندارە خاوەن گوێ یە بێ گوێیانە
هەر لە گوێی گادا دەخەون !
ئەم باڵندە یەك باڵانە
گومان دەبەن بەتەوژمی تەنیا باڵێ
بەرەو لوتکە سەردەکەون !
ئەم پایزە خوێن تاڵانە
وا تێدەگەن سەرتۆپی وەرزەکان هەون !
ئەم خامە وشك و لاڵانە
لاف لێدەدەن، چاوگی وزەی بازووی نەوەی نوێی نەسرەون
ئای لە فاك و فیکی گەزی، حەزی حوتی چەواشەیی !
گەرەکیەتی، وا پیشانی هەڵگورد و سەفینی (مە) دا
شیری مەڕ و لیکی گورگ
ئاو و ئاگر
خەزڵوەر و خاکەلێوە
لەبۆتەیەکدا دەمەیی !
......
هۆ مۆتەکەی کورپەی زەینی ئەم ئاپۆڕە !
تۆ ڕاوکەرێکی چڵکن و
ئەوەی لە هەگبەی ڕاوت دا
قولاب و ژەهر و تێنتی و تۆڕە
کەچی تیرەماسی ڕۆخی کەناری دەریای بێدارییم

باڵی هێندەی باڵاو بەرینی پاپۆڕە
ئەوەی لە ناو فەرهەنگی پەڕپووتی
بیری بەدناووت دا
لە تاقیگای زانکۆی تێڕامانی ڕادا
وەك بلّقی ئاو
(شورەی بەرلین)ی تێك ڕووخاو
گۆڕبەگۆڕە
کەچی مانای خەرمانی کەشکۆڵی وشە
لە فەرهەنگی ڕاستیی و ڕەسەنایەتیما
جیهانێکی شکۆمەندانەی نەگۆڕە
ئەوەی لەناو کۆگای دەروون و باخەڵتا
زەلکاوی بێ بڕوایی و
ژان و شیوەن و ڕاڕایی و
جڵێتاوی بەدڕەوشتی و بەرهەڵدایی و
پوڵ و پۆست و ژەهر و فیشەك و قاپۆڕە
کەچی ئەوەی لەناو ناخی دڵی من دا
چیای بەرز و ڕۆچووی باوەڕو
دەریای بێ بنی دڵنیایی و
ڕووباری پەرۆش و سۆزە
بەهاری زەردەخەنە و ڕێز،
بورکانی ڕقی پیرۆزە

# خەملیینەوە

١٩٩٥ رانیە

چەپکێك گوڵیان
لەناو گوڵزارێکدا ڕنی
سەری لوێچێك خونچەیان پساند !
کەچی لە دوای چاولێك نانێ
لە شوێنی هەر خونچێ، باغێ
لە جێی هەرگوڵێ، گوڵزارێ
وێنەی (گوڵان)ی بەهارێ
خەملیینەوە ! !

# برووسکە

٢٧ / ٢ / ١٩٩٥ رانیە

لە کەناری مەملەکەتی ڕازونیازی بەهارییما
خەزلۆەر و زریان و باوبۆران هەیە
لە کەناری مەملەکەتی منارە و بەردە قارەمان
حەربی ئیبادەی پیلانی ڕەشی دیکتاتۆران هەیە
لە کەناری مەملەکەتی شامی شەریفی زێدما
تەراتێنی گورگ و چەقەڵ،
جەردە و دزوبۆران هەیە
لە کەناری مەملەکەتی نەخشەی
یەکخستنەوەی دڵی لەت لەتم دا
تاعونی تەونی شەیتانیی،
لێك ڕاسانی بادینان و سۆران هەیە
لە کەناری مەملەکەتی زەردەخەنەی
دەمی خونچەی گوڵزاری برِوای هەڵەبجەش
هەڵەبجە مژدەی ئاسۆی گەش
هەڵەبجەی پرشنگی خۆری شەوگاری ڕەش
تۆفانی مەرگی کیمیایی، تاغووت و خوێن خۆران هەیە
***

هۆ هەڵەبجە!

ئەی ئەشقی هەڵقرچاوی من

سەربازی ون

دەمێکە لە دووت دەگەڕێم

سەراسوێمە و قەندیلم دواند

دەشتی شارەزوورم گریاند

منارەکەی (شێخی چۆڵی)[1] و

(قەڵات)ی هەولێرم هەژاند

چەند شیعرێکم لە کورەی دەروونما سووتاند

بۆ ژوانی تۆ

بۆ زیارەتی مەچەکی ئەرخەوانی تۆ

بۆ چریکەی نرکەی تەکبیرەی سروودی،

ڕاچەنینی دیوانی تۆ

بۆ زەماوەندی زایەڵەی کاروانی تۆ

بۆ تۆ، بۆ تۆ

تۆی ڕابوو، لە مۆتەکەی شەو

***

[1] ئەم منارەیە لە سەردەمی سوڵتان مزەفەرەدین دا کە لە (٥٢٢ –٦٣٠) کۆچی ژیاوە، لە نێوان ساڵانی(١١٢٨ –١١٣٨) زایینی دا دروستکراوە و بە منارەی (مزەفەریە) بەناوبانگە و لەلای خەڵکی ناوچەکە بە (منارەی چۆڵی) ناسراوە، ئەمەش لەبەرئەوەی لە چۆڵیدا بووە، کۆی بەرزیەکەی ٣٧ مەترە و کیلۆمەترێك لە (قەڵای هەولێر)ەوە دوورە، شوێنەوارێکی دێرینی کوردستان و شارستانێتی ئیسلامییە.

هۆ هەڵەبجە !

سەنگت ئاوێتەی جەوهەری،

شمشێری شۆڕشی هەق و ڕقی پیرۆز حەڵاڵە

ڕەنگت تەرمی شەهیدی بەخوێن شەڵاڵە

دەنگت پەیامی زوڵاڵە

لەم شەوگارە شووم و ئەنگوستەچاوەدا

بروسکەت پێ یە

بروسکەت کڵپەی، مەشخەڵی ڕابوونی نوێ یە

بروسکەت چاو و قاچ و گوێی دەلیلی ڕێ یە

لە (شنروێ)وە بۆ هەموو دارستانی بنارەکان:

بنارە پڕ ئازارەکان !

هەر ئەشخەڵ و لە هەر کوێ یە !

زستانی تووش

زریان و ڕەشەبای زۆرو

جانەوەری جۆر بە جۆرو

مشەخۆرو

کرم و خۆرە و، دێزە و بۆرەو

گەڕو گول و ورگ زل و

ئەوەی کەناڵی ئەندێشەو، زەینی لە زەینی (وە) جوێ یە

بەچنگ و نینۆکی قژ و چڵکنەوە

وێکڕا دێن و

بەساتۆرە ژەنگاوییەکی دەم بەخوێن و

بەزمانێکی درێژو دڕو

دەمێکی هەراش و شڕو
پڕ لە جوێن و
بەکام شێوەی ناقۆڵاو بێ تام و خوێ یە
لەهەر سەعاتێکی سفرا
لەهەر شوێنێ، سیمای نوورانی (وە)ی لێ یە
ڕۆتان دێنێ!
دارستانی بنارەکان!
ئەشخەڵە بە ئازارەکان!
ڕەگان داکوتن
ئامێز لە یەکتر وەرێنن
پەل بهاوێژن و خەڵفاژۆ
بست بە بستی ئەم بەندەنە ئازاراویە
بەنەمامی خۆتان ئاسا، بخەملێنن
سڵ مەکەن و سارد مەبنەوە
من دڵنییام قەد و ڕەگ و ڕقی ئێوە
لە ئاقاری پەلاماری شەختە و کڕێوە
دڵی حەماسەی پێشمەرگەن،
لەڕووی دوژمن
پێکەنینی خوناوەی خوێنی شەهیدن،
لەڕووی مردن
دێ و دەبینن
چەند ساتێکەو
بەنەعرەتەی ڕابوونی ئێوەی ڕاچەنیو

هەر زستانە، کزو بەزیو

هەر زریانە، تورِو تەریو

هەر ساتۆرە

دەمی پەڕیو

زمانی دڕو دەمی شڕە

تەڵەی تەقیو

گەڕو گول و ورگ زل و چەنگ و نینۆکی چڵکنە

ئەنجن ئەنجن و داتەپیو

هەر بەیداخی دەستی ئێوەش،

شەکاوەیە و بەرزو چەقیو!!

# سێ ژان

دایکی ئازادیی ڕەشپۆش و کەزی سپیمان
یەکەم ژانی:  ڕاگواستنە
دووەم:  کیمایی ڕشتنە
سێ:  بەناوئەنفال کردنە
دوژمن ویستی لە دواژانا، لەباری با
لەبارنەچوو
بەهەرسێ ژان
کوڕی نەبەردی (ڕاپەڕین) لە دایك بوو!

# دادگای شۆڕش

١٩٩٥ / رانیە

که پێش راپەڕین و به تایبەت له درێژەی شەڕی شوومی نێوخۆیی دوای راپەڕیندا، خودی شۆڕش و کوردایەتی و کەسایەتی و شکۆی کوردی، به خەستی تێدا دادگایی و ڕەجم کران و خوێنی چەندان هەزار ڕۆڵەی بەدبەختی میللەتیشی، تێدا کرایە شاباشی شۆڕشگێڕان و کەڵکەڵەی کوێخایەتیەکی ناڕەوا !!

له دوای دەیان ساڵ شۆڕش و
خەباتی رزگاریخوازیی نەتەوەی کورد
حکومەت و پەرلەمانێك له دایك بوون!
زۆری نەبرد...
له پایتەختی کوردستانا
لەبەر چاوی (وان)[1] و (زمزیران)[2] و (هەڵگورد)
به بڕیاری دادگای شۆڕش
له سەردەمی مۆدێرنیزم و دنیای نوێ دا!
پەرلەمان له سێدارە دراو
حکومەتیش...
دەهۆڵی له دووخۆی لێ دا!!!

---

١ هەم دەریاچە و هەم شارێکە له باکوری کوردستان.

٢ چیایەکە له رۆژهەلاتی کوردستان.

# پەیامی گەنم

٤ / ٦ / ١٩٩٥ رانیە

| |
|---|
| لە سالانی ڕەشی کۆکردنەوەی گوڵە گەنمەکان و هەرکات و ساتێکی تردا! |

هۆ خەڵکینە!
منی گەنم، لەهەر شوێنێڕا هێنراوم
بەدەست و بازووی هەرکەسێ وەشێنراوم
خودایيم و
زادەی گەردێك سۆزو بەزەیی ئەوییم و
بە فرمێسکی پەرۆشی چاوی باران و
گەرمی و نازی ئامێزی خاکی ئەو ڕوواوم
.....
هۆ خەڵکینە!
من ئێستا بەش بەحاڵی خۆم
لەپێش ئەوەی بکرێم بە نان
بچمە سەر خوان
خێرا دەڕۆم

بە بەفراوی شوکر و سوپاس
دەست نوێژێکی پوخت دەشۆم
کڕنووش دەبەم، بۆ زاتی ڕۆزیدەری گشت
.....
هۆ خەڵکینە !
گوێ بگرن ئاخۆ کێم و چیم
من بژێوی هەمووتانم
من ئۆخژنی
سك و سفرە و کاسە و خوانم
لەو ساتەی ڕا، شیری ئاسمان و خاك دەمژم،
بۆ ژین دەژیم
من عەمبار و ژێرزەمین و
گومڕای دڵ ڕەش بەد بین و
بازرگانی بێ ویژدان و بەرچاوتەنگ نیم
مەم شێرنەوە !
لێم مەبنە سن و مۆرانە و کوللەزەردە !
ئەوەی ڕژدیم دەگەڵداکا
هەر کێ بێ و لەهەر کوێ واکا
سپڵەیە، گێلە، نامەردە
گیاکەڵەیە
تا گوێزینگان نقوومی دەریای هەڵەیە
زبڵدانی میکرۆبی هەزاران دەردە
.....

هۆ خەڵکینە!

ئەگەر ژینی پڕ لە تام و خوێتان دەوێ

ئەگەر ئاسۆی گزنگی بەرەبەیانی نوێتان دەوێ

گەر بۆ دەرچوون لە هەڵدێری قاتی و قڕی،

قڕی و پڕی

ڕێتان دەوێ!؟

دەروونێکی ئاوەدانی پڕ باوەڕم، لێتان دەوێ!

# دەڕاسە

١٩٩٥ / رانیە

دەڕاسەیەك
لەبانوێکدا درەوی دەکرد
دووسەد کەسی، ڕەش و ڕووتی بە دواوە بوو!
دەڕاسەکە، گوڵەگەنمێکی لێ جێماو
هەر دووسەدیان دەستیان بۆ برد!!
یەکێك لە دەمی گیانەڵا
وتی: نەفرەت لە تۆ بەعس
تف لە یوئێن و ئەمریکا
حەیف بۆ کورد!!

# حیجاب

حیجاب تاجە
بەسەری هەموو کەس ناشێ
ئاڵای دەوڵەتی ڕەوشتە
نەك تەنها پارچە قوماشێ
چەکی سەنگەری شەڕەفە
دەسمێ گشت گورگ و داڵاشێ
دنیای کەسایەتی و بوونە
هەر ڕۆژ لێ ناکا لە ئاشێ

# بڕوای تۆخ

١٤ / ٨ / ١٩٩٥ / ڕانیه

ئەی خوشکی من
ئەتۆ گوڵ و
نەکەی ڕێدەی،
ڕەشەبای نەفامییت لێ دا
ئەتۆ دڵ و
نەکەی بێڵی،
تاوان تیغت لە گەردنێ دا
ئەتۆ بەرزو
ساتێك کەللەی چەواشەییت لە ژێر پێدا!
ئەوسا دەڵێم: هەی ئافەرین!
بەڕاستی دڵت گوڵزاری بڕوایەکی تۆخی تێدا

# هەڵوێست

رانیە ١٩٩٦

ئادەمیزادی بڕوادار!
ئەی هەڵگری مەشخەڵی پەیامی خوایی!
پەپولەی دەوری ڕۆشنایی!
دەگەڵ تۆمە و خۆشم دەوێی
دنیا شەوەو
تۆ بە تریفەی چاوگی چاوی گەشی باوەڕ
ئاسۆی ڕوون و خۆری شەوێی
تۆ بەنرکە و نەعرەتەی (الله اکبر)
بانگی زوڵاڵی بێداریی، خەڵکانی دەم حەزیای خەوێی
دەگەڵ تۆمە پێشمەرگەی خوا!
خۆت بۆ خوابێ
توێشووی ڕێگات لەم ڕێگا دوورو عاسێ یە
پڕ لەپێخۆری تەقوابێ
دەگەڵ تۆمە
دەسا دەستم دامێنی تۆ، تا ژینت لە دنیا مابێ
دینی خۆت بەدنیای هیچ کەس مەگۆڕەوە
دەبێژە پێم
گوێ بگرە لێم!

کێ لەجیات کێ، دەهاوێژرێتە گۆڕەوە ! ؟

ئەی ڕێبواری ڕێی (موحەممەدول موستەفا) !

دەگەڵ تۆمە

دە بەوپەڕی جورئەت و ئەدەب و ویقار

لەڕووی هەر ئینسانێکی خوار

هەر بێ شەرعی و کارو ئەتواری نالەبار

وەك هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر

تەنها لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار

هەڵوێستت بێ

هەڵوێستی دیار!

# کێڵ

٧ / ١ / ١٩٩٥ سلێمانی

که ئاژانسی دەنگ و باسی
ئیمپراتۆڕی شیعرو وشه
شەهادەتی (کۆساری)ی بەقەندیل گەیاند
(کوردستان) سوپای نەفرەتی
بۆ (کوردایەتی) دابەزاند ! !
(کوردایەتی):
وتی: نەفرەت لەپێشمەرگەی خائین و خێڵ ! !
(ئیسلام) وتی:
گەر (چەك) قەڵغانی هەق نەبێ
نەزۆرداریی جێی لەق دەبێ و
مافی هەموو کەسیش پێ شێل
(خانی)یش لە جیاتی (مەم و زین)
داستانێکی دی نووسیەوە،
لەژێر ناوی: (تاوانی بنیادەمی گێل)
خامە ڕەنگینەکەی (نالی)یش
بەخوڕ فرمێسکی خوێنی ڕشت
(شێخ مەحمود)یش
بڕنەوەکەی بۆکردە کێل!

# هۆ هەڵەبجە

١٧ / ٣ / ١٩٩٦ رانیە

هۆ هەڵەبجە !
دێم و فرمێسکە مرواریەکانت
بەدەزووی بەرخودان دەهۆنمەوە
دێم و دڵۆپە خوێنە خنکاو و هەنیسکە قوڵ و تاساوەکانت
لەمەتەرێزی تۆڵەدا، دەکەمە پێشمەرگە
دێم و مەرگی نێرگز و شیوەنی پەپوولەکانت
دەکەمە نەعرەتەی ڕاپەڕین
دێم و تەم و دووکەڵی ئاسمانی ساماڵت
دەکەمە چەخماخەی هەوری غەزەبی بەعسی قڕان
دێم و بۆنی کیمیایی خەردەل و سیانیدت
دەکەمە بۆن و بەرامەی گوڵی ئازادی
هۆ هەڵەبجە !
بفەرموو ئەوە تۆو بەرخودان
تۆو پێشمەرگە
تۆو ڕاپەڕین
تۆو بەعسی قڕان
تۆو زەردەخەنە
ئیتر بەسە و ساخۆت و (شنروێ)

هەنیە بخەنە سەر خاکی سۆزو بەزەیی خواو

سوجدەی شوکر بەرن!

ئیتر بەسە و ساخۆت و (بالآنبۆ)

بۆ زەماوەندی سەرکەوتن و بەعسی قڕان

بۆ دەروازەی راپەڕین و

بەردەرکی سەراو

دامێنی قەلآ وەرن!

ئیتر بەسەو ئاها ئەوە تۆ و (سوورێن) دەستەملان و

بەعسیە نێو چاوان جەهەننەمیەکانیش

خەجاڵەت و شار بەدەرن!

# جەنگی بەدرو شمشێری هەق[1]

١٩٩٦ رانیە

جەنگی بەدرە
شمشێری هەق، لە نێو شەوە زەنگی کوفرا
بروسکەیە، چەخماخەی هەورە
لێ بنۆڕن!
ئاها ئەوە (ئەبوجەهل)[2] و (نۆفل)[3] و (ئومەییە)[4] و (شەیبە)[5]!
زەندەق چوون و
(بیلال)[6]ی ڕەش پێستیش (بەور)ە
چەندە مەزن و بەعیززەتن، (آراذِل)[1] و

[1] جەنگی بەدری گەورە لە(١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی دا ڕوویدا، کە تیایدا (٧٠) کەس لە کافرەکان کوژران و (٧٠)شیان لێ بەدیل گیران و سوپای ئیسلام سەرکەوتنی گەورەی تۆمارکرد.

[2] دوژمنێکی زۆر سەرسەخت و داخ لەدڵی پێغەمبەرو ئیسلام بوو و لە ئەسڵدا ناوی (ابا الحکم) بوو و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا ئەبو جەهل و لە جەنگی بەدری گەورەدا کوژرا.

[3] نۆفلی کوڕی خوەیلد، لە جەنگی بەدری گەورەدا کوژرا.

[4] ئومەییەی کوڕی خەلەف، یەکێك بوو لە زلەزلەکانی قورەیش و لەو جەنگەدا کوژرا.

[5] شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، لە جەنگی بەدری گەورەدا کوژرا.

[6] بیلالی حەبەشی، یەکێك بوو لە هاوەڵان و بەشداربوویەکی جەنگی بەدری گەورە بوو.

چەندەش گچکە و زەلیل و نابووتن، (گەورە)! !
ئێرە مەملەکەتی نوورە
لە زەینی بۆش
دڵی نەخۆش
دەرهەق بە لاڕێبووان، پەرۆش
یەکجار دوورە
لێ بنۆڕن، ئەوە (ئەبو عوبەیدە)[٢] یەو
شمشێرەکەی، بەخوێنی پیسی (جەڕڕاح)ی باوکی سوورە!

---

[١] زلە زلەو خۆ بەخوازانەکان و بێ باوەڕان، هەمیشە پێغەمبەران و باوەڕدارانیان بە خەڵکێکی عادی و کەم ئەقڵ و گچکە زانیوە و خۆشیان بەعاقڵ و سەنگین و گەورە! ! خوای گەورە دەفەرموێ (فَقَالَ الْمَلأُ الّذِينَ كَفَرُواْ مِن قوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاّ بَشَراً مّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتّبَعَكَ إِلاّ الّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرّأْيِ ...) هود — ٢٨.

[٢] ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح، یەکێکە لە هاوەڵان، لە جەنگی بەدردا(جەڕڕاح)ی باوکی، کە لە بت پەرستەکان بوو، پەلاماری (ئەبو عوبەیدە) دەدات بیکوژێ، (ئەبو عوبەیدە)ش خۆی لادەدات و زۆر ئامۆژگاری دەکات تا مسوڵمان ببێ، بەڵام بێسوود دەبێ و وازناهێنێ و هەر پەلاماری دەدا، دواجار ئەبو عوبەیدە بەناچاری دەیکوژێت.

# بۆ (جەوهەر دۆدایڤ)[1]

٢٥ / ٤ / ١٩٩٦ رانیە

ئەی (دۆدایڤ)!
بازو پڵنگی هەڵمەت بەر
شەیدای ئازادیی و جیهاد و چەك و سەنگەر
کێ دەیزانی!؟
(جەوهەر) دەبێتە پارچەیەك
غیرەت و جورئەت و جەوهەر
سەرکردەی وڵاتی بورکان!
کێ دەیزانی!؟
ئێوەی نەتەوەی زیندانیی
ڕێگای حەفتا ساڵ تاریکی!!
دەبنە هەڵۆی لوتکەی جیهاد و تێکۆشان
یاخود (چیچان)ی پێخوستی ڕەوە بەراز!!
بست بە بستی، دەبێتە مەڵبەندی غەزای (يَوْمَ الفُرْقَانِ)[1]!

---

[1] ناوی (جەوهەر موسا داود)ەو ساڵی (١٩٤٤) لە گوندی(یاڵفۆر)ی چیچان لەدایك بووە و ساڵی(١٩٩١) سەربەخۆیی وڵاتەکەی ڕاگەیاند، لە کۆتایی ساڵی(١٩٩٤) بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشە دڕندانەکەی سوپای ڕوسیای داگیرکەر بۆ سەر وڵاتەکەی، دەستی بەجیهاد و شۆڕش و تێکۆشان کرد و مەردانە ڕووبەڕووی وەستایەوە، ڕۆژی یەکشەممە ٢١ی نیسانی ١٩٩٦ لە بۆمبارانێکی ئاسمانیی سوپای داگیرکەری ڕوسیادا شەهیدکرا.

# عەڕەبانچی

١٩٩٥ رانیە

هەژارێکی عەڕەبانچی،
لە سوچی بازاڕێکی شار
شتی دەفرۆشت
لەپڕ مەفرەزەیەك چەكدار
تێیان ڕاخوڕی و لێویان لیٚ کرۆژت
عەڕەبانەکەیان لیٚ شکاند
هەرهێندەنا!
سیٚ چوار قونداغ تفەنگ و زللە و شەق و
مستیشیان تیٚ سرەواند!!!

[١] (...يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ..) الانفال – ٤١ واتە: (رۆژی لێك جیابوونەوەی هەق و باتڵ، ئەو رۆژەی کە سوپای ئیسلام و کافران بەیەك گەیشتن) مەبەست پێی جەنگی بەدری گەورەیە.

# سۆراغ

١٩٩٦/١١/٨ رانیه

بۆ دۆزینەوی ڕوخساری ئیسلامەتیت
لەڕوخساری کام ڕوخسارەوە ڕامێنم، ئەی (ڕوخسارخان)[١] !؟
چاو بگێرم لە ڕەوەز و تاوڵ و هۆبەی (ماخۆبزنان)

---

[١] بەبۆنەی کۆچی دوایی (روخسار ئیبراهیم ماماغا) ناسراو بە(داك مەلاژن) نووسراوە، ناوبراو لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٦)ە ، خوێندوویەتی و بووە بە پەرستار، ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیردا ژیانی هاوسەریتی پێکهێناوە، لەو ساڵەوە لەگەڵ هەوراز و نشێو و تاڵی و کوێرەوەریەکانی ژیانـدا دەست و پەنجە نەرم دەکات، توشی کۆچ و کۆچباری زۆر دەبێت، ساڵی ١٩٨٧ ماڵییان دەچێتە قەڵاتووکان کە بارەگاکانی هێزی (حەمزە)ی لێ بوون، ئەوسا مامۆستا عەلی باپیر خۆشی فەرماندەی هێزەکە بوو و خۆشم لەوێ پێشمەرگە بووم، من لە ساڵی ١٩٨٦ ەوە بینیومە و لە گەڵوی ماخۆبزنان چوومە ماڵیان، (داك مەلاژن) ئافرەتێکی زۆر میوان پەروەر و بەڕێز و بەخولق وخۆ و میهرەبان و سەخاوەتمەند بوو، ئەو وەك دایکێك مامەڵەی لەگەڵ میوان و برا پێشمەرگەکاندا دەکرد، پێشمەرگەکانی بەگشتی بە براو کوڕی خۆ دەزانین و خزمەتی دەکردن و ڕێزی لێ دەنان، جگە لەوە، ئافرەتێکی تێکۆشەر بوو، پێشمەرگە بوو، بانگخواز بوو، پەرستار بوو و زۆرجار کەلێنی دکتۆرێکی دەگرت، ڕێبوارێکی دڵسۆزی کاروانی رابوونی ئیسلامیی کوردستان و گەل و نیشتیمانەکەی بوو، ئەم ئافرەتە هەڵکەوتووە، کاتێك ماڵیان لە شاری مەریوان بوو، بەهۆی گرگرتنی تەباخ لەکاتی نەوت تێکردنیدا، توشی حاڵەتی سوتان دێ، تاسەرەنجام بەوهۆیەوە لە شەوی٤/ ١٩٩٦/١١/٥ لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا و لە تاران کۆچی دوایی کرد و پاشان لە چوارقوڕنە بەخاك سپێردرا.

یا بنۆڕمە
سیمای نورانی (قەندیل)و (قەلاتووکان)
یا دەڕێ بم
بۆ (ماکۆك)و (سەرئەشکەوتان)!
نا نا دەڕۆم!
بۆ (ئەحمەداوا)و (هەورامان)!
نەخێر دەچم بۆ نیشتیمانی غەریبیی
بۆ (خدراوا)، بۆ (نەغەدە)، بۆ (مەریوان)[1]
چ پرسیارێکی ئاسانە و تەماشاکەن!
هەر جێگایەکی کوردستان
ئێستا بۆ خوشکە (ڕوخسار)ێ
دڵی دەکوڵێ و
ڕێژنە بارانی فرمێسکی، بە چاواندا دێتەخوارێ.

---

[1] خوشکە (روخسار) کە مەشهور بوو بە (داك مەلاژن) لە هەموو ئەو شوێنانە و دەیانی تردا، لەپێناو ئیسلام و گەل و نیشتیمانەکەیدا، ماڵی بە عەرزێ دا داوە و، ملی دەبەر مەینەتیان ناوە و، بێزارییشی پێوە نەبینراوە!

# گوڵ و گوللە

سەرئەشکەوتان ١٩٩٣

نەرمی و توندی
گوڵ و گوللە
خەندە و مۆڕە
تۆقە و زللە
دووباڵی مەلی باوەڕن
نەرمی و گوڵ و خەندە و تۆقە
بۆ ئەوانەی کە هەڵگری
ئالآی (الله اکبر)ن
بۆ ئەوانەی ئاشتیخوازن،
دۆستی چاکە و خێر و فەڕن
توندی و گوللە و مۆڕە و زللەش
بۆ ئەوانەی
شەیدای شەوەزەنگ و شەڕن.

# گوێم لێ یه

١٩٩٧ هەولێر

گویم لێ یه و (دیار بەکر) دەڵێ:

درێژەپێدەری شۆڕش و ڕاپەڕینی (شێخ سەعید)م

(ماکۆك) دەڵێ:

هەورە بروسکەی خوێنی ئاڵی مامۆستایان

(وریا)[١] و (شەریف)[٢] ی شەهیدم

مزگەوتی (ناجیەخان)[٣] دەڵێ:

من مینبەری بڵندگۆی مامۆستا (مەغدید)[٤] م

---

[١] (وریا مەحەممەد سەعید – ناسراو بە مامۆستا وریا کەرکووکی) ١٩٥٣ لە کەرکووك لە دایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی و پەیمانگای مامۆستایانی لە کەرکووك تەواو کردووە، لە ١٩٧٤ ەوە تێکەڵاوی کاری ئیسلامیی بووە، ١٩٨٧ لەبەر رەفزکردنی سەربازی بۆ رژێم، لە ناوچەی شارباژێڕ دەگیرسێتەوە، دوای راپەڕین لە رانیە و بیتوێن پەرە بەکار و بانگەوازی خۆی دەدات و پەیوەندی بە بزووتنەوەی ئیسلامیی ئەوکاتەوە دەکات، لە پەروەردە و بانگەوازدا دەستێکی باڵای هەبوو، لە ١٩٩٣/١٢/٢٧ لە سەر چیای ماکۆك لەگەڵ پۆلێك لە هاوەڵانی، بە دیلی رەمی کرا و شەهید بوو.

[٢] مامۆستا(شەریف حسێن مستەفا) لە ( ١٩٩٣/١٢/٢٧) لە سەر چیای (ماکۆك) لەگەڵ مامۆستا وریا و چەند برایەکی تردا بە دیلی رەمی کرا و شەهید بوو.

[٣] مزگەوتێکە لە رانیە، مامۆستا مەغدید حسێن ئەحمەد ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو مزگەوتە بووە و کردبووی بە ناوەندێکی بانگەواز و هۆشیارکردنەوەی جەماوەر.

[٤] مامۆستا(مەغدید حوسێن ئەحمەد) لە گوندی (رێزێنە)ی دۆڵی سەرکەپکانی سەر بە رانیە، لەدایکبووە، لە منداڵیەوە دەستی بە خوێندنی زانستەکان کردووە و لە حەفتاکاندا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و لە مزگەوتی (ناجیەخان) لە رانیە دامەزراوە،

(بێ تەل) دەڵێ: بروسکەی نیدای (نەجمەددین)[1] و
(فێرگە)ش دەڵێ:
من دەستڕێژی چەکی شەهید (موجاهید)[2] م
کوردستانی زێدی خۆشەویستیش دەڵێ:
من کالانی شمشێری سوپای خواویستی (خالیدی کوڕی وەلید)م

---

ڕۆڵی بەرچاوی لە پێگەیاندنی لاوان و هۆشیارکردنەوەی جەماوەردا بە دژی بەعس بینیوە، ساڵی ١٩٨٨ دەبێتە پێشمەرگە و لەگەڵ پۆلێک زانا و لاوی تردا هێزی (ئازادی) دادەمەزرێنێ و دەبێتە فەرماندەی هێزەکە، ١٩٩٠ لە کۆنگرەی پێنجەم لە دزڵی دەبێتە ئەندامی سەرکردایەتی، ١٩٩١دەبێتە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری و لە راپەڕیندا و بە تایبەتی لە کەرکوک ڕۆڵی گەورە دەگێڕێ و لە ١٩٩١/٣/٢٨ برایەکیشی بەناوی (ئیبراهیم) لەگەڵیدا شەهید دەبێت، ١٩٩٢ لە کۆنگرەی شەشەم لە سەرنەشکەوتان دەبێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی مەکتەبی دارایی، سەرەنجام لە(١٩٩٣/١٢/٢٦) لە سەرنەشکەوتان شەهید کرا.

[1] (نەجمەدین مەحەممەد عومەر) ساڵی ١٩٦٤ لە هەولێر لە دایکبووە، هەر لەوێ دەخوێنێ و کۆلێژی زانست تەواو دەکات، لە راپەڕیندا دەبێتە پێشمەرگە و بەشداری خولی بێ تەل دەکا، دەبێتە کەسێکی فەننی بەتوانا و کارامە لە بواری جیهازو بێ تەل دا، مرۆڤێکی خاکی و ماندوویی نەناس و دڵسۆز بوو، سەرەنجام لە(١٩٩٤/٦/٧) لە قەڵادزێ شەهید بوو و لە هەولێر بەخاک سپێردراوە.

[2] سلێمان رەشید سەعید، ناسراو بە(موجاهید) ١٩٧١ لە رەواندزێ لەدایکبووە، قۆناغی ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، ١٩٩٠ لە سەربازی لەبەشی زرێپۆش شارەزای شۆفێریی مودەڕڕەعە و دەبابە دەبێت و هەر لەو ساڵەشدا پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە دەکات، ١٩٩١ لە هەولێر بەشداری راپەڕین دەکات و دەست بەسەر مودەڕڕەعەیەکدا دەگرێت، ١٩٩٢ بەهۆی ئەو شارەزاییەی هەیبووە دەکرێتە مامۆستا لە (فێرگەی سەربازی سەلاحەددین)ی سەر بە بزووتنەوەی ئەوکات لە چوارقوڕنە، ١٩٩٣/١٢/٢٦ لە چیای هەیبەت سوڵتان شەهید بووە.

# سەفەر

٢٠ / ٢ / ١٩٩٧ رانیە

وەرن بابچینە سوێی گۆنگەڵی ئەم حەشاماتە
تا پێ بکەنین!
وەرن بابچینە نێو زەماوەندی مەرگی نێرگزەکانی،
ئەم مەڵبەندە پڕ لەکارەساتە
تا بگرین
ئەوە بۆ نایەن!
چما گریەتان بۆ منە، یا بۆخۆ!؟
پێکەنینتان بە خۆیە، یا بەمن!؟
ناشێ و سەفەری چوونەنێو دۆزەخی،
بەهەشتە سەرابیەکانی دووربینی چاوە چەمووشەکانە
دەبێ بکرێ
باجی تریقانەوەی دەمە دەم دەمیەکانە
دەبێ بدرێ
باری کاروانێکی شەکەتی هەتڵەبوویە
دەبێ بخرێ!
***
ئەوە بۆ نایەن!
هەرمن نا

هەموو پیتە بە پیتەکان

هەموو وشە ڕەنگینەکان

هەموو ڕستە سەنگینەکان

لێتان قەڵس و

دەرهەق بە پانۆڕامای تەونی تەمایەکان

تا ئەوپەڕی تورە

چ بەزمێکە !

هەر تێیەوە دەدەن

کە چی دەبێتەوە خشە خش

هەر سووری هەڵدەگێڕن

کەچی چش!

وەرن بابچینە سوێی گۆنگەڵی ئەم حەشاماتە

تا پیێ بکەنین

وەرن بابچینە نێو زەماوەندی مەرگی نێرگزەکانی،

ئەم مەڵبەندە پڕ لەکارەساتە

تا بگرین

بفەرموون، ئەوە لێوی زەردەخەنەی گوڵ و کانیی و

هەر ساتەو گێژێك بەدەستڕێژێك دەیلاوێنێتەوە

ئەوە تۆماری ڕەسەنایەتیی سەفین و

پەڵە هەوری ڕەش، بە چاویکەیەکی قەترانی و ئاوەژوو،

دەخوێنێتەوە

ئەوە مەعدەنی نایابی جەستەی ئەم ئۆردووەو

هەر گەلحۆیەو لە تەندووری حەزە شێت و نامۆکاندا

دەیتوێنێتەوە
ئەوە زەردەخەنەی لێو
ئەوە ڕەسەنایەتی کێو
ئەوە زێڕو زێو
***
ئای لەم شینە، چۆن بۆتە زەروو!
کانی بەدەستیەوە بێ زار!
چۆن بۆتە ڕەشەبا!
گوڵ بەدەستیەوە بێ چار
چۆن بۆتە گیاکەڵە!
شینایی بەدەستیەوە جواناوان دەڕێژێ
ئای لە تۆفان و گەردەلوولی ئەم بارانە شوومە!
چۆن قەرسیلەکانیان کردە پووش و
گریان بەردایە بەردو
بەردیان بەسەر خاکەلێوەدا باراند!
***
هاوارە ئیتر ئەم هەورە چاوسوورهەڵگەڕاوانە ڕادەن
خوێن دەبارێنن
مەچەکی ئەم دەستە ڕەش و چەپڵەکانە بادەن
دڕك دەڕوێنن
ئەم زمان و زارە گێڕانە، قوڕدادەن
بایەقوش ئاسا، دەخوێنن
***

هۆ هەورە چاوسوورهەڵگەڕاوەکان!

ئێوە مایەی بارینی غەزەبن

دەسا تێ پەڕن

دەمێکە کێڵگە و مەزراکان بە گوێی یەکتردا دەچرپێنن

دارستان و بەندەن و بنار دەدوێنن:

تا ئەم هەورانە بە ئاسمانەوە هەبن

شەیپووری شەڕن!

هەتا لەسەر تەختی، بێ خەبەری ڕۆنیشن و

دەڵاڵی مەزادخانەکانی وەهم بن و

ئاوا بەسەخاوەتەوە ڕێدەن

بەسەرسەرتانەوە چەخماخە لێدەن!

هەمیشە خەونە ئەرخەوانیەکانتان

کامووسك و

خوانی زەردەخەنەکانتان

خوێنین و

خوێنی دەمارەکانیشتان وشك!

***

هۆ هەورە نەجیبەکان!

دەسا بە بروسکەی پەرۆش و

چەخماخەی جۆش و خرۆشەوە

بکشێنە پانتایی ئاسمان

تا ئیتر بارانەی ئاوەدانیی

بۆ وێرانەکان بباریێ

تا هەر چرکەیەك لە گەڵاڕێزانی دارستانە ڕەش پۆشەکان
ببێتە بەهارێ
تا هەر لوێچی خەرمانێ
ببێتە نانی خوانەکانی شارێ
تا ئیتر خۆشەویستیی
ڕەگی بەدێمەکارەکانیش دا، ڕۆچێتە خوارێ!

# دەڕۆم

١٩٩٨ هەولێر

دەڕۆم و دەچمە هەواری
خەملّینی سەراپای ڕەنگ و ڕەگەزەکان
دەڕۆم و دەچمە دیياری
خۆزگە و ئومێد و حەزەکان
دەڕۆم و دەچم سروودی
(لَبَّيكَ اللّهُمَّ)ە دەچڕم
دەڕۆم و بەرەو ترۆپکی
ئازادیی و ئارامیی دەفڕم
دەڕۆم، دەچمە (کەعبەتوڵڵا)
کۆنگرەی ساڵانەم لەوێ یە
دەڕۆم و ئاڵای یەکبوونی
گەل و میللەتانم پێ یە
دەڕۆم و ڕووم بۆ هەمیشە
لەیەك ڕووگە و لەیەك جێ یە
دەڕۆم و تا دواهەناسە
یەك ڕێم ڕێ یە
یەك ڕێم ڕێ یە

# ئەی پێشمەرگە!

١٣ / ٢ / ١٩٩٨ هەولێر

ئەی پێشمەرگە!
ئەوە ماچێك...
لە بەرۆك و یەخەی چڵكن و تۆزاویت
مادام دەتبینم خواناسی
ئەوە شیعرێك...
بۆ قەیتانی پێڵاوەكەت
مادام دەتبینم ئامادەی لە ڕێی خوادا
ملت بە پەتی سێدارە هەڵبواسی
ئەوە چاووم...
تا پێی لێ نێی وەك بەردەباز
مادام دەتبینم بۆ كۆسپ و لەمپەری سەر ڕێی بانگەواز
درێشە و داسی
ئەوە مژدەی فەتح و نەصرەتێكی خوایی
مادام دەتبینم پۆشاك و توێشووت تەقوایە و گوێش نادەی
بەبرسیەتی و ڕووتی و ڕەجاڵی و پێخواسی
ئەوە دەستی نزای هەمووان بۆ چەسپاویت
لە قاپی میهرەبانی خوا
مادام بیرو باوەڕ ئاوەو ئەتۆش ماسی!

# هاتووم دەڵێم

٢٣ / ٢ / ١٩٩٨ هەولێر

هاتووم دەڵێم
فەرموو ئەوە چەپکێ نێرگز
لوێچێك شەونم
هێندەی مۆمێ
پڕی گۆڕێ
چاوترووکانێك لە ڕۆژی دوایی
ڕۆشنایی
کۆڵێك پەرۆش
ئەی ڕێبواری ڕێگای سەخت و شاخاویی ژین!
دەخیلم تۆش
ئەگەر ڕاستەو تامەزرۆی ڕاستیی و دڵنیایی
ئەوە (قورئان)ی سەرچاوەی هەموویان و
بێ سڵەمینەوە و ڕاڕایی
لێی بکە نۆش
هەر ئەمەیە
سەرچاوەی ئاوی سازگارو خاوێن و خۆش

تەنها بەوە

بۆن و بەرامەی هۆشیاریی و

ژیریی و زەین و زانایی و هۆش

تەنها ئەوە

دەستەبەری سەرکەوتنی

شۆڕش و هەوڵ و کردوکۆش

هەر ئەو هەقەو

غەیری ویش، بۆش.

# ئامانجەكان

١٩٩٨/٥/١٢ هەولێر

ڕشتەی مرواری ئامانج و مەبەستەكان دەهۆنمەوە

لە دنیادا:

بوون و قەوارە و ژینێكی خوازیستانەو

ئاوەدانیی و سەروەریی نیشتیمان و خاك

لە بەرزەخ دا:

گۆڕێكی ڕازاوە و ڕووناك

لە دواڕۆژدا:

ڕەزامەندی و لێبووردنی پەروەردگاری تەنیا و تاك

دەستەبەربوونی هەموانیش، بە دوو هۆیە:

یەكەم: باوەڕ

دووەم: كاروكردەوەی چاك

# ئێمە

ئێمـــــە کوردین مسوڵمانین
خـــاوەن زمان و نیشتیمانین
پـــەروەردگاری تەنیاو تـــاك
پێی بەخشیوین زمان و خاك
هـەرکەس داگیریان کا لێمان
ســەری دەخەینە ژێر پێمان

# ئەی مسوڵمانانی جیهان

٣ / ٣ / ١٩٨٧ توەسوران

ئەی مسوڵمانانی جیهان، بگرنەوە کۆڕی خەبـــات!
وریابن ئەمڕۆ لە فێڵی، ڕۆژئاوا لەگـــەڵ ڕۆژهــــەڵات
لە پێناو ئایینی ئیسلام، سەرو ماڵتان بکەن خـــەڵات
قەت مۆڵـــەتی زاڵم مەدەن، دیلی بن، ئـــازارتان بدات
هـــاوار ئەمڕۆ نەماوە ئـــازادیی ئـــادەمیزاد
مسوڵمانان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد!

ئـەی مسوڵمانانی جیهان، جیهان نقوومی ئـــازارە!
لە سایـەی بێ باوەڕی دا، ســـەراســـەر جیهان زامارە
گیرۆدەی هەزاران دەردە، چاوەڕێی چـــارە و تیمارە
ئـــادەمیزادە زاناکان، لـەرزیان هـاتۆتێ لـەم کارە!
کەوتۆتـــە پەلەقاژەوە، ئازادیی ئـــادەمیزاد
مسوڵمان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد!

ئەی مسوڵمانانی جیهان، جیهان ئێستا پڕ فەسـادە !
گوایە بەرهەڵدایی مانای، ئـازادیی ئـادەمیزادە ! ؟
ئامان ئەمڕۆ ژیان هەموو، باڕووتـە و ئارەزوو و بـادە
نەخێر، نەخێر ئەمڕۆ جیهان، دادگایەکی دوور لەدادە !
چونکە هەواری گۆڕیوە، ئازادیی ئـادەمیزاد
مسوڵمانان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد !

ئەی مسوڵمانانی جیهان، جیهان پڕ چەوسانـەوەیە !
ئەمڕۆ ژیان وەکو هەتیوو، بێ بزەیـە و بێ خـەندەیە
هەر زۆرداره لەبەرخۆوە، خەریکی هـاریی و هـەڵپەیە
مافی بێ ماف و هـەژاران، وەك پوولی یاری وگەمـەیە
چونکە هەواری گۆڕیوە، ئازادیی ئـادەمیزاد
مسوڵمانان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد !

ئەی مسوڵمانانی جیهان، هەتاکەی جیهان بەم شێوە !
تەماشاکـەن ئەمڕۆ ژیان، ژانـە، ئـاڵۆزە، پـەشێوە
بەستەڵەکە ئەم جیهانـە، وەك وەرزی بـەفرو کڕێوە
ئـادەمیزاد دەراپـەڕە، سروودی بوونت بڵێوە !
ڕاچەنە بۆ ئازادیی، ئـازادیی ئـادەمیزاد
مسوڵمانان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد !

ئـــەی مسوڵمانانی جیهان، پتەو بکـــەن یـەکێتیتان!
بپارێزن بیر و بڕوا و ئابڕوو و خـــاك و ئــــاو و زەویتان
خوانەناسان بێ و ویژدانن، بەڵگەیە ئەوەندەی دیتان!
مێژوو بەخوێن بنووسنەوە، بینووسنەوە وەك نوسیتان
خەبات کەن بۆ ئازادیی، ئازادیی ئـــــادەمیزاد
مسوڵمانان خێراکەن، خێراکەن جیهاد، جیهاد!

# سەید قوطب[1]

۱۹۸۷ قەڵاتووکان

زانایـــەك بوو پایـــە بەرز، ســـەید قوطب
جیهانێکی خستـــە لـــەرز، ســـەید قوطب
بڕواو جیهاد، دین و دەوڵەت، تا شـــەهیدی
درووشمی بوون لە سەر ئەرز، سەید قوطب

[1] سەید قوطب ئیبراهیم، ۱۹۰٦ لە گوندی (موشە)ی سەر بە پارێزگای (أسیوط)ی میـصر لە دایکبووە، ۱۹۳۳کۆلێژی ئادابی تەواوکردووە و هەمانساڵیش بە مامۆستا دامـەزراوە، ۱۹٤٥ یەکەم کتێبی ئیسلامیی خۆی بەناوی (التصویر الفني في القـران) نووسـیوە، دیـارە ناوبراو بەر لە ۱۹٤۰ لە حاڵەتێکی لاڕێیی فکریی دابووە و دوای ئەوە خـوا هیدایـەتی داوە و ڕێبازی ژیانی ڕۆشن بۆتەوە، ۱۹٥۳دژی حوکمی پاشایەتی بەشداری شۆڕشی کـردووە، مانگی دووی ۱۹٥۳ چۆتە ریزی (برایانی مسوڵمان)ەوە، لە سـەردەمی دیکتـاتۆر جـەمال عەبدول ناصردا، چەندان جار گیراوە و زیندانی کراوە و حـوکم دراوە، نـاوبراو بیریـارێکی گـەورەی جیهـانی ئیـسلامییە و خـاوەنی ٢٦ کتێبـە، سـەرەنجام لـە شـەوی دووشـەممە ۱۹٦٦/۸/۲۹لەگەڵ دوو هاوەڵی تریدا، لەپێناوی بیر و باوەڕەکەیی و مرۆڤایەتیدا، گیـانی بەخشی و لە سێدارەدرا.

# من پێشمەرگەی ڕێگای خوام[1]

٤ / ٣ / ١٩٨٧ تووەسوران

من پێشمەرگەی ڕێگای خوام
بـــــەهێــزە بیر و بــڕوام
دەربەست نیم بە ئێش و زام
گیان فیــدام و گیان فیــدام
بێ بــاك لــە سـزای قـورسم
نا، لـە مـــــەرگ ناترسم!

نالــــــەرزێ بــــاوەڕی من
بــــە ئــاگر و بــە ئــاسن
بــــە لێدان و بــــە مـردن
بە هـــــەرچی سـزای دوژمن
بێ بـــاك لــە سزای قورسم
نا، لــە مـــــەرگ ناترسم!

---

[1] ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە بە دەنگی (عەبدولواحید باپیر)و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

مسـولْمانم تـــــــا ماوم
ئيسلامــــه هــەردوو چاوم
نــاوەستێم، نـــەوەستاوم
دانــابڕێم، دانـــــەبڕاوم
بێ بـــاك لە سـزای قورسم
نا، لـە مـــــەرگ ناترسم!

هــەتــا هـــەم مسـولْمانم
بە ســەر، بە ماڵ، بە گیانم
ســـەربـازی ڕێی قورئـــانم
نـا نـا، بــــەزین نـازانم!
بێ بـاك لـە سـزای قـورسم
نا، لـە مـــــەرگ ناترسم!

هــەتـا ماوم، هــەتـا هــەم
هـــاوار دەكــەم پڕ بە دەم
لـە ڕووی زۆرداریی و ستــەم
ڕێگای ئیسلامــــــه ڕێگەم
بێ بـاك لــە سـزای قـورسم
نا، لـە مـــــەرگ ناترسم!

# شۆڕشی ئیسلام

٤ / ٣ / ١٩٨٧ تووەسوران

ئـــەی دوژمنانی ئـــــازادیی و ژیان!
هەرچـــەند زۆرداریی و بەوپـــەڕی گەیان
بەڵام وا لـــــە نـویّ، شۆڕشی ئیســـلام
پرشنگـی داوە، وەك خـۆری بــەیــــان

ئەی دوژمنانی ســـەرســـــەخت و لاڕێ!
لاڕێ لە ڕێگای (ئیســـلام)ی شـــاڕێ
هەر چەند خوێن خۆرو دڵ ڕەق و ڕەش بن
ڕۆژێك دێ ئیسلام ســـەرتان دەهـــاڕێ

ئەی دوژمنانی چـــەك و دار بـــە دەست!
ئەی زۆردارانی بێ بـــەزەیی و هــەست!
وا بـــــەرپا بۆوە، شـۆڕشی ئیســـــلام
تاچەوساوەکان سەربەست کا، سەربەست!

ئەی چەوســــــاوەکان ڕاپەڕن، هەستن!
تاکـــــەی بێ ماف و پـــەل و پێ بەستن
وەرنە ژێر سایـــەی ئایینی ئیســـــلام
سوور و سپی و ڕەش، تێیدا سەربـــەستن

# پڕ له باوه‌ڕه دڵمان[1]

٥ / ٣ / ١٩٨٧ تووه‌سوران

ئێمه نه‌وه‌ی (ئیسلام)ین نابه‌زین و ناچه‌مین
ده‌ڵێین پڕ به ده‌ممان ئه‌ی گه‌لانی سه‌ر زه‌مین!
پڕ له باوه‌ڕه دڵمان مسوڵمانین، مسوڵمان

ئێمه هه‌موو براین هه‌ڵگری یه‌ك چراین
خاوه‌ن یه‌ك بیر و ڕاین هه‌تاكو له ژیانداین
پڕ له باوه‌ڕه دڵمان مسوڵمانین، مسوڵمان

وێڵی به‌ختیاریی و دادین سوته‌مه‌نی (ئازادیی)ین
شه‌هیدی ئاواتمانه ڕێبواری ڕێی جیهادین
پڕ له باوه‌ڕه دڵمان مسوڵمانین، مسوڵمان

پێشمه‌رگه‌ی مسوڵمانین ده‌ست به‌چه‌ك و قورئانین
بۆ به‌رزی ئاڵای ئیسلام گیان فیداین و قوربانین
پڕ له باوه‌ڕه دڵمان مسوڵمانین، مسوڵمان

---

[1] ١٩٨٧/١٠/٤ له قه‌ڵاتوكان له ئاهه‌نگی مه‌ولود و هه‌روه‌ها ١٩٨٩ش له‌لایه‌ن تیپی سروودی باوه‌ڕه‌وه، به‌ده‌نگی خۆم و كۆرسی پێشمه‌رگه له هه‌ردوكیاندا گوتراوه.

یـەك بازوویە بازوومـــــان
هەر قورئانە توێشـوومـان
بەبێ داوەڵ لە هیچ کەس
هاوار دەکەین هـەموومـان
پــڕ لە بـــــاوەڕە دڵمان
مسـولْمانین، مسـولْمـــان

بوون و مـــــان و مردنمان
سەر و ماڵ و خوێن و گیان
لێدان و ئـــــــازار و ژان
بۆ قورئانە، بۆ قورئـــــان!
پڕ لە بــــــاوەڕە دڵمان
مسـولْمانین، مســـولْمـان

مسولْمانان لە هــەر کوێن
یەك دڵن، یەك گیان و خوێن
یـەك باوەڕن، یـەك بەڵێن
هـــــــەموو پڕ بەدەم دەڵێن
پڕ لـــە بـــاوەڕە دڵمان
مســـولْمانین، مسولْمــــان

# دەست لە قورئان بەرنادەین[١]

٨ / ٣ / ١٩٩٨٧ تووەسوران

ناپالّم و بۆمبای زۆرداران
بڕژێتە سەرمان وەك باران
لە نێو بچین بە هەزاران
هێشتا ئێمە، بڕواداران
دەست لە قورئان بەرنادەین        مسولّمانین هەتا هەین
بۆ پارێزگاری لە قورئان        بەسەر و مالّ ئامادەین

نە بە هێزی گەورە هێزان
نە بەحەپەی هەرزە و دێزان
نە بەزەبری چەقۆ و نێزان
نە بەئازار و داهێزان
دەست لە قورئان بەرنادەین        مسولّمانین هەتا هەین
بۆ پارێزگاری لە قورئان        بەسەر و مالّ ئامادەین

---

[١] سالّی ١٩٨٩ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە بەدەنگی (عەبدولواحید باپیر)و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

قورئانمان خستۆتە سەر سەر
ڕێگای خوامان گرتۆتە بەر
پیلان و فێڵی داگیرکەر
هەڵمان ناکەنێ لە سەنگەر
دەست لە قورئان بەرنادەین    مسوڵمانین هەتا هەین
بۆ پارێزگاری لە قورئان    بەسەر و ماڵ ئامادەین

بەهێزی زۆری دوژمنان
بە پەلاماری نەوسنان
بەتۆپ باران و بۆردوومان
شاهێدمانە ڕابردوومان
دەست لە قورئان بەرنادەین    مسوڵمانین هەتا هەین
بۆ پارێزگاری لە قورئان    بەسەر و ماڵ ئامادەین

ڕێبازی ئیسلام ڕێمانە
قورئان درووشم و هێمانە
هەتاکو جیهان جێمانە
هەر پێمانە، هەر پێمانە
دەست لە قورئان بەرنادەین    مسوڵمانین هەتا هەین
بۆ پارێزگاری لە قورئان    بەسەر و ماڵ ئامادەین

# بەردەوام بە

١٩٨٧ قەلاتووکان

مسوڵمانی بەهەست و نـەست!　　مسوڵمانی لە تاغوت پەست!
مسوڵمانی گیان لەسەر دەست!　　دەهەستە بەرەو ڕووی مەبەست
تێکۆشە و لە تێکۆشانت
بەردەوام بە، هەتا مانت
مسوڵمانی بە بیر و هـۆش!　　مسوڵمانی بە قورئان گۆش!
مسوڵمانی دەروون خرۆش!　　هـەستا جیهان بهێنە جـۆش

تێکۆشـە و لـە تێکۆشانت
بـەردەوام بە، هەتا مانت
مسوڵمان مەردی مـەیدانان!　　ڕووخێنـــەری بـــەندیخانان!
ماف وەرگری پاڵەو شوانان!　　دەسا لــەگـــەڵ مسوڵمانان
تێکۆشە و لە تێکۆشانت
بەردەوام بە، هەتا مانت
پێشمەرگەی مسوڵمانی کورد　　پێشمەرگەی بـە ئیمانی کورد!
دوژمنی دوژمنانـــــی کورد　　خەمخۆری چەوســاوانی کورد!
تێکۆشە و لە تێکۆشانت
بەردەوام بە، هەتا مانت

# ئەی خەڵکی مسوڵمانی کورد[1]!

٨ / ٦ / ١٩٨٧ نەغەدە

ئـــــەی خەڵکی مسوڵمان کورد، بێدار ببنەوە لەم خەوە!
هەتا کـــەی خەو و بێ خەمی، هەتا کـــەی ئاوا مانەوە!؟
بۆ تێ ناگـــــەن ئـــەم دوژمنە، چ کارێکی بـــەدەستەوە!؟
هـــــاوارە خەڵکی مسوڵمان، سەنگـــەری مەردی بگرەوە!

ئەی خەڵکی مسوڵمانی کورد، خەڵکی شەلاڵ بەخوێنی خۆ!
سەیری لاشـــــەی مسوڵمانان، چلۆن کەوتوون مەلۆ، مەلۆ!
بێشکەو خانوو و کەپرو سابات، هەزاران بوون بەڕەژیەو سۆ
ئـــــەی کورد ئەمە پیلانێکە، بۆ نەمانی ئیســـــــلام و تۆ

ئەی خەڵکی مسوڵمانی کورد، خەڵکی بێ ماف و دەربەدەر!
بەسە، تاکەی زەبر و زەنگی، دوژمنی گـەندەی داگیرکەر!
دەڕاپـــــــەڕە، ئـــەی میللەتی ڕێبواری ڕێگای پێغەمبەر!
لە فیرعەونانی خوانەناس، خۆت بهاوێژە نێو سەنگـــــــەر

---

[1] ئـازاری ١٩٩٠ لەلایـەن تیپـی سـروودی بـاوەڕەوە بـەدەنگی سـەید مەغدیـد (ئوسـامە هەولێری)و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

سەنگەر بگرە بە درووشمی (لا الە الا اللە)وە
بە هۆشیاریی، بە زۆردار و چەوسێنەر هیچ مەدە ماوە
بڵێ: ئەی دوژمنی کافر، خەیاڵی مانەوەت خاوە!
خۆت بگرە بۆ ئەو شۆڕشەی، پشتی بەستوە بە خوداوە

ئەی خەڵکی مسوڵمانی کورد، میللەتی بەند و زیندانیی!
تۆ بە هۆی بیر و باوەڕت، نەترەبەری دوژمنانی
ڕاپەڕە تۆ بە ڕاپەڕین، دەیسەلمێنی مسوڵمانی
چونکە بە تەنها جیهادە، کپ دەکا کوفری جیهانیی

ڕاپەڕە، تۆ بە جیهادێ خودا لە خۆت دەکەی ڕازی
قورئان هەڵبگرە و پێشمەرگەی قورئانێ بە، بە شانازی
سەرمایەداریی و کۆمۆنیست، ناسیۆنالی و ماوی و نازی
ڕەگیان لە ڕیشە دەربێنە، هەرکێ بە دین دەکا وازی

## ئەی پێشمەرگەی مسوڵمان!

٢٠ / ٩ / ١٩٨٧ قەڵاتووكان

ئــەی پێشمەرگـــەی مسوڵمانی بە ڕاپەڕ!
بۆ پێشــــــەوە، كورەی خەبــات بخەگەڕ
ڕابماڵـــــە تـــەم و تەلبـــــەند و لەمپـــەڕ
بۆ مـــــەرگی زاڵـــمـــانـی پیس و بەدفـــەڕ
وەگـــــەڕخــــە شۆڕشی پیرۆزی بــاوەڕ
هـــــــــاوار بكــــــە بڵێ: (اللـــــە اكبر)

ئــــەی پێشمەرگەی مسوڵمان و خوداناس!
وەكـو تیغـی بڕنـده و نووكـی ئــــــەڵماس
وەكو شمشێری خوێنـــــاوی و دەمی داس
بۆ ئەستۆی تاغوتــی لە هــەق كــەڕ و كاس
وەگـــــەڕخــــە شۆڕشی پیرۆزی بــاوەڕ
هـــــــــاوار بكــــــە بڵێ: (اللـــــە اكبر)

ئـــەی پێشمەگــــــەی مسوڵمانی ئامادە!
ڕاپـــــــــــەڕە درك و داڵــی ڕێـگـــا لادە
ســـــــەری سەخت و شوومی تاغووتان بادە
سەنگــــــــەر بگــرە، ئــــەمڕۆ کاتی جیهادە
وەگــــــەڕخــــــە شۆڕشی پیرۆزی بــاوەڕ
هـــــــــــاوار بکـــــــە بڵێ: (اللـــــە اکبر)

ئەی پێشمەرگەی مسوڵمان، خاوەن بڕست!
مسوڵمانی شۆڕشگێڕ، چـــاپووك و چوست!
مۆڵـــــــەتی دوژمن مەدە هــەرگیز بە بست
بۆ نــــــەمانی دوژمنانـی خۆپـــــــــەرست
وەگــــــەڕخــــــە شۆڕشی پیرۆزی بــاوەڕ
هـــــــــــاوار بکـــــــە بڵێ: (اللـــــە اکبر)

# بزووتنەوەی ئیسلامیی [1]

١٦ / ٣ / ١٩٨٨ قەلاتووکان

بزووتنـــــەوەی ئیسلامی یـە ڕێگامان
بە تەنها خودایـــــە پشت و پەنامان
پێغـــەمبەری خودایـــــە پێشەوامان
دەنگی هەموو چەوســـاوانە سەدامان
نرخی نی یـــە ئازار و ئێش لە لامان [2]

---

[1] ئـازاری ١٩٩٠ لەلایـەن تیپـی سـروودی بـاوەڕەوە بـەدەنگی سـەید مەغدیـد(ئوسـامە هەولێری)و خۆم، گوتراوە و لە سەرەتای ١٩٩٤یش لەگەڵ کردنەوەی رادیـۆی مەرکەزیـدا بەناوی (دەنگی ئیسلام) کراوەتە مارشی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

[2] لێـرەدا بەمەبەسـتی بەرچـاوڕوونی، بەپێویـستی دەزانم ئاماژەیـەکی خێـرا بەوێـستگە سەرەکیەکانی ئەم بزووتنەوەیە و هەندێك لەگۆڕانکاریەکانی بدەم:

## گرنگترین وێستگە سەرەکیەکان

١ــ ١٩٧٨جموجـۆڵی دروسـتکردنی ڕێکخراوێکـی نهـێنی لەلایــەن چــەند زانــا و کەسـایەتیەکی ئیـسلامییەوە وەکـو: (م عەبـدولڕەحمان نەوڕەسـی، حـاجی مەهـدی، مـەلا مەحەممـەدی خورمـاڵی، مـەلا ئەحمـەدی قـازی، حەسـەن حەمـە خالیـد، حـاجی عەبدولڕەحمان سەرگەڵوویی، کـەمال دۆڵپـەمۆیی، کامـل حـاجی عـەلی)و ز ۆر بـەڕێزی دیکـەوە دەسـتی پێکـردووە و ڕێکخـستنێکی نهـێنی دروسـتکراوە، کـە ئەمـەش بــە بناغەی دروستبوونی (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق) دانراوە.

٢ـ له ١٦/٨/ ١٩٨٣دا (مامۆستا شیخ مەحەممەد بەرزنجی) هیجرەتی کردووە و چۆتە دەرەوە.

٣ـ ١٤/٩/١٩٨٤ (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق) وەك پارتێکی سیاسی ئاشکرا راگەیەندراوە و (مامۆستا شیخ مەحەممەد بەرزنجی) بووە بە یەکەمین ڕابەری.

٤ـ ١١/٨/١٩٨٥ کۆنگرەی یەکەمی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی لە شاری سنە بەستراوەو تێیدا (مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی) بەرابەر هەڵبژێردراوەتەوە.

٥ـ ١٤/٩/١٩٨٥ باڵی سەربازی بزووتنەوەکە بە ناوی (لەشکری قورئان)ەوە ناونراوە و شەهید (مامۆستا مەلا عەلی بیارەیی) کراوەتە بەرپرسی.

٦ـ مانگی ٧/١٩٨٦ (مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی) هیجرەتی کردووە.

٧ـ ٢/٩/١٩٨٦ کۆنگرەی دووەمی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی گیراوەو تێیدا (مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی) لە جێی (مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی) بووە بە دووەم رابەری بزووتنەوەکە.

٨ـ مانگی ١ ی ١٩٨٧ کۆنگرەی سێهەمی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی گیراوەو تێیدا (مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی) بە رابەر هەڵبژێردراوەتەوە.

٩ـ ١٥/٥/١٩٨٧ (مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز) لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر زانا و کەسایەتی و لاوی تردا، وەکو: مامۆستا مەلا عەلی برای و مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود (١٩٥٠ ـ ٢٥/١/٢٠٠٧)و... دوای راپەڕینەکەی ١٣/٥/١٩٨٧ی هەڵەبجە و روخاندنی گەڕەکی کانی ئاشقان لەلایەن بەعسەوە، هیجرەتی کردووە. شایانی باسە هەر لەساڵی ١٩٨٧ چەند دەستەیەك لە زانا و لاوانی ئیسلامخواز لە سنووری بیتوێن پشدەر و لەسەر و هەموانەوە مامۆستا عەلی باپیر، چوونە دەرەوە.

١٠ـ مانگی ٦/١٩٨٧ لە کۆبوونەوەیەکدا لەماڵی (مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی) لە شاری سنە، کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە بزووتنەوەکەدا کراون، لەوانە:

وشەی (پەیوەندی) لە بزووتنەوەکە کراوەتەوە، واتە: (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق) کراوەتە (بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق)و (مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزین)یش لە جێی (مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی) کراوەتە رابەری سێهەمی بزووتنەوەکە، هەروەها دروستکردنی چەند هێزێکی نوێ وەکو: هێزەکانی نەصر و حەمزە...

شایانی باسە لە بەرنامە و پەیڕەوی نێوخۆی پەسندکراوی موئتەمەری حەوتەمی ساڵی ١٩٩٧ی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا لەماددەیەکی سەربەخۆدا بەم شێوەی خوارەوە قسە لەسەر مێژووی بزووتنەوە دەکات: ماددەی هەشتەم: ساڵڕۆژی دامەزراندنی (باسك):

١- رۆژی ١٣٩٨/١٢/١ك- ١٩٧٨/١١/٢ز ساڵڕۆژی دامەزراندنی (باسك)ە.

٢- رۆژی ١٤٠٥/٣/١٢ك -١٩٨٤/١٢/٦ ساڵڕۆژی ئیعلان کردنی (باسك)ە.

٣- لە ١٩٨٧/٥/١٥دا ناوی بزووتنەوە لە (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی)یەوە گۆڕا بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامی).

٤- هەموو ساڵێك لەو رۆژەدا یادی دامەزراندنی دەکرێتەوە.

دیارە مێژووی خاڵی دووەمی نێو ئەم پەیڕەوە ڕاجیایی لەسەرە و ٩/١٤/ ١٩٨٤ڕاسترە لە ١٩٨٤/١٢/٦، هەروەها خاڵی سێهەمیشی کە مێژووی گۆڕانکاریەکانی (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی) بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامیی) بە ١٩٨٧/٥/١٥ داناوە، ڕاست نییە، چونکە ئەوە مێژووی چوونەدەرەوەی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز و هاوڕێکانیەتی و مێژووی گۆڕانکاریەکان (مانگی ٦ ی ١٩٨٧)ە، وەك لە خاڵی (١٠) دا هێناومە. هەروەها پێویستە بڵێم کە: لە پەیڕەوی نێوخۆی هەرکام لە بزووتنەوەی ئیسلامیی و بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی و کۆمەڵی ئیسلامیی دا، ئاماژە بە هەندێك وێستگەی مێژوویی و بە تایبەتی لە ١٩٧٨ەوە تا ١٩٨٧ دراوە.

١١ـ ٢٥ی سەفەری ١٤٠٨ك– ١٨ /١٩٨٧/١٠ کۆبوونەوەیەك لە شاری سنە سازکراوە و تێیدا جگە لە مامۆستا مەلا عوسمان کە وەك رابەر ماوەتەوە، لەنێو (٣٠) پاڵێوراودا (١٥) کەس بوونە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی.

١٢ـ رۆژانی ٢٢و٢٣ و ٢٤/شەوالی ١٤٠٨ك – ٦–٨/١٩٨٨/٦ز کۆنگرەی چوارەمی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەژێر دروشمی(سەرخستنی کار و چالاکی جیهادی) لە گوندی (براله)ی ناوچەی (شلێر)ی پێنجوێن و لە بارەگای هێزی (خالید) بەستراوە.

١٣ـ رۆژانی٢٠–٢٣/١١/١٤١٠ك – ١٣–١٩٩٠/٦/١٦ز کۆنگرەی پێنجەمی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (درزلی) لەژێر درووشمی ئایەتی (وجاهدوا فی الله حق جیهادە) بەستراوە.

١٤ـ رۆژانی ٢٥–١٩٩٢/٧/٢٧ کۆنگرەی شەشەمی بزووتنەوە لە (سەرئەشکەوتان) لەژێر درووشمی (رزگاری لەژێر سایەی ئیماندا) بەستراوە.

١٥ـ (مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز) لە مانگی ١٩٨٧/٦ – تاساڵی ١٩٩٨ و دوای بەستنی موئتەمەری حەوتەم، کە لە ٢١–١٩٩٧/١٢/٢٦ لە هەڵەبجە و سەرگەت و خورماڵ بەستراوە، رابەری گشتی بووە و مامۆستای ناوبراویش لە ١٩٩٩/٥/١٢ لە دیمەشقی پایتەختی سوریا بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

١٦ـ لە یەکەم کۆبوونەوەی گشتی دوای موئتەمەری حەوتەمی بزووتنەوە لە (٥–١٩٩٨/٢/٧) لە هەڵەبجە، (مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز) بووە بە چوارەم رابەری بزووتنەوەکە.

١٧ـ ١٩٩٩/٨/٢١ هەردوو(بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان)و(بزووتنەوەی راپەرینی ئیسلامیی) کە لە ١٩٧٩ بناغەی دانراوە و لە ١٩٩٢/١١/٢٣وەك پارتێکی ئاشکرا خۆی راگەیاندبوو و تا ئەو کاتەش (مامۆستا شێخ صدیق عەبدولعەزیز) رابەری بووە، یەکگرتنی خۆیان لە ژێر ناوی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی لە کوردستان/ عێراق) راگەیاند و (مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز) بوو بە رابەری و

(مامۆستا شێخ صدیق عەبدولعەزیز)یش بە جێگری رابەر و لەوێوە باسێك یاخود ناوو تەشکیلەیەکی رەسمی بەناوەکانی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) و(بزووتنەوەی راپەرینی ئیسلامیی)یەوە، لە گۆڕێ نەما.

١٨ـ لە ٦-٢٠٠٠/٨/١٢ کۆنگرەی یەکەمی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی لە تەوێڵە بەسترا و تەنها ئەم کۆنگرەیەشی بەست، دواجار کە ئەنجامی کۆنگرەکە لەلایەن جەنابی رابەرو کەسانێکی ترەوە قبوڵ نەکراو هەوڵە چرپوپرەکانی چارەسەریش بێ سوودو ئاکام مانەوە، لە ئەنجامدا (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) هەرچەندە ناو و ئۆرگانەکانی مابوون و(رێگای یەکبوون)ی زمانحاڵیشی دەردەچوو، بەڵام لەهەقیقەتدا لەلایەکەوە ناوێکی بێ ناوەڕۆك بوو و لەلایەکی دیکەشەوە لە ناوخۆدا دەکوڵی و لە ئان و ساتی تەقینەوەدابوو، ئەوەبوو لەیەکەم هەنگاودا کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان، کە زوربەی قیادە و قاعیدەی لەگەڵدا بوو، بە ئەمیرایەتی (مامۆستا عەلی باپیر) لە ٢٠٠١/٥/٣١ خۆی راگەیاند، هەروەها (جوندول ئیسلام و باڵی ئیصلاح)یش یەکیان گرت و ناویان لە خۆنا (انصار الاسلام)و (مامۆستا کرێکار) بوو بە سەرکردەیان.

(مامۆستا مەلا عەلی هەڵەبجەیی)ش لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا هاوڕا بوون، کاری خۆیان بە ناوی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) راگەیاندەوە و تا رۆژی وەفاتی لە ٢٠٠٧/٣/١٧ لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا، رابەری گشتیی بووە.

هەروەها دەستەیەکیش وەکو (بێلایەن) و لەسەروو هەموانەوە (مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی) مانەوە، بەڵام دوای گفتوگۆ و دانیشتی بەردەوام، لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان، یەکیان گرت و ئاهەنگی یەکگرتنەکەیان لە ٢٠٠١/٩/٢٢ لە سلێمانی ئەنجامدرا و (مامۆستا شێخ مەحەممەد بەرزنجی) بوو بە پێشەوای کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان و بەردەوام بوو تا رۆژی وەفاتی لە ٢٠١٤/٦/١٣ لە سلێمانی.

شۆڕشی مسوڵمانان لـــه ئـــــــــارادا
کاروانـــی ڕێگای جیـــهاد لـــه ڕێگادا
لـــــه پێناوی ڕەزامـــــــەندی خودادا
بۆ ئازادیی چەوســـــــــاوان لە دنیادا
تیَ دەکۆشیَ و لە تێکۆشـان کۆڵ نادا

---

١٩- ئێستا لەم گوزەرە خێرایەدا، یەکێك لەو ئەنجامانەی پێی دەگەین ئەوەیە: مێژووی کاروانی ئەم رابوونـە ئیـسلامییە، کـە لـە ١٩٧٨ەوە بناغـەی داڕێـژراوە و ڕێکخـراوە، تـەواو تێکـەڵکێش و پەیوەسـتە بەیەکـەوە و هـیچ کـەس نـاتوانیَ لـە یـەکتری جیـا بکاتـەوە، بۆیـە بـەڕای بەنـدە هـەموو ئەوانـەی لـەم کاروانـەوە سەرچاوەیان گرتووە و هەروەها تێیدا بەشداری سەرەکی بوون، نەك هەر مافیانە و بۆیان هەیە شانازی بە سەروەرییەکانیەوە بکەن و خۆیان بەدرێژەپێدەری بزانن، بەڵکو پێویستە و ئەرکە لەسەریان و ئەمەکداریی و وەفایە وابن و واش بمێننەوە و هەمیشە دەست بـەو مێـژوو و شـکۆ و سـەروەرییەوە بگـرن، کـە تـا بزووتنـەوەی یەکبوونی ئیسلامیی درێژ دەبێتەوە.

تێبینی: بۆ ئەم کورتە باسە جگە لە ئەرشیف و زانیارییەکانی خۆم، سوودیشم لـە (چـەند مەڵۆیـەك لـە خـەرمانی تەمـەنم (بیرەوەریـەکانم) بەشـی یەکـەم- ٢٠١٥ی مامۆستا عەلی باپیرو، چاپی دووەمی (ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان ١٩٤٦-١٩٩١) ئیدریس سیوەلی -٢٠٠٩ و، هەوراز و نشێو - ٢٠١١ ی م. حەسەن بابەکر و، پەیڕەوی نێوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامی - پەسندکراوی موئتەمـەری حەوتـەم -١٩٩٧ و، پـەیڕەوەی نێوخـۆی بزووتنـەوەی یـەکبوونی ئیـسلامی- کۆنگرەی یەکەم - ٢٠٠٠ و، پـەیڕەوی نێوخـۆی کۆمـەڵی ئیـسلامیی - کـۆنگرەی یەکەم- ٢٠٠٥ ، وەرگرتووە.

تێکۆشـــــان و جوولآن و شۆڕشی مه
خەبــات و بەرەنگاریی و کۆششی مه
تاووتین و هێـز و بیر و هـۆشـی مــــه
بوومەلـــەرزەی دڵی پڕ له جۆشی مه
بۆ نــــەمانی تاغووتــــانی غەشیمـــه

ڕێگامان کەند و لـەند و دڕك و زی بێ
گەلێك لەشکر له ڕێمان، دابـــەزی بێ
له سەرمان لاشەمان سڕبێ و تەزی بێ
هێزێك مێژوو شاهێدی نەبـــــەزی بێ
دووره هەرگیز دەستەمۆی ناحەزی بێ

هێزی ئیســــــــلام هێزێکی بــه هێزه
بێ داوەڵـــــه له بۆمبا و نووکی نێزه
بــــه ملیۆن تاغـووت و زۆرداری دێزه
لەنێو ناچێ ئەم پەیامـــــــه بەڕێزه
شاهێدمان مێژووه و بەڵگەش پەرێزه !

# دەسا ئەی مسوڵمانان ئەمڕۆ کاتی جیهادە[1]!

١٠ / ١ /١٩٨٨ قەڵاتووکان

ڕاپـــــەڕن دەی ڕاپـــــەڕن، دەبا بەس بێ، دانیشتن
تەماشاکـــەن تاغووتان، سەرگەرمن بە خوێن ڕشتن!
وڵات پڕ بووە سەرلـــــەبەر، لە فەسادی و لە کوشتن
هەر یەکبوونە و ڕاپـــــەڕین، بۆ(مـــــە) بڕبڕەی پشتن
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئـــامادە!

ئامادەی جەنگ و جیهاد، بۆ شـــــەڕ لەگەڵ تاغووتان
تاغووتان گۆڕبەگۆڕکـــەن، بە یـــەکبوونی هـــەمووتان
وەکارخەن لە ڕێی ئیســــــلام، هەموو هێزی بازووتان
بـا دوژمنانـی کافـر، خـۆڕانـــــــەگرن لـــــە ڕووتان!
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئامــادە!

---

[1] ئازاری ١٩٩٠ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە بەدەنگی حەسەن عوسمـان (فـەڕحان)و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

وەرن با هــــەموو لامان، ڕاپـــــــەڕین ورد و درشـت
لەنێو سەنگەری باوەڕ، دەست لەدەستو پشت لەپشت
لە ڕێی قورئان و ئیســــــلام، خۆمان بدەین بە کوشت
ڕیشـــــە و ڕەگـی زۆرداران، دەربهاوێژن لـــــە خشت
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئامــادە!

بە پێی فــــەرمانی خودا و پێغەمبەری ڕابــــــەرمان
ئەمڕۆ بێ پێچ و پەنا، جیهاد فــــــەڕزە لەســــەرمان
کەواتە: دەبا هەموو، بە ماڵ، بە گیان، بە ســــەرمان
خۆ باوێینە نێو سەنگەر، چۆڵ نەکەین سەنگـــــەرمان
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئامــادە!

با هەموو وەخۆکەوین، بە هـــــەوڵ و هەڵمــەت بردن
جیهادیی بین جیهادیی، بـــــە گیانــی پــڕ لێبووردن!
ئەمڕۆ فــــەرزە لە ســــەرمان، جیهاد و کۆشش کردن
با بی بەخشین لــــە ڕێی خوا، بوون و ژییان و مردن!
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئامــادە!

کاروانی  ڕێگای جیهاد، ئـــەوا ئـــەمڕۆ لـــــە ڕێ دا
لە گەڕدایـــــە بێ ترس، بـــە نـاوەند سەگ وەڕێ دا
سەگ وەڕی شەو ناتوانێ، بەو کاروانـــــــە زەڕێ دا
ئەمڕۆ پێشمەرگەی ئیســـــلام، لە مـەیدانی شەڕێ دا
دەسا ئەی مسوڵمانان، ئەمڕۆ کاتی جیهادە
بۆ شۆڕشی ئیسلامیی، ئامادەبن، ئامــادە!

# بانگەوازی جیهاد

١٠ / ٦ / ١٩٨٨ قەڵاتووکان

ئـــــەی مسوڵمانان جیهادە، بجوڵێنن هێزی بـــــازوو!
هەمووڵاتان شۆڕشگێڕ و پێشمەرگەی قورئان بن هـــەموو
ئایەتە، فەرموودەی خوایـە، فەرمان دەکا بێ سێ وو دوو
(انفِرُوا خِـفَافـــــًا وَثِقَالًا وَجَاهِـــــــــــــــــــدُوا)[١]

خەبـــات لە پێناوی ئیســـــــلام، پێویستە و پێویستە بکرێ
پێویستە مسوڵمان لە ڕێی، پــــــەروەردگار بژی و بمرێ
پێویستە مســـــوڵمان بـــەری پـــەلامـــاری کوفــــر بگرێ
بەرەنگاریی لەگــــــەڵ دوژمن، دوژمنی پێ لەنـــاودەبرێ!

تەماشاکـــــەن، هەق و ناهـــەق بەردەوام لە بەرەوڕووودان!
مسوڵمان یەکڕیز سەربەرزن، دەنا سەرشۆڕ کەلێك جودان!
پیشەی پێغەمبەران بوو وە، بە کورتی و بەبێ لە دوودان
بەرەنگاربوونەوە لەگـــــەڵ، هەموو فیرعەون و نەمروودان

[١] انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ الله ذلكم خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ التوبة–٤١

عیززەتی ئایینی ئیســـــلام، لـــە نێــو کاروانی جیـهادا
بـەڵـێ! بـێ دەنگــی و دانیشتن، دادی مسـوڵمانان نــادا
دەی مسوڵمانانی هۆشیار، هــەموو یەك دەنگ و ئامادە!
چاکی جەنگ و مــەردایـــەتی، وێکڕا لێ بکـــەن بەلادا

مســـوڵمانانــی شــۆڕشــگێـڕ، مســـوڵمانانــی ژیـر و ورد!
تەماشاکـــــەن ببینن دەی، دژی ئیسلام کوفر چی کرد!
ئــەوەی کوفر ئەنجامی دا، خـــەون نەبوو، مــەڵێن ڕابرد
ڕووسووری دنیا و دواڕۆژە، کەسێکی کەم ژیا و کەڵ مرد!

# ئیسلامه تاقه بەرنامه له ژینا[1]

١٩ / ٦ / ١٩٨٨

(بەستەمەلە)[2]ی بناری قەندیل

لــه ڕاپـــــەڕین دژی زوڵم و زۆرداریی
لــه جوڵانـــــەوه و شۆڕشی چەکداریی
لــه جیهاد و حــەماسـه و بـەرەنگاریی
بۆ دادگـــــەریی، بۆ ئــازادیی و ڕزگاریی
لای هۆشیاران ڕوونــه لەم سەر زەمینه
ئیسلامه تاقه بەرنــــامه له ژینا
(موحەممەد)ه ڕابەری ڕاستەقینه

بۆ هەرکەسێك که ئـــاواره و بێ جێ یه
بۆ هەرکەسێك ژینی بەسووت و سوێ یه
بۆ هەرکــەسێك چەکی خەبــاتی پێ یه
بۆ هەرکـەسێك ڕێگای خەبـــاتی ڕێ یه
بۆ هەرکــەسێك لـــــه دژی خوێن مژینه
ئیسلامه تاقه بەرنــــامه له ژینا
(موحەممەد)ه ڕابەری ڕاستەقینه

---

[1] ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوەو بەدەنگی خۆم و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

[2] بەستەمەلە، ناوچەیەکە لە دامێن چیای قەندیل لەپشت گوندی سوورەدێی سەر بە سەنگەسەر، لە ساڵی ١٩٨٨ بنکەیەکی هێزی (حەمزە)ی لێ بوو.

هەر کـــەسێك بیری ئـــازادیی لەسەردا
بۆ هەر کـەسێك بەرگی مەردیی لەبەردا
بۆ هەر کەسێك شەڕ دەکا لە سەنگەردا
ناچـــەمیٚ لە بەرانبەر داگیرکـــــەردا
بۆ هەرکـــەسێك خەریکی ڕاپـــەڕینە
ئیسلامە تاقە بەرنــــامە لە ژینا
(موحەممەد)ە ڕابەری ڕاستەقینە

بۆ هەر کەسێك خاوەنی هۆش و هەستە
بۆ هەر کـــەسێك کە ئـــازادیی مەبەستە
بۆ هەر کـــەسێك ژینی نـــاڵین و پەستە
بۆ ئازادیی چەوســـــاوانی ژێردەستە
بۆ هەرکـــــەسێك دڵ بـــە زام و برینە
ئیسلامە تاقە بەرنــــامە لە ژینا
(موحەممەد)ە ڕابەری ڕاستەقینە

# سروودی ئافرەتانی مسوڵمان

٢٥ / ٩ / ١٩٨٨ کەوپەڕ – خانێ

خواپـــەرستین، خواناسین، مسوڵمانین
گوێ ڕایـــەڵی فـــەرمایشتی قورئانین
جل و بـــەرگی ئیسلامیمان لەبـــــەردا
حاشا لە مۆدەی نەفـــــامی و نەزانین

ئێمـــەی ئافرەتانی مسوڵمان هـــەرچەند
ڕێگامان سەخت و دژواربێ و کەند و لەند
بە ئەرك و فەرمانی بەرنامــــــەی خواوە
هەتـــا مردن هـــەموو پابـــەندین، پابەند!

لە نێو جەرگـــەی پیلان و تانە و لۆمان
دەپارێزین حـــەیـــا و ئـــابڕووی خۆمان
بە ڕەشەبای نەفـــــامی ناهەژێ قەت
قـــەڵای بـــاوەڕ و شـــەرم و شکۆمان

ئەی دایکان و ئەی خوشکانی خۆشەویست!
کاتێك بـــەختەوەرن کـــە نـــەتانـــەویست
مۆدێل و نەریتی نەفـــامیی ســـــــەردەم
تف لە جەهل و قسەی شۆفاران و نەبیست

یەك یەكی ئێمە دەڵێ: ئیسلام ڕێمە
ڕێچکەی دەستکرد، بنی پێڵاوی پێمە
دەهۆڵ و زوڕنای فەسادی مانای چی!؟
کوا سەربەستی یە، ئابڕووچوونی ئێمە!؟

بڕوامانە لەم گوزەران و ژینە
پەیڕەوی لە ئیسلام هۆی سەربەرزینە
خوشکینە دەسا گوێ بگرن لە ئێمە!
ئافرەت تەنها لە ئیسلامدا سەنگینە

خوشکینە بڕوانن، تەماشاکەن گشت!
(سومەییە)[1] خوێنی لە پێناو خوا ڕشت
ئافرەت لە پێکهێنانی قەڵای کۆمەڵ
وەستایەکی کارایە و بناغەیە و خشت

خوشکینە! فەسادە هۆی پەشێوی مە!
باوەڕە، حیجابە، زێڕ و زێوی مە
بەختیارییمان بە ئیسلامەوە بەندە
لە ئیسلامدا بەرزە پایە و نێوی مە

---

[1] (سومەییە) هاوسەری (یاسر) بوو، خوا لێیان ڕازی بێ، هەردووکیان لە سەرەتای وەحیەوە لە مەککە بەهۆی سزادانیان لەلایەن بتپەرستەکانەوە، وەفاتیان کرد، خودی ئەبو جەهل بەنێزە لە سکی (سومەییە)ی داو گیانی سپارد، بەم شێوەیە بوو بە یەکەم شەهیدی ئیسلام کە خوێنی ڕژابێ.

خوشكینه ! دەی هیممەتی بازووی ئێوه !
با مسوڵمان بین بــــه تــــەواوی شێوه
گوێ مەگرن لە حەپـەی لاڕێیان هەرگیز
با ســــەگ بوەڕن، كاروانیش بـــەڕێوه

خوشكان! بـرایانـــــی بـــەڕێز و هێژا!
وریــــــا بن گەلێك گێژن لەنــــاو گێژا
فێـــڵ و تاكتیك و پیلانگـــــەلی كوفــره
داون لـــــــه ڕێمان، دانـراون لـــــه مێژه

خوشكینه ! گوێ بگرن له خوشكانی خۆ!
ئیسلامــــــه بۆ ئـــازادیی، خۆری ئاسۆ
گوێ مەگرن له دەهۆڵ و هاش و هووشی
هەڵگرانی بـەنێـو ئــــــازادیی ئـەمڕۆ!

# هەقیقەتە بێ لاملی و چەندوچوون

٢٣ / ١٠ / ١٩٨٨

(میراوا)ی سەردەشت

هــەقیقــەتــە، بێ لاملــی و چــەندوچوون
هەر ئیسلام و (حیزبوڵڵا)[١]یە، سەرکەوتوون
کوفر و تاغووت، سوک و ڕیسوا و ئاوەژوون
خەجاڵەت و شەرمـــــەزاری خوا و مێژوون

ئەم ئایینە بــەرزە دەبێ ســــەرکەوێ
خۆری ئـــازادیی بۆ گەلان دەرکـــەوێ
هەرچــەند هەبێ، لە ڕێ سەگوەڕی شەوێ
سەردەکـــەوین بە هێزی خودا و یەکبوون

مسـولْمانــان بـــە یـــەکێتی و برایی
دوژمنـان ڕاودەنێن ڕوو لـــە ڕیسـوایی
بـرای یـــەکن، بـرایـــانی بـروایی
(إِنّمَا الْـمُؤْمِنُـــــونَ إِخْـــوَةٌ)[٢]

[١] (...أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)المجادله -٢٢
[٢] الحجرات -١٠

مسولْمانان، دەست لەناو دەستی یەك نێن!
لە ڕێی ئـــەم ئایینە قـــەت ڕامـــەوەستێن
خەبـــــات بكەن بە سامان و سەر و خوێن
دڵنیابن، پـــاشـــــەڕۆژ ڕۆشنـــــە و ڕوون

خـودامـــان پشتیوانـــــە، خـوای بـــە توانا
كێ خۆی دەگرێ لـــــە ڕووی هێزی ئیمانا !
دەبــــەزێ هێزی شــــەیتان لـــە مەیدانا
هـــەر مسـولْمانان خـاوەن هێز و بـازوون

ڕێبـواری ڕێ یـــــــەكـی دوور و درێژین
بـــەڵـێ ماندوو دەبین، ئـــــازار دەچێژین
ماڵمان دەڕوخێ، خوێنی گـــــەش دەڕێژن
بـــەڵام ژێرپێ دەبن فیرعـــەون و قـــاڕوون

# خودایه ئەی خودایە! باشترین پشتیوانی [1]

١ / ١٢ / ١٩٨٨ سەردەشت

خودایـــە ئەی خودایـــە ! باشترین پشتیوانی!
باشترین پشت و پەنای کۆمـــــەڵی مسوڵمانی
لە تۆ دەپاڕێینەوە، بـــە ســـۆز و میهرەبانی
خوایـــە سەرکەوتوویان کە، موجاهیدی ئەفغانی

موجاهیدینی ئەفغان، مایەی سەربـــەرزی دینن
بۆ سەرکـەوتنی ئیســـلام، هەموو لاشە خوێنینن
بە پشتیوانی خـودا، نـازان، دوور لــە بـــەزینن
ماشـــائـــەڵڵا نموونـــەی جیـهاد و ڕاپەڕینن[2] !

---

[1] ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە و بـەدەنگی خـۆم و کۆرسـی پێـشمەرگە گوتراوە.

[2] جیهـادی موبـارەك و موجاهیـدانی گیـان لەسەردەسـتی ئەفغانـستان، وەك شۆڕشـێكی ئیسلامیی و دژەداگیرکەر و ستەمی ڕژێمێکی چەوسێنەر، کە بەپشتیوانی خـوای مـەزن، شکستی بە لەشکری سووری داگیرکەری یەکێتی سۆڤیەتی جـاران و ڕژێمـە وابەسـتەکەی ئەفغانستان هێناو هـەروەها ڕۆژانـی حەماسەسـازیی و فیـداکاریان و هێڵـە پێکردنـی ئـەو داگیرکەر و ستەمکارانە، هەمیشە مایەی شانازیی وخۆشحاڵین. بێگومان بە تەواویش لـەو ڕۆژە ڕەشـانە بێـزارین، کـە بـەفیت و پیلانـی ناحـەزانی نـاوخۆ و دەرەوە و سـادەیی و هەڵەنگوتنی خۆیان و دووبەرەکی و پەرتەوازەیی و گیرۆدە بوون بە پـەتای تونـدڕەوی و پەرگیریی، تووشی جیهادو خەباتی گەلی ئەفغانـستان بـوون، بەتایبـەتی لـە دوای سـاڵی (١٩٩٢)ەوە.

کوفر هــــەرچی کە هەیبوو، بەکاری هێنا هــــەموو
بەڵام خۆ موجاهیدین، چۆکیان دانـــــەدا بـــە موو
بە پشتیوانی خودا و هیممـــــــــەتی هێز و بازوو
دەجەنگن موجاهیدین، دەڕۆنــە پێش، بێ پشوو

گومانـــی تێدانی یــــــە، ئـــەوەندی نووکی دەرزی
کوفری گەندەڵ و بۆگــەن، ڕۆژێك دادێ دادەڕزی
بــــە (الله اکبر)ان، دڵـــــی دوژمن دەلــــــەرزی
بۆ ئیسلام دەبێ ئەنجام، سەرکەوتن و سەربەرزی

# ئیسلام و جیهاد[1]

۲۸ / ۱۲ / ۱۹۸۸ سنە

خەبات و جەنگ و تێکۆشان، دەدەن عیززەت بە ئەم دینە
بــەڵــێ ئــاییـنی بێ جیـــهاد، زەلیل و لاشــــە خوێنینە
مسوڵمانینە تێکۆشن، لـــە ڕێی ئـــــەم دینە شیرینە !
بزانن تــــەنها تێکۆشــــــان، ڕێبازی ســــەرفرزینە !
خۆ (موحەممەدول موستەفا) ســــەرکردەی موجاهیدینە !

ئەمن ڕێبوار و شوێنکـــەوتووی ڕێبازێکم، کـــە ئیسلامە
بەرنامــەی ژینمە قورئـــــان، (موحەممەد)یش پێشەوامە
بـزانن تـاوەکـــو مـردن، ئـــەوەی هـــەوێنی بڕوامە !
ئازادیی و شکۆمەندی مـــە، بـــە جیهادێ بـــەردەوامە
پێغـــەمبەری خوا دەفەرمووێ: جیهاد (ذرْوَةُ السّنام)ە[2]

[1] ئازاری ۱۹۹۰ لەلایەن تیپی سرووودی باوەڕەوەو بەدەنگی (ئوسامە هـەولێری)و کۆرسـی پێشمەرگە گوتراوە.

[2] ئاماژەیە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(درووودی خـوای لەسـەر بـێ) (......وَذرْوَةُ سـنامە اَلجِهادْ) ترمزی گێڕاویەتەوە، واتە: لوتکەی هەرەبەرزی ئیسلام، جیهاد و تێکۆشانە.

مسوڵمان کاتیَ دەتوانیَ، لە قورئـــــان فێر و حاڵیی بیَ!
کە مـــەردێکی موجاهیدی، جیهادی ســـــەر و ماڵیی بیَ
خۆدەنا ئـــەو مسوڵمانــەی، بیری لە جیهاد خاڵیی بیَ!
تیَ ناگا لە قورئـــان ئەگـــەر، دایم لەســـەر بەرماڵی بیَ
شاهێدە ژیانی پێغــەمبــەر، کەسێك لەودەم هەواڵی بیَ!

خـودایـــــــە! مـن تکاکارم هــەتــا ماوم لــە نێو ژینا!
لە پێناو بــــەرزی ناوی تۆ، لە پێناو بــــەرزی ئایینا
چەکی ئیســـــلام لە شانم بیَ، لە مـــــەیدانی ڕاپەڕینا
وەکـــــو (بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ)[1] بم، لــــە ڕیزی موجاهیدینا
بەخزمەت تۆ بگەم خوایـــــە! لەگەڵ بەرگێکی خوێنینا

[1] (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ ) الـصف – ٤ واتـە: بەڕاسـتی خـوا ئەوانـەی خـۆش دەوێـن کـە لـە پێناویـدا بـەڕیز دەجـەنگن و تێدەکۆشـن، دەڵێی بینایەکی پتەو و مەحکەم و تێکەڵکێشن.

# دایە ڕۆڵەکەت چۆتە جیهادێ[17]

٢٧ / ٢ / ١٩٨٩ سەردەشت

پێشکەشە بەهەموو ئەو دایکە بەڕێزانەی
ڕۆڵەکانیان چەکی (ئیسلام)یان بەشانەوەیە.

دایـــە ! ڕۆڵەکـــەت چۆتـــە جیهادێ
بـــە بوونـــی جیهاد ئـــازادیـــی دادێ!
دایە ڕۆڵەکـــەت مـــەردە و گیان فیدا
کوڕت پێشمەرگـــەی خودایە، خودا! !

دڵت قایم بـــێ، تـــوخوا دایـــــەگیان!
مـــردن بۆ خودا، ژیانـــــــە ، ژیان!
کەسێك لە ڕێی خوا بێتە مـــــــەیدانێ
لــــەپێناو خوادا گیانـــی خـــۆی دانێ

[1] ئازاری ١٩٩٠ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوەو بەدەنگی سەڵاحەددین مەحەممەد و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

بــەڕاستی ئەمــــــــە جێی شانازی یە
خوا لە کـــەسێکی ئـــــاوا ڕازی یە!
کـوڕێك پێشمــەرگـــەی ڕێبازی خوابێ
گیان لـــەســـــەر دەستـی بیر و بڕوابێ

بیر و بـــــــاوەڕی پـاکـی ئیســـلامیی
بووبێتە هــــەوێن بۆ ڕێی مـــــــەرامی
توخوا دایەگیان! چۆن بۆ ئەم کوڕە!؟
دڵـت لـــە داخ و مــــەراقــــان پـڕە!

دایەگیان! گەلێك کـوڕی ئـەم خەڵکە!
لـــــەسەر ڕێیەکـی پووچ و بێ کەڵکە
کە خەڵکێك لەسەر، ڕێی شەیتان دەڕوا
کـوڕی تۆ چــەکی لە شـــانە بۆ خوا!
دایـــــە! دەزانم ئێســــتا لێم حاڵـــی
جێی شـانـازی یە، لـە ڕێی خوا، تاڵیـی

دایـــــە! لە مێژە کــەوتۆتــە بەرگوێت
بەبێ ماندووبوون، ئیسلام ناچەسپێت!
بێگــومــان خوێن و ئـــــــارەقی دەوێ
بێ خــــەوی و ڕۆین و چالاکی شـــەوێ
بۆیە دایـــەگیان! کاتێ شــەهید بووم
توخـوا مـــەگریێ، نـــامـرم، زیندووم!

# گەلی کوردی مسوڵمان

١٩٩٢ سەرئەشکەوتان

گـــــەلی کوردی مسوڵمان    راپـــــــەڕی مان و نەمان
سەرکەوت و سـەرفراز بوو    بە ویستی خوای میهرەبان

ئەو گەلــەی بێ نــەوا بوو    خاك و خۆی لە خوێنا بوو
راپەڕی یــەك دەنگ و دڵ    ئەمەش بەخششی خوا بوو

بەنـــاوی خواوە هــەستا    لـــە ڕووی دوژمن ڕاوەستا
سوپاس بۆخوا کـە ئەمڕۆ    گـــەل و وڵات سەربەستە

ئـــازار و ئـــــاوارەیی    (ئازادی)یـان پێ پێگەیی
ئـــازادیی بە هــــەوێنی    میهرەبانیی خوا مـــەیی

گـەلی قارەمانی کـــورد !    ئامادەبـــــــە وریا و ورد
یەکگرتوو بەو خواپەرست    بـــاوی دیلیەتـــی ڕابرد

# یەکگرتن[1]

خانێ ١٩٩٠

یەکگرتن، یــــەکڕیزی، یــەکبوون و برایەتی
دێننە دی بۆ کۆمـــــەڵ، هەرچی هیوایەتی
ئـــــەی بڕواداریـنــە، واجبــە یـــەکێتی!
فەرموودە و فەرمانی خوایـــــــە، ئایەتی:
(وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا)[2]

یەکێتی تان هەبێ، ئــــــەی مسوڵمانینە!
یەکێتی، قەڵغانە، سەنگـــــــەرە، پەرژینە
یەکێتی پێ دەوێ، بــــــەرزی ئەم ئایینە
یەك دڵی، یەکڕیزیی، مایـــەی سەربەرزینە

بەرهــەمی یەکبوونە، عیززەت و هێز و پێز
سەربڵندی و گەشە و هەیبەت و سام و ڕێز
لەڕاست یەکێتی دا، کۆڵــە ئەڵماس و نێز
هێز لــە یەکێتی داو یــەکێتی یـەعنی هێز

[1] ئـازاری ١٩٩٠ لەلایـەن تیپـی سروودی بـاوەڕەوەو بـەدەنگی سـەید مەغدیـد (ئوسـامە هەولێری)و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.
[2] (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) ال عمران –١٠٣

ئەی مسوڵمان! برام، وردبەوە کێم و کێی
تەنها من فیریای تۆ و تۆ دەفریای من دێی
خۆشەویستی خودان، ئـــــەو بڕوادارانەی
وەکو (بُنيَانٌ مَرْصُوصٌ)[1] دەجەنگن لــەرێی

یارمەتی خوا لەگەڵ، یەکێتی و یــەکبوونە
نموونەی یەکێتی یە، بوونی ئەم گەردوونە
یــەکگرتن ســـــەرچاوێکی زوڵاڵ و ڕوونە
یەك قمی مایـــــەی فێنکی دڵ و دەروونە

ئەی ئیماندارانی سەرتاســــــەری جیهان!
تاکەی گوڵی وەحدەت، سیس بێ و ون بێ و نیهان
بایــــەکبگرین چونکــە، بۆ ئێمەی مسـوڵمان
ناکۆکـــی و ئیختیلاف، وەك ژەهری ئەژدیهان

---

[1] (نّ اللّهَ يُحِبُّ الّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفّاً كَأَنّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ ) الـصف – ٤ واتـە: بەڕاسـتی خـوا ئەوانـەی خـۆش دەوێـن کـە لـە پێناویـدا بـەڕیز دەجـەنگن و تێدەکۆشـن، دەڵێی بینایەکی پتەو و مەحکەم و تێکەڵکێشن.

# کوردی مەزڵوم[1]

خانێ ١٩٩٠

کوردی مـــــەزڵومی دڵ بەزام!
وەرە با لەدەوری ئیســــــلام
خڕبینـــەوە و پـــاڵ ویکدەین
یەك هێزو بازوو و دەست و قام

گەلی چەوساوەی کوردی خۆم!
خەمی تۆمـــە و خەمباری تۆم
کـــــە دەبینیم ژینـــی تـــاڵت
گڕ دەگرێ دەروونی پـڕ ســۆم
وێرانەیـە خـــاك و خـــانووت
بـــە هـۆی تۆپ و ناپاڵم و بۆم

میللەت دەمێکــــــە بێ دادی!
دیل و ژێر دەستە و ناشـــادی
لـــەمێـــژە شـــۆڕش دەگێـڕی
لـــــەپێناو ژینی ئـــــــازادی
ئـامـان چـــەندە زۆرلێکراوی!

---

[1] ساڵی ١٩٩٠ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە لە ئاهەنگێدا لە (دێڵژێ) بەدەنگی مەلا ئەحمەدی هەنارۆکی و کۆرسی پێشمەرگە گوتراوە.

تـووشـــــت بـووه، بـــێ مــرادی
گـــەلی بـــــە بۆمبا کاس و وڕ!
دنیا لـــە ئـــــــاوارەی تـۆ پـڕ
لە هــەزاران (هــەیئەی کەرکووك)[1]
لاشـــــەت دەکــرێ، ونجڕ، ونجڕ
دەگیرێ و دەکـــــوژرێ یـــەکسان
ژن و پـیاو، منـــــدالّ، کـچ و کـوڕ

ئەی گـــەلی کـوردی چەوســـاوە
دلّ و سینەت پـــڕ زوخــــــاوە
لـــەمێـژە ئـــالـــــودەی دیلیی
لـــە هــەر چوار لات بەند و داوە !!
میللـــــەت وەرە بـۆ ئـــــازادیی
دەســــت بگـرین بــە دینی خــواوە

[1] یەکێك بوو لەو زیندانە شووم و نەگریسانەی کە بەعسییە درندەکان بۆ قەلاچۆکردنی گەلی کورد بەکاریان دەهێنا.

# من هەڵەبجەم

١٩٩٣ رانیە

من هەڵـــــەبجەم، مینبەری ژانـــــی وڵات
کێ لە گریـــەم تێ ناگا، دەك پێ نەگات!
میللەتی من مـــەردە قوربـــــانی دەدات
جۆشی سەند بەخوێنی من کورەی خەبات

من هەڵـــەبجەم، نامۆنیم ئـەمڕۆ لە کەس!
گـــــەل پەساپۆرتی هەڵەبجەی وا لەدەس
ڕابووە، ڕانـــــاوەستێ تـــا دوا نەفـــەس
هـــەردەبێ هێزی تاغووت بێنێ هـــەرەس

من هەڵـــەبجەم، من ستەمدیدەی (بەڵا)م!
من کە شاری خــــاکی کوردی بێ سەڵام
ڕاستە دوژمن دایوەراند پەلك و گـــــەڵام
ئەمما دیوو چۆن، خوام لەسەر هاتە وەڵام!

من هەڵـــــەبجەم، لاشەکـــەم پرپۆڵـــەیە!
خوێن و گۆشتم تێکـــــەڵی ئەم خۆڵـــەیە
ڕۆڵەکانم، مـــەردی من ئـــەو ڕۆڵـــەیە!
قـــارەمـــانی گۆڕەپـــانی تۆڵـــــەیە

# باوەڕی ئێمە نالەرزێ [1]

١٠ / ٢ / ١٩٩٣ رانیە

باوەڕی ئێمە نالەرزێ
نالەرزێ باوەڕی ئێمە
لە هەموو شت بەهێزترە
(الله اکبر)ی ئێمە

ئیسلام بەرنامەی ژیانی
تەواوی ئادەمیزادە
تاقە ڕێبازی ئازادیی و
سەرچاوەی بەختیاری و دادە

یەکتاپەرست و خواناسین
تەنها (الله)یە خودامان
ڕێبواری ڕاسترین ڕێیین
پێغەمبەرە پێشەوامان

---

[1] ئەم سرووده لە یەکەمین سالڕۆژی دامەزراندنی تەلەفزیۆنی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە بیتوێن لە شەوی ١٧-١٨/٢/١٩٩٣، پاش تۆمارکردنی لەلایەن کۆرسی تیپی سروودی(خاك)ەوە (کە هەر درێژکراوەی تیپی سوودی باوەڕ بوو) وەك مارشی تەلەفزیۆن دابەزێنراو تاکۆتایی(١٩٩٣) بەردەوام بوو، دیارە تەلەزیۆنەکە بۆ یەکەمین جار بەڕەسمی لەشەوی١٧-١٨/٢/١٩٩٢ دەستی بەکارکرد.

ئالآى بـــــەرزى دينـى خـودا
بۆ هـــــەميشە شــــەكاوەيە
كاروانـــــى شـــۆڕش و جيهاد
بــــــەردەوام و نـــــەبڕاوەيە

بانگـــــەوازى ئيســــــلامى يـــــە
ئەى چەوساوەو ڕەش و ڕووتان!
تـــــەنها شۆڕشـــــى بــــــاوەڕە
سێدارەى ئـــەستۆى تاغـووتان

سەرچاوەى زانست و شۆڕش
تەنيا پەيــــــامى ئيسلاميى
ئيسلام، يـــــەك شۆڕشە دژى
كوفر و ستــــەم و نەفـــــامى

(الله)يـــــە پشـت و پـەنـامــان
تێكـــــــڕا دەڵێيين: نـەسرەوتن
خەبات لە ڕێى خوا و چەوساوان
يا شـــــەهيدى، يا ســـەركەوتن

# باوەڕی مە نالەرزێ[17]

٢٦/٣/١٩٨٨ قەڵاتووکان[2]

تاغوتـــــــانی خۆپیێ زۆر دوژمنـــــــانی دیکتاتۆر
پیلانگێڕانـــــی خوێنخۆر بـــە پیلانی جۆربـــەجۆر
هەوڵـدەن و بیانـــــەوێ ســــــەری ئێمە دانەوێ
بـــا بزانن دوژمنانــــــی، دڵ رەق و بەدفەڕی مە !
بـــــاوەڕی مـــە نالەرزێ نالەرزێ بــــــاوەڕی مە
لـــــە ئەتۆم[3] بــــەهێزترە (الله اکبر)[1]ی مــــــــە

---

[1] شایانی باسە ئەم دوو شیعرە ( باوەڕی ئێمە نالەرزێ) و(باوەڕی مە نالەرزێ) کە ناوونیشان و کۆپلەی یەکەمیان لێکچوویە، ئەوەی دووەم کە لە ١٩٨٨ لە بەستەمەلە نووسراوە، ساڵی ١٩٨٩ لە (مەشخەڵی بەرەنگاری)دا چاپ و بڵاوکرایەوە و لە (مەدالیای کوردستان) لە ساڵی ١٩٩٨ دا بڵاوم نەکردەوە، بێگومان ئەوەی یەکەمیش ئیلهامی لەو وەرگرتووە، هەر لەبەر ئەو لێکچوونەش لێرە بەدوای ئەودا هێناومەتەوە.

[2] ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوە لە ئاهەنگێدا لە بارەگایەکی هێزی (حەمزە)ی ئەو کات لە(بەستەمەلە)ی بناری قەندیل بەدەنگی شەهید (خدر بۆسکێنی) و کۆرسی پێشمەرگە، گوتراوە و هەروەها جارێکی تریش ١٩٨٩ لەلایەن هەمان تیپ و بەدەنگی حەسەن عوسمان و خۆم و کۆرسی پێشمەگە گوتراوەتەوە.

[3] شایانی باسە (تیپی سروودی باوەڕ) بەندە، بەهاوکاری چەند برایەکی پێشمەرگە لەگەڵ کردنەوەی بارەگای هێزی (حەمزە) لە ساڵی ١٩٨٧ لە قەڵاتووکان، دامان مەزراند و حەماسەتێکی تایبەتی دەدا بە پێشمەرگە و خزمەتێکی ناوازەی پێشکەش دەکرد و

تاغوتـــــــانی کەللە ڕەق		دوژمنانی ڕاستیی و هەق
ڕەنگ ڕەموزنانی چـاو زەق		هەزارانی وەك (عەفلەق)[٢]
هەوڵــدەن و بیانـــــەوێ		ســــــەری ئێمە دانەوێ
بــــا بزانن دوژمنانــــی،		دڵ ڕەق و بەدفەڕی مە !
بـــــاوەڕی مـــــە نالەرزێ		نالەرزێ بـــــاوەڕی مە
لـــــە ئەتۆم بــــەهێزترە		(الله اکبر) ی مــــــــــە

---

دەنگێکـی زوڵاڵـی (بـاوەڕ و چـیا و پێـشمەرگە و سـەنگەر و شـۆڕش و شـیعر و هونـەری شۆڕشگێڕیی) بوو.
پێویستە بلێم، بەرهەمـەکانی ئـەو تیپـەش هاوتـای وتـار و ئاهەنگـەکان، بەپلـەی یەکـەم لەلایـەن برایـان(عەبدولکـەریم قـادر خـزر) و(تـەها حـاجی زاهـیر)ەوە کـە هـەردوکیان پێشمەرگەی هێزی (حـەمزە) بـوون، تۆمـار و بڵاودەکرانـەوەو بەگـشتیش لـە وێنـەگرتنی فۆتۆگرافی و ڕاگەیاندندا خزمەت و ڕۆڵی گەورەو نایابیان هەبوو.
[١] بێگومان دروشمی (الله اکبر) لـە هـەموو شـتێك گـەورەترە، وەك لـە شـیعری (بـاوەڕی ئێمە نالەرزی)دا هاتووە، ئەمە ئەوکات بـە پێـوەری چـەك و شـۆڕش و ڕووبەڕووبوونـەوە باس لە ئەتۆم کراوە، کە گەورەترین چەکی سەردەمە.
[٢] (میشێل عەفلەق)ی دامەزرێنەی حیزبـی بەعـسی عـەرەبی ئیـشتراکی، کـە کابرایـەکی گاور بوو و حیزبەکەی – کە لە ساڵی ١٩٤٧ یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی بەسـتراوە– هەزاران کارەسات و نەهامەتی بەسەر گەلی کـورد و کوردسـتان و عێـڕاق و مـسوڵمانان و جیهاندا هێنان.

چـــەوسێنەرانــــــی زۆردار	هارین وەکـــو گورگی هار
گشت هـــــەولێ بخەنـــەکار	بە پیلان و پــــــــەلامار
هەوڵــدەن و بیانـــــــەوێ	ســـــــەری ئێمە دانەوێ
بــــــا بزانن دوژمنانــــــی،	دڵ ڕەق و بەدفەڕی مە!
بـــــــاوەڕی مــــە نالەرزێ	نالەرزێ بــــــــاوەڕی مە
لــــــە ئەتۆم بــــــەهێزترە	(الله اکبر) ی مـــــــــە

دوژمنانـــــــی داخ لــــــە دڵ	بە بۆمبا و بەند و کێبڵ
گشـــت وڵات بهێننە کـــوڵ	هـــەتـــا دەڕۆنە ژێ گڵ
هەوڵــدەن و بیانـــــــەوێ	ســـــــەری ئێمە دانەوێ
بــــــا بزانن دوژمنانــــــی،	دڵ ڕەق و بەدفەڕی مە!
بـــــــاوەڕی مــــە نالەرزێ	نالەرزێ بــــــــاوەڕی مە
لــــــە ئەتۆم بــــــەهێزترە	(الله اکبر) ی مـــــــــــــە

# ئەی شەهید تۆ نامری

١٩ / ١٢ / ١٩٩٣ رانیه

ئـــەی شەهید، تۆ نەمردووی، تۆ نـــامری!
تــۆ لـوتکـــــەی فیـداکاریـی و خــۆڕاگریی
لەگـــــەڵ ڕژانی یەکـــەم تنۆکـــە خوێنت
خوا خۆش دەبیّ لە گوناهت، بەرزە شوێنت

ئـــــەی شـــــەهید، تۆ هێمای شانازیمانی!
تۆ مەشخــــــەڵی جیــهاد و تێکۆشــــانی
تۆ گوڵبژێری ویست و ڕەزامـــــەندی خوای
تــۆ بـــوڕکانـــی ڕقــــــی پیرۆزی بـــڕوای

خوێنت نمـــــەی بـــارانی خــــاکی دێمە
خوێنت وزەیـــــە بۆ بـــــــاوەڕی ئێمە
خوێنت تیغی قــــەفــی زنجیر و کۆتــــــە
خوێنت زەندەقبـــەری خوێنڕێژی خۆتـــە

خوێنت ئـــــاسۆی خۆری ئـــازادییمانـــــە
خوێنت وەرزی بەهــــــاری شادییمانـــــە
بــــــەرگی خوێنینت مـــژدە دەدا پێـمان
سەردەکـــــــەوین، وەدی دیّ ڕۆژی نوێمان

## بەرنامەی ژینمان

٨ / ١٢ /١٩٩٥ رانیە

ئیسلام، بەرنامەی ژینمان
ئیســلام، تاقــە ئاییینمان
ڕێبازی تێکۆشـــــــان و
مەشخـــــەڵی ڕاپەڕینمان

تەنها (ئیســلام)مان ڕێ یە
ڕێ یەو لە ڕێچکان جوێ یە
مژدەی ژینی ئــــازادیی و
داد و بــەختیاریــی پێ یە

ڕێبواری ڕێی (ئیســلام)ین
لە جیهاد بــــــەردەوامین
لــــە ڕووی ژان و ناخۆشی
خۆگــــــر و بــــە ئارامین

بێدارین، خـــاوەن هۆشین
بە حەماســـــە و خرۆشین
لەپێناو خوا و چەوســاوان
تــا مــاوین تێ دەکۆشین

# وەرن با پەروەردە بین

٨ / ٢ / ١٩٩٥ رانیە

وەرن با پەروەردەبین، پـــەروەردەبین!
پەروەردەی ئەم ئایینە، بێ گــەردەبین
ڕێنوێنی یە جوانەکانی ئـــەم ئیســلامە
چرای ڕێگـــەن، هەتا ژین بـــەردەوامە

ئای لەو بەرزی و بەختەوەریەی لەوی دا!
دینی هەقـــە و هــەروا لە پێشڕەوی دا
خۆری سەرفرازییە و پڕشنگی ئــــەو
لە گۆڕدەنێ، دێوەزمەی تاریکی شـــەو

ئەگـــەر ئینسان تەلاسابوو لە ڕێی هەق
بیری گەندەڵ، دڵیشی وەك بەردی ڕەق
ئـــەوە دینە، خوداناسینە، یـــاران!
ئینسان دەکا بــە دڵسۆزی هـــەژاران!

وەرن بـــا پـــەروەردەبین و ڕونـــاکبیر!
ڕێی ڕاست بگرین، هــەمیشە عاقڵ و ژیر
بەهێز کەین پـــەیوەندی و برایـــەتیمان
ئاسودەبین لـــەژێر سێبـــەری ئیمان

# میوانی ئازیز

٢ / ١ / ١٩٩٨ هەولێر

ڕەمەزان! ئـــەی میوانی بەرز و ئازیز!
بۆ پێشوازیت هـــەموو وەستاوین بەڕیز
تۆ سەرەپا ڕەحمــەت و خێر و خۆشی
قوتابخانـــــەی سۆز و میهر و پەرۆشی

خوا فەرمانی کردووە و ڕۆژوو و دەگرین
خواپەرستین، دەیپەرستین، تا دەمرین
ڕۆژوو ڕاهێنـــــەری نـــەفس و دەروونە
ئـەوەی گیرۆدەی نەفسی بێ، زەبوونە

ڕەمەزانـــــە و واهـــــاتەوە و بەخێری
خەڵاتێکـــــە و خوا بۆ ئێمەی دەنێری
هـــەرکـــــەسێ ڕێزی لێ بگرێ، بەڕێزە
ئای ڕەمەزان چـــەندە بەپیت و پێزە!

## جەژن

١٩٩٥ رانیە

جـــەژنتان پیرۆز بێ، جـــەژن
جەژنمان، جەژنێکــــــە مەزن
خوایـــــــە ! دارِێژە لەم جێژنە
سۆز و بـــــەزەییت بـــــە رِێژنە

جەژنتان پیرۆز بێ، ئـــەی گەل
جەژنەیـە، خێر و خۆشی و هەل
جەژنی بەرزیی و بــــــەندایەتی
هــــەل و هەوێنی برایـــــــەتی

دەبا لــــەم جەژنــــــە گەورەدا
گەورە و گچکـــــە و دارا و گەدا
دەگەڵ خوای مەزن و میهرەبان
پەیمان نوێ کەینەوە، پەیمان!

بەخێربێی جـــەژنی هــــەموومان
بە تۆ گەشــــــــاوەیە رِووومان
ئێمــــەش بە خۆشیت دڵخۆشین
لــــــە خێرت خۆشی دەنۆشین

# بوون

بوون، بوونێکــــە هەبێ لـــــە زاتی خۆدا
کە پێداویستی (بوون) هەبوون لە تۆدا!
ئەوە هەیی و لەگەڵ دۆست، ناحەزیشت
گـــــەر دانیشت پێدا نـــــەنێ لەمـــڕۆدا
دەبێ ناچار سبەینێ پێت بڵێ: هـــــەی
یاخود دەبێ ســـەری لە چیای (گمۆ)[1]دا

---

[1] چیایەکە دەکەوێتە ناوچەی (شاناخسێ)ی سەر بە قەزای ماوەتی پارێزگای سلێمانی.

# شەماڵ

١٩٩٥ رانیە

شەمــــاڵ یاخوا بەخێربێی
خۆتمان تێکــەڵی خوێن کە
یاخوا لــە خوا بەزیــاد بێ!
ئــەم شنەبایـــــە فێنکە

کــە لەگــەڵا و گوڵ دەدەی
خـــەمی نێو دڵان دەبـــەی
ئـــەی نەشئە بزوێنی مــە!
دەکــەی باوەشێنی مـــە

نـــەرم وەکــو دەستی ناز
لەگـــەڵ زەردەخەنە و ڕاز
دیمەنێك دەســــــازێنی
دڵ وەپێکــــــەنین دێنی

ئـــەی هاوڕێی کاکی ڕێبوار
دۆستـی دێرینـی جـوتـــیار
کاتی خــەل و خــــەرمانێ
کێ یـــە قەدرت نـەزانێ!؟

شەمـــــاڵ تۆ لــە هاوین دا
گوڵی لـــــە بـــاغی ژین دا
من ســوپـاسگـوزاری خوام
تۆش دەشنێی هێدی و ئارام

# سەرایڤۆ[1]

٢ / ٤ / ١٩٩٥ رانیه

ئەی سەرایڤۆ ئەی، خاکی خوێناوی!
وەك قەندیل لە ڕووی کوفر وەستاوی
بــەنــاوی خــودا گورج و خۆڕاگر
سەنگــەرت گرتووە لە صرِبی کافر

سەرایڤۆ، نالّــەت جیهانی پڕکرد!
هەزاران ڕۆلّــەت، بۆ قوربانی و مرد
ڕووباریان هەلّبەست لــە خوێنی ئالّت
خستیانــە ژێر تانك، ژن و مندالّت
بەلاّم مەردانــە هەر لە سەنگەردای
چونکە پێشمەرگەی سەنگەری بڕوای

---

[1] پایتەختی ولاّتی بۆسنەوهەرسك، کە گەل و خاکەکەی کەوتە بەر شالاّوی دڕندانەی صربە داگیرکەر و دڕندەکان و خوێنێکی زۆری بەناهەقی مسولّمانیان تێدا رشت.

قەت ســــــەربڕین و بۆردوومانی چڕ
شاڵاوی سوپـــــای، بێ بەزەیی و دڕ
گوللەبـــارانی خـــــەڵکی بێ تاوان
ئابلۆقــــەی نان و پۆشاك و دەرمان
چۆك بەمــــــەچەکی بڕوات دانادەن
دەبێ ســەری خۆ، بە بەردی دادەن

ئای لەو ستەمــــەی لەو گەلە کراوە!
بۆچی لەسەرچی، بەم دەردە براوە!؟
پەیـــامی هـــەیـــە سەرایڤۆ بۆمان
تەنها چارەســــەر یەکبوونی خۆمان
ڕوونــە ئـــامـــانجی دوژمنانی دین
توخواکەی وەرن، باهەموو یەك بین!

# گرۆزنی[1]

٣ / ٤ / ١٩٩٥ رانیە

ئەی شاری خەڵتانی خوێن، شارەکەی گرۆزنی!
تۆ شەقـــام و خانوو و خـاك و خۆڵ و تۆز، نی
تۆ لوتکــەی بـاوەڕی، ڕۆچوو وی چەشنی چیا
تۆ ســـەربـــەرز و دوژمنت زەلیل و ڕووسیا

ئەی مەڵبەندی بەرخودان، ســەرتۆپی چیچان!
مەردن ئەوانـــەی لەناو، سەنگـــەری تۆدان
دۆست و دوژمن شــــاهێدە، بۆ نەبــەردی تۆ
ئەی خاکی ڕقی پیرۆز، ڕاستیی مـــەردی تۆ!

خەبــــات و ئاوارەیی و خوێنی شـــــەهیدان
لە پێناوی ئـــازادیی و بوون و بـــــەرزییدان
گــرۆزنـــی و (دۆدایف) هێمای، قــارەمانێتین
قـــــارەمانێتی بۆ خوا و ســـەرکـــەوتنی دین

---

[1] پایتەختی وڵاتی شیشان یـاخود چیچان، شـایانی باسـە دوای شـەهیدبوونی (جەوهـەر دۆدایف)ی سەرۆك و سەرکردەیان لە ١٩٩٦/٤/٢١ ، چیچانییەکان وەك وەفایەك بـۆ ئـەو، ناوی پایتەختی وڵاتەکەیان لە(گرۆزنی)یەوە بۆ (دۆدایـف) گـۆڕی، دیـارە دواتـر ڕوسـیای داگیرکەر ئەم وڵاتەی داگیرکردەوەو خەڵتانی خوێنی کرد

مایەی شانازیی هەموو مسوڵمانان تۆی

کاروانی بڕوای بەرەو سەربەرزی دەڕۆی

مادام پەرچەمی باوەڕ، بەرزە لە دڵتا

خوایاربێ شەکاوەیە، لە خاک و گڵتا

# ئەستێرە

٥ / ٤ / ١٩٩٥ رانیە

ئەی ئەستێرەکان، جوانن بەڵام جوان!
ئێــوەن گــوڵــزاری ڕازاوەی ئــاســمان
جوانی و جریوە و تریفـــــــەی ئێوە
دیاری و بەخششی، بــەخشندەیی خوان

بـــە ئاسمانـــەوە دەگەشێنـــەوە
ســروودی جوانیی و ژین دەڵێنـــەوە
ئـــەندێشە و زەینی دەخرۆشێ زانـــا
بـــەو سیمای گەش و هەست بزوێنەوە

ئـــــەوەندە زۆرن، لـــە ژمارە نایـــەن
دەخولێنەوە و بێ، کۆڵەکـــــە و پایەن
هێزی کێشندەی نێوان هاوســـــەنگە
ویستی خودایـــە و نەخشی ئەو خوایەن

(حەوتەوانە)و (كۆ)، (تەرازوو)ش لەگەڵ
(گەلاوێژ)ی گـــەش، هەموو بە كۆمەڵ
جێگای ســـەرنج و خۆشـــەویستی مەن
وانـــــەی بێدارییـن، بۆ لاڕێ و دەغەڵ

بەه، بەه، چ خاوەن ڕەنگ و ڕووخسارن!
ڕەوێنـــەرەوەی ســامی شـــەوگارن
ئـــەوەندە زۆر و جـوان و چـــڕوپـــڕ
بەڵگـــەی گـــەورەیی پـــەروەردگارن

# ڕێبازی سەربەرزیمان

١٢ / ٥ / ١٩٩٦ رانیە

وەرن بـــا ڕێی خوا بگرین
بۆ خـــوا بـژین و بمـــرین
تەنها ئیسلامـــــە و ئیمان
ڕێبازی سەربـــــەرزیمان

ئیسلام ئەی دینی خوای تاك
پەیـــامی پیرۆز و پـــاك
هــــەتــاكـــو دڵمان لێ دا
بۆ تۆ ســـەرمان لــە ڕێ دا

بـــــەرزی دوارۆژ و دنیا
بۆ کەسێکـــــە، بۆ خوا ژیا
کەسێك بـــاوەڕی نـــەبێ
ناشێ بــەختیاریی هـــەبێ

ئـــــەو ژینەی بێ بـاوەڕە
ســـــەراپا شین و شـــەڕە
خواپـــەرستیی و بڕوایـــە
مانـــــای ژینیان تێدایـــە

# شەهیدی داد و سەربەستیی

١٩٩٧ هەولێر

شەهید، شەهید، نووری دیدەم!
ئەستێرەی نێو شــەوی ستەم
گـــوڵی گـوڵزاری خواویستیی
شـــەهیدی داد و سەربـــەستیی

ئەی شەهید ئەی پەڕەی دڵمان!
تۆ بووی پیشمەرگەی مسوڵمان
تۆ بووی چقڵی چــــاوی زاڵمان
ئــەی گەرووی سەدای زوڵاڵمان

شـــــەهید، خۆشەویستی خودا!
ڕێبــواری ڕێـــبازی هــــــودا
مــــــەرگ لــە ڕووت دا، مردوویە
کاروانیشت، بــیٚ پشوویــــــــە

خوێنی شـــەهیدانی ڕێی هـــەق
تیشکی خۆرە و مژدەی شەفەق
مانگـــی چواردە و گــــەلاوێژە
بــۆ سنگــی بـــاتڵ دەستڕێژە

# چاکە

هەولێر/ ١٩٩٧

لەگـــەڵ یەك چاك بن، بەتایبەت هــەژاران
خۆشــەویستن لــەلای خــوا، چاکـــەکاران
بەهەق خۆش بەختە ئەو کەسەی خێرخوازە
مردن هەیـــە و بـــە ماڵ و بوون مـــەنازە !

خــوا خـــاوەنی ســـــەر و سامان و مڵکە
ماڵت بۆ خـــوا ببەخشە و لە خـوا سڵ کـە !
ئەگـــــەر بەخشیت سەر و ماڵت، ئەوا تۆش
دەخرێ یە نێو بەهـــەشت و ژینێکی خۆش

دینایـــــەکی کـــەم و کورتـــــە و خێراکەن
پیشبڕکێی چاکـــە و جوامێریی و تەقواکەن
هــەر چاکـــەیـــە، دوای مردن دێتە فریـا
لە پاش مـــەرگ، بێ سوودە خۆزگە و بریـا

فـــــەرمانی (وَأَحْسِنُوا)[1] جێ بـە جێ کەن

کاروانــــــی چاکـــەکاریتان دەڕێ کـــــەن

هەر چاکـە چاکـــــە و گوێ بگرن لە قورئان

(هَلْ جَــزَاءُ الإِحْسَـــانِ إِلاّ الإِحْسَـــــانُ)[2] !

---

[1] (....وَأَحْسِنُوا إِنّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ) البقرة — ١٩٥.

[2] الرحمن — ٦٠.

## برایەتیی

١٨ / ٩ / ١٩٩٧ هەولێر

با دەست لە ناودەست یەك كەین
دڵ و دەروونمان ڕێك خەین
براین! برای چاك بین تا هەین
بۆ برایەتیی هەوڵدەین

سینگمان فراوان بێ، لەگەڵ یەك
یەكتر نەكەین ماندوو و شەتەك
لێك تاونەدەینە دار و كوتەك
بۆ دوژمنمان بێ، هێز و چەك

لێبووردە و دەم بە پێكەنین
دوور لە بوغز و غەرەز و قین
هی خۆدانانی، شادیی و شین
لەگەڵ یەكتر بژین لە ژین

هەتاكو دەخرێینە ژێر گڵ
یەكترمان خۆش بووێ بە دڵ
چرا بین بۆ یەك، ئاوێنە و گوڵ
دڵمان بۆ یەكتر بێتە كوڵ

خــوا برایـــــەتیی بڕیـار داوین!

سەربەرزین، ئەگــەر جۆشدراوین

زەلیلین، گـــــــەر لێك دابڕاوین

دەبـا برای چـاك بین تا ماوین!!

# لێك پیرۆزبن بووك و زاوا

٢٨ / ٨ / ١٩٩٧ هەولێر

لێك پیرۆز بـــن بـــووك و زاوا
دڵتان شـــــاد و ماڵتان ئاوا
ژینتان پڕ خێر و بـەرەكـــەت
خۆشەویستیی و ڕێز و ڕەحمـەت

ژیـــانی ژن و مێردایـــــەتی
خێزان و هاوســـــەرایـــەتی
پڕ لـــە هـــەق و ماف و ئەركن
لای هـــــەردوولایان، پیاو و ژن

تاك، بناغـــەی خێزانە و خێزان
بناغـــەی كۆمـــەڵە، بـەڕێزان
ئەگـــەر خێزانـــەكان چاكن!
خـــاوەنی كۆمـــەڵگای پاكن!

فەرمانی وایـــــە خوای مەزن
كـچ شـــوو بكا و كـــوڕ بێنێ ژن
دەسا ئێوەش دایك و باوكـــان!
بەقسەی خواكەن جوان و ئاسان

# بانگەواز

١٨ / ٩ /١٩٩٧ هەولێر

بانگـــــەوازکــەن، بانگـــەواز، بانگەوازی دینی خوا!
بانگـــــەوازکـــەن تا خــەڵك، لە ڕێی ڕاستەوە بڕوا
بانگـــــەوازێك کەس نەڵێ: نازانم هـــەق کامە وکوا!؟
(وَمَـــنْ أَحْسَـــنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَــــا إِلَـــــــى اللَّه)[١]

بانگــــــەوازکەن، فەرمانی خوایە ئەی ئەهلی بــاوەڕ!
فەرمان کردن بە چاکە و (نەهی)ش لە خراپە و مونکەڕ
چاکە بەختیاری مرۆڤە، (مونکەڕ)یش ژین تاڵیی و شەڕ
هەر ئیسلامـــــە ڕێی شادیی و ئازادیی و ئارامیی و فەڕ

فەرمانــــــە ئیمانداران، هــەتـــاکــــو ماون لـــە ژین!
بێ وەستان بانگـــەواز کـــەن، بە تەواوی توانا و تین
سەرنج دەن خوا دەفەرموێ، بە(موحەممەدول ئەمین)!
(ومَـــــا عَلَـــــــــى الرَّسُـــــولِ إِلاَّ الْبَـــلاَغُ المـبين)[٢]

---

[١] وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ فصلت (٣٣)

[٢] (ومَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ المبين) العنكبوت – ١٨

ئەسڵ و بنچینەی کاری ئیسلامیی، بانگـــــــــەوازە
بانگــــــەوازکار پاداشتی یـــەکجار زۆرە و نـــــاوازە
کەواتــــــە: ئـــــــەی ڕێبواری ئەم شەقـام و ڕێبازە!
(ادْعُ إِلَـــــــــــى سَبِيلِ رَبِّكَ)[1] چـوســـــــت و ئـــازا

[1] (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ...) النحل – ١٢٥

# مزگەوت

٢٨ / ٩ /١٩٩٧ هەولێر

مزگـــەوت، ئەی ماڵی خوا، ماڵی هەموان!
ئەتۆ تاجی ئەوانــــــەی مل کەچی خوان
ئەتۆ چـــاوی ئەوانـــــەی خـــاوەن بڕوان
ئەتۆ بــــەرز و بـــەڕێزی و پیرۆز و جوان

مزگـــــەوت، خۆشم دەوێی، پایەت بڵند!
ئەی مەڵبەندی ئەخلاقی بەرز و پـەسەند!
گـــەر لە شاردای، یا لەنێو دێهات و گوند
سەرت بەرزە و بەرزی هەردەم وەکو دوند

مزگـــــەوت، کاتێ کـــە بانگت لێ دەدرێ!
بـــڕواداران دڵیان بـــۆ نوێـــــژ گڕدەگرێ
ئای لـــەو ساتـــەی جەماعەتت لێ دەکرێ!
خەڵك یەکسان، پێکــــەوە سوجدە دەبرێ!

کێ ببەستێ ڕێی مزگـــــــەوت، زۆردارە!
بـــــە ئاشکـــرا دژی پــــــەروەردگارە
نیشانــــەی بــــــەرزی ئیسلامە و دیارە
کە مزگـــــــەوت ئـــــــاوەدان و ڕزگارە

# ئیسلام بەرنامەی گشت سات و سەردەمە

١١ / ١٠ / ١٩٩٧ هەولێر

ئیسلام بەرنامـــەی گشت سات و سەردەمە
بەرنامـــــەی ژینە و ژین بێ ئەو، ئەستەمە
نوورە و بێ نوور، دنیا تـــاریك و تەمـــە
پەیمان بێ، تا هەم هـــەر ئیسلام ڕێگەمــە

ئیسلام نەبێ، کێ یــە بەختیارییم پێ دا! ؟
کوا مانای ژین غەیری ئیسلام لەکوێ دا! ؟
بێ شك کەسێك هـــەقــی نەچێ بەگوێ دا
کـــەڕ و لاڵـــە، کوێرە، ســـەری کای تێ دا

ئیسلام ڕاستە شەقامــــە و تەخت و ڕۆشن
بێجگە لەو، ڕێ، هـــەموو هـــەڵدێر و بۆشن
ڕێی ڕاست دەگرن، ئەوانەی خاوەن هۆشن
دەسا ڕێی هــــــەق بگرن و بۆی تێکۆشن!

ئیسلام مەشخـــەڵی شۆڕش و خەبـــاتە
شۆڕشی ڕیشـــەیی و کـــەشتیی نەجـــاتە
کەواتــــە: تۆ کـــە ئـــــازادیی هـــیواتە
ئازادیی دەڵێ: هـــــەر ئیسلام ڕێگـــاتە

# کوڕی شیرینم

جیهاد لوتکـــەی هەرە بەرزی، دینی ئیسلامـــــە ڕۆڵە
خۆشەویستم تۆش بیکـــەشان، چـەکـی جیهاد و تۆڵە
بنۆڕە چـۆن ئـۆردووی کـوفــر، لـــــە نیشتماندا مـۆڵە
جەستەی ئەم گەلـــە چەوساوە، تێکەڵی خوێن و خۆڵە

ڕۆڵەکـــــەم، جگـەرگۆشەکـەم، سەرنج بدە ژێر و ورد
بە هیوای خزمـــەتی ئیسلام، ئەمن تۆم پەروەردە کرد
جـــەرگی بابی خۆ، عـــەزیزم، ســـەردەمی دیلـی ڕابرد
لە ڕووی تاغووتان بوەستە، وەکو قــەندیل و هــەڵگورد

ڕۆڵە تۆم خۆش دەویٚ ئەمما، خۆشـــەویستر لە هەموان
خواو پێغەمبەر و ئیسلامە، لە گشت کات و هەموو ڕووان
تەنها ئەوانـــە شایانن، خۆیان بکـــەینـــە قوربـــــان
کوڕی شیرینم هەڵبگرە، پێکـــــەوە چـەك و قورئـــان

بینایی چاوی دایك و باب، برۆ جیهادیٚ خوات لەگـــەڵ
مەسرەوە ساتیٚ لـــە جیهاد، دژی زەندیق و دەغـــەڵ
بت و بتخانـــە بشـکێنە، (لات)و (عـوززا)و (هـوبـەل)[1]
ڕۆڵە هـــەق باقی یەو باتڵ، ڕووڕەشە و پوچ و گەندەڵ

---

[1] ئەو سیٚ بتە گەورەیە بوون کە بت پەرستەکانی مەککە لەو سەردەمەدا دەیانپەرستن.

# ڕەمەزان

١٩ / ١١/ ١٩٩٧ هەولێر

ڕەمـــەزان، ئەی مانگی خێر و پیت و پێز!
مانگی نازڵبوونی قورئـــــانی بــــەڕێز
بەخێربێی مانگی ڕۆژوو و تـــەقوا و ئیحسان
تۆ شۆڕشی لـــە دژی نـــەفس و شـــەیتان

ڕەمەزان تۆ، بارانـــــەی ڕەحمەتی خوای!
ڕەمەزان تۆ، داینــــەمۆی بیر و بـــڕوای!
ڕەمەزان، کەسێ ڕێز بگرێ لـــە بـــەرزیت!
بەڕێزە و لـــە ڕوویدا شـــەیتان دەلـەرزیت

لـــە تـۆدا ڕزق و ڕۆزی نـرخـــی دیــــارە
ڕۆزی دەریش، تـــەنیا پــــــەروەردگارە
دێنیتەوە یــــادی خــــەڵك، هـــــەژاران
هەژار دۆست بن، دەسا ئــــەی بڕواداران!

زانکـــۆی تـــەقوا و پاکی و سۆزە ڕەمەزان
کوا دەزانێ، نرخی زێڕ گـــەمژە و نـــەزان!
دەسا بۆبەرزیی و بەختیاریی و سەربەستیی
هــــــەموو ژینتان بکـــەن بە خواپەرستیی

# خێزان

١٦ / ١ / ١٩٩٨ هەولێر

بــە ئاســـانی و مــەردانـــــە و ژیر و لێزان
وەرن، وەرن، بــۆ پێکهێنانــــــی خێزان
کــوڕ، کچ، خــزمـن، یــــا دایك و بــابن
دەخیل پابـــەندی فەرمانـــی خودا بن!

کچ شەرەفـــە و ئەمانـــەتــە و ئەمانەش
چۆن دەسپێرێن بەدەستێکی پیس و ڕەش!
ئەمانــــــەتی خــۆ بسپێرن بـــە دەستیّ
پاکـــە و پەیمان لەگــەڵ خوادا دەبەستیّ

براکانمان، خوشکەکانمان، کێن و لە کوێن!
بۆوەی خـــونچـــەی هواکانتان بپشکـوێن
ڕێبازی شـــەرعی خوا بگرن، کـــەوا بوون!
بەختیار و ســـەرفرازن، ئـــاسۆتـــان ڕوون

پێکهێنانـــی خێزانـــــان کــاری خێرە
مـــەردە هەرکــەس، لـە کاری خێر دلێرە
توخوا قسەی چاك لە نێوان یـەکتری کەن!
نــەك بە فیتنە، خۆ تووشی ئــاگری کەن!

# پیری و لاوی

١٥ / ٣ / ١٩٩٨ هەولێر

پیری دەیبا تین و تاقـــەتـــــی ئینسان
پیری و هەزار عەیب و دەرد، پـەندێکە جوان
نیعمـــەتە دەورانـــی لاوی بـــە مـــەرجێ
بە خواناسین بیبەینە ســـــەر، لە هــەرجێ

گــەنجان، لاوان، سەیرکـــەن حاڵی پیران!
پیری پڕە لــــە دەرس و پــەند بــۆ ژیران
ئەمڕۆ لاوی، سبـــــــەی دێ پیر و بێ هێز
ئەمــــە عومـرە، دێ و دەڕوا، لێی بگرن ڕێز

تەمـــــەن تاقـــــە دەستمایەی ژینە، ئیدی
ڕێگــــا مـــــەدەن بـــــەفیڕۆ بــڕوا چیدی!
بۆ کوێ دەچین، پیری و مەرگمان لەڕێ یە!
ژیر کــەسێکە، توێشووی بۆ قیامەت پێ یە!

ئەو لاوانــــــەی عـــــەوداڵی خواپەرستین
ئەو لاوانــــەی بۆ خوایانـــە مەرگ و ژین!
لە ژێر سێبــەری ڕەحمی خوان لـە مەحشەر
خوایـە، لاوێك بین شوێن کەوتووی پێغەمبەر!

## جگەرە

١٧ / ٣ / ١٩٩٨ هەولێر

(طَيِّبْ) حەڵاڵ بە ئایــەت، حەرامیش چی (خَبيِث)[١]ە
ئاشکراو دیارە جگەرەش، چەندە زیان بەخش و پیسە
کەواتە: ئــەی جگەرەکێش، فڕێی دە، پاکەت و کیسە
هــــەر کۆخە و نیخە نیختە، نەخۆشی و ڕەنگت سیسە

ئیسراف و زیادە ڕۆیی و ماڵ بــەزایەدان هــــــەردەم
ئیسلام نەهی لێ کردووە، ئەگــەر زۆربێ و ئەگــەر کەم
جگەرە هــــاوڕێی خەراپــە، جــەردە و دزە بۆ باخەڵ
پارەی خۆ مەسووتێنن، مەیکەن بەسووتوو و دووکەڵ!

حــەیف بۆ ئینسان کـــەوا، عــەقڵ و هۆشی لە سەردا
بێ هوودە و بێ گوێ پێدان، گـــڕ لە ماڵی خۆی بــەردا
ئەی جگەرەکێش سەرنج دە و کەمێك لە خۆت بنۆڕە!
بووی بــــە دوژمنی نەفس و سامانی خۆت، لەو گۆڕە!

[١] (وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ) الاعراف – ١٥٧

بێجگــە لەوەی حاڵی خۆت، دەشێوێ بـــەم ئەتوارە
ڕاسـتیت دەوێ خێزان و خــــەڵكیشـت لــێ بێزارە ! !
تۆ گیرۆدەی بـە جگەرەی پیس و بێ سوود و كـەڵك !
بە خلتە و دووكـــــەڵی تۆ، بۆ هــەراسان بێ خەڵك ! ؟

# بەهار

٢١ / ٣ / ١٩٩٨ هەولێر

بەهار، بەهار!
نوێ بوونەوەی دار و درەخت
خاك و زەوی و گوڵ و گوڵزار
کاتـــێ ســــەرنجت دەدەین
دەبـــێ تێکڕا هـــاوارکــەین
(سُبحان الله) لە گەورەیی پەروەردگار!!

........

تەماشاکــەن زەوی بـــــەجارێ خەملیوە!
ئەگەر چیایە، ئەگەر دەشت و دۆڵ و شیوە
دەڵێی مرواریی و گـــەوهــــەر و زێڕ و زیوە
لە خوا جوانــە نەخشاندنی نەخش و نیگار!

تۆ ئەی بـــــــەهار، بەبێ گومان و ڕاڕایی!
نیشانـــــەی زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی
وەڵامێکی دەمکوتکـــــــــەری، بێ بڕوایی
نەفامە هەرکەس ئەم ڕاستییە، بکا ئینکار

وەرن وەرن! بــــا بڕۆین بۆ دەر و دەشت
بۆ سەرنج دان و ڕامان و سـەیران و گەشت
ئەم دیمەنە ڕەنگینانـــەی وێنەی بەهەشت
بانگمان دەکەن، تا بێدار بینەوە، بێدار!!

# تەندروستی

٢٧ / ٣ / ١٩٩٨ هەولێر

لەش ساغی و تــەندروستی تاجی ســـەرن
نیعمەتێکی گــران بەهان و گـــــەوهەرن
بێ شك پارێز لە چـــارەســـــەر چاکترە
ڕەحمـــەت لەوەش، نەخۆشە و ئارامگرە

دەخیل هـــەتا، لەشت ساغ و چالاکـــە!
زۆر مـــەردانـــە عیبادەتـــی خوداکـــە
سەلامـــەتی و ئـــارامیی عـــەقڵ و دەماغ
تا کاتێکــە، لەشت سەلامـەتـــە و ساغ!

شوێن کەوتنی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرمان
بۆ گشت دەردێك شیفایـە و چارەسەرمان
شیفا نی یە هـــەرگیز لـە شتی حەرام دا
هـــەرچی خێر و چاکـــەیە لـە ئیسلام دا

نـــەخـــۆش دەبـــێ، خۆنیشانی دکتۆردا
تا نەناڵێ لـــە ئـــازار و نـــــاسۆردا
تۆ شوێنی دەوا کـــەوە و ئەوسا شیفات
لەسەر خوایــــــە و دەبێ ئاوابێ بڕوات!

# سروودی موجاهیدان

١٢ / ٧ / ١٩٩٨ هەولێر

موجاهیدین، جیهاد دەکەین، لە ڕێی خوادا
لە ژێر ئـــالآی پێغــــــەمبەری پێشەوادا
بە ماڵ و گیان
بە مەرگ و ژیان
هەتا ماوین لە دنیادا

جەنگاوەرین، دلاوەرین، هـــەڵمـــەت بەرین
تیکۆشاوین، تێ دەکۆشین، تێکۆشـــەرین
هەتا مردن
بێ سڵ کردن
پێشمەرگەی خوا و پێغەمبەرن

شۆڕشگێڕین، مەشخەڵ بە دەستی شۆڕشین
پێشمەرگەی ڕێی جیهاد و هەوڵ و کۆششین
بە زمان و دەست
بە هۆش و هەست
بۆ بەرزی دین، دەمرین، دەژین

جیهاد دەکەین، لەپێناوی خوا و چەوساوان

بۆ نــەمانی زوڵم و زۆر و فیتنه و تـــــاوان

نه زۆرداریی

نه بێگاریی

ئەمری خوایه و لەسەر چاوان

پەیمانێکه و هـەڵگری پەیـــــامی خواین

بۆ ئــــازادیی، بۆ دادگـــەریی، له ڕێ دایین

بەختیارییمان

ڕزگارییمان

بڕوایه و  خاوەن بڕواین

# ئەی خەڵکینە

هەولێر ١٩٩٨/٧/٢٠

ئەی خەڵکینە، گرۆی بەشەر!
بە چاوی دڵ، بە چاوی سەر
وردببنەوە لــــە بوونەوەر
سەرنج بدەن لە گـــەورەیی
خوای خالق و بـــەدیهێنەر

ئـــەی خەڵکینە تێڕامێنن!
ژیربن، دانـــایـــی بنوێنن
دڵ و عـــەقڵتان بـدوێنن
کتێبی بوونـــەوەر و قورئان
موتاڵاکـــەن و وەخوێنن

غافڵ مەبن لـــەم ڕاستی یە
لێ غافڵ بوونـی، پــەستی یە
جەهل و بێهۆشی و هەستی یە
بزانن کە ئـــەرکـی ئینسان
خواناسیی و خواپـەرستی یە

ئای لەم هەموو دروستکراوانە !

لەم دەشت و دەریا و کێوانە

لــەم خۆر و مانگ و ئاسمانە

(ماشــاء الله)و (سُــبحان الله)

وەی کــە گومڕایی تاوانە ! !

# کەوێ ڕاوێ

١٩٨٥ / تووەسوران

ڕاوکـــەر کـەو دەگرێ بـــە داوێ
لەبـــەرئـــــــەوەی ناکا ڕاوێ!

هەر زوو سەری دەبڕێ و دەیخوات
کـــــــەوی بێ ڕاو ئـاوا دەڕوات!

کـــەوێك، کـە ڕاوکـــەر دەیەوێ
دەبـــێ بخوێنێ و نـــــــەسرەوێ

دەبێ بــە ئـــــارەزووی ڕاوکەر
بانگ کا (کـــەو)ان بۆلای سەنگەر

کامـــــــەی بـــاوك و بـرا و پشتێ
دەبـــێ بانگیان کـا، بـۆ کوشتێ!

کـــە براکانی بـــــەکوشت نـــەدا
ڕاوکـــــــەر زوو لـــە سـەری دەدا!

دەك ڕووت ڕەش بێ، كەوێ ڕاوێ
چۆن برای خۆت دەخەیتە داوێ!؟

كـــــەی ئەمـــە كاری پیاوانە!؟
تیاح لەو جەریمــــە و تــــاوانە!؟

وەختە پیاو لـــە حـــەیفت بمـــرێ
دەك خـــوا غـــــەزەبت لێ بگـرێ

خیانـــــەت و نۆكـــــەری تاكەی؟
بمـــری باشترە، نـــەك واكەی!!

# خوداو بەرنامەداڕێژی

١٩٨٧

(هەربوو وێك) لە نەبوون بوونی هێنا بوون
دارشتنی نـــــەبووان، بۆوی سێنا بوون

هــەر بووە، ئــەو (هــەربووە) نابێ نەبێ
نی یە نــەمـانــی و ڕۆژێك دابـێ نــەبێ

داهێنـــــەری بـووانـی دیـــــار و نهێنـی
تۆزێ لـــــە بـوونـێ، زانـــا دەهـــەژێنی

(هەربوو وێك) تێكـڕای بوونـــەوەری خۆی
کـــــە ورد و درشـت دایناوە یاســـا بۆی

بۆ ئێمەش، ئێمەی سەرتۆپی هەموو بووان
ئێمەی ژیر، جێدار و جوان لە هەموو ڕووان

بەرنامـــــەی دانـــاوە بەلاّم بەرنـــــامە!
دانا، شت دانێ، دانانـــــــــە، نە (دامـە)!

هەر لەو دەوەشێتەوە یاسـا و دەسـتوور
سـۆزی بـێ سـنووره و پـڕ میهر و مشـوور

بێ شـەرمی دەكا نـەفـام و نـەزانێ
قیت بێتەوە بێـت ڕێچكـەیـەكی دانـێ

یاسایـەك كه خودا بۆمـەی هێناوه
بی وێنەیه، پوخت و پـاك و تـەواوه

بێ كـەم و كورتی یـەو چ كـەلێنی نین
تێر و تەسـەلـە و بەرنامـە یـە بۆ ژین

كۆن نابـێ، نا! لـە خواوەیـە، ئیدی!
لاڕێ مەبـە لاڕێ، لاڕێ مـەڕۆ چیدی!

لەو ڕێ یە دەڕێ بـە، كـە خاوەنی خۆت
بەوپـەڕی سۆزی، ڕەنگی ڕشتووه بۆت

بێ نیازه لـە كاری سوالێ لـە جێ یان
ڕێگایـەكـە شـاڕێی هـەر هەموو ڕێ یان

داڕێژەری شتانـە بـەوپـەڕی بـاشی
شتێك نی یـە عاسێ و دووچاری چەواشی

ڕێ یەك لە هەموو بارانەوە، باری
دیلی و زەلیلی و دەردەسەری و زاریی

تاریکی و تەم و دڵەڕاوکێ و تاڵیی
لەسەر ڕێی ئادەمیزاد ڕادەماڵی

ڕێبازێکە، شادیی و خۆشی لە ڕێ یە
شیفا و چارەسەری دەردانی پێ یە

مەڵبەندی ژیانە و ئاسۆی ئازادیی
دەپەڕێنێ دەست و ملی بێ دادیی

ڕزگاریی دەری، ژێردەست و نەداران
تاقانە پەنای بێ ماف و هەژاران

بورکانی بەگڕ و هێزی بێ ئەمان
تێکدەری تەختی زۆردارانی زەمان

سەدەها خوێنخۆر و گەندەڵ و گەلحۆی
هارپیوون لە ئاشی ستەمهاڕی خۆی

پیلانی هــەموو فیرعــەون و تـاغووتان
بـە تین و گـڕی مەشخـەڵی ئـەو سووتان

سەلماندوویـەتی ئـەم دینە بـــە دنیا
چـــەسپاو و بــــەرزە ئەو ڕاستە بە تەنیا

ئـــــەوەی لەم ڕێگایــــە لاڕێ بێ و لامل
گێـژە، خەڵـــــەتاوە، ڕۆچـووە تــــا مل

ئـــەو کەســـە سەربـەرزە و ئازاد و دانا
ســــەر و ماڵـــی لـــە پێناوی خوا دانا

نەیـــەویست نزمـــی و تف لە سەری نەوی
بوو بـــە خـوداناس و ســـەربازی ئەوی

مـــــەردانـە لـە مـەیدانێ دەڵێ پڕ دەم
(اللە)یـــە خودام، پێشمـــەرگـەمی تا هەم

# وەرزش

٢٤ / ٧ / ١٩٩٨ هەولێر

وەرزش وان و وەرزش دۆست!
سەرنج بدەن جوان و چاك
وەرزش بەگوێرەی شەرع و
نیاز و مەبەستێكی پاك
دەبێتە خواپەرستیی
وەرزش بۆ تەندروستی
وەرزش بۆ خۆشەویستیی
وەرزش بۆ یەكترناسین
وەرزش بۆ بەختیاریی ژین
بەر لە هێز
هەبوونی ڕێز [1]

[1] برگەی ( بەر لە هێز هەبوونی ڕێز) هی من نی یە و لە شەهید (كۆساری)م بیستووە، جا ئەویش هی خۆیەتی یانا، نازانم و لە دەست نووس و كاسێتەكانی دا نییە.

# بۆ شەهیدان

١٩٨٨ / ٨/ ٢٢

کوێستانی مەندەمەران ( قەندیل)

پێشکەشە بە گیانی پاکی شەهیدانی ئیسلام بە گشتی و بە تایبەتی (مامۆستا عەبدوڕڕەحمان لۆتەری و کاك ئەحمەد شاسوار سکتانی و کاك عومەر بۆسکێنی و کاك تاهیر مەمەنداوەیی) کە لە ڕۆژی ٢٢ / ٧ / ١٩٨٨ ، لە گردی (ڕەمکان)ی ناوچەی قەڵاتووکان، لە تێکهەڵچوونێکی کەم وێنەدا، بە دەستی بەعسی یە عەفلەقی یە دڕندە و کافرەکان بەو مەقامە بەرز و بڵندە گەیشتن، خوا بەپلە بەرزەکانی بەهەشتیان شاد بکات.

بە یاد و سۆزی شەهیدی ئەم ئیسلامە، دەسا خامە!
بنووسە دەی بە قوربانە و مەفەرموو جا لەسەر کامە
بە یادی ئەو شەهیدانە، بجۆشێ دڵی پڕ باوەڕ
بە هەق شەهادەت ئاواتی گشت دڵسۆزێکی ئیسلامە
شەهیدان، شەهید بوونی (وە) بە ئاشکرا ئیسپاتی کرد!
کە گیان فیدا و لەخۆبووردوون، هەڵگرانی ئەم پەیامە
ئاوی درەختی باوەڕە، خوێنی ئاڵ و گەشی ئێوە
کە بە بێ هەبوونی باوەڕ، ژیان گەندەڵ و بێ تامە
دەك پیرۆزتان بێ شەهیدان، پلەی شەهیدی، خۆ شەهیدی!
پیرۆزترین دیاریی خودا و بەرزترینی مەقامە
ئۆخەی کاروانی شەهیدان لێرەش لەڕێی خوا کەوتە ڕێ!

دڵنیابن ئـــەی شـــەهیدان، کاروانـــی ڕێ بـــەردەوامـــــە

ڕێبوارانـــی ڕێگای جیهاد، زۆرن وەك ئێوە ڕق ئـــەستوور

کە جێی شانازیی ئیسلام بوون، مـــەردی وەك ئێوە کارامە

بەڵام بۆ هـــــەرکەس کــە ڕێگای ئەم کاروانـە دەگرێتەبەر

پێویستە لەبەرچـــــاو بگـــرێ، بڕوا و سەبـــر و ئیستیقامـە

خـۆ مسوڵمانـــی شـۆڕشـگێڕ (**إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ**)[1]ی دەوێ

چلۆن لە مردن دەترسێ، مادام کـــــە مردن ئاکـــــــــامە !

شوکر و سوپاسی خوای دەوێ، میللـــەتی مسوڵمانی کورد

کە هـــەڵـی گرت چـەکی ئیسلام، بێ ترس لەم ترس و سامە

مامـۆستا و لاوی شۆڕشـگێڕ، پێشمـــەرگەی ئیسلامن ئێستا

ئۆخەی ئیسلام ئەمڕۆ خاوەن، پێشمەرگەی بەدەست و قامە !

هۆ شـــەهیدانی خۆشـــەویست ! خۆ ئێوە زیندوون نامرن !

خوا دەفەرموێ: (*بَلْ أَحْيَاءٌ*)[2]، ئەمنیش شەهادەت هیوامە

خوایـــە، ئەگـــــــەر شایانی وەم، خوێنم بڕژێ لە پێناوت

شـــــەهادەتم بــــە نسیب کــە، پێم بەخشە ئـەم بڕوانامە

---

[1] (**قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلَّا إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ**) التوبة: ٥٢. واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئایا ئێوە جگە لە دوو شتە چاکەکان (سەرکەوتن، یان شەهیدی) چاوەڕێی چی دیکە دەکەن بۆمان.

[2] (وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا *بَلْ أَحْيَاءٌ* عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ال عمران – (١٦٩) واتە: هەرگیز وانەزانن ئەوانەی لەپێناو خـوادا کـوژراون، مـردوون، نـەخێر ئـەوان زیندوون و لای پەروەردگاریان ڕۆزیان پێ دەدرێ.

# کێ ڕێبواری ڕێی باوەڕە

٦ / ٣ / ١٩٨٧ تووەسوران

کێ ڕێبواری ڕێی بـــــاوەڕە
کێ دڵسۆز و بەڕاپـــــــەڕە

کێ خواپەرستــە و هیچی دی
کێ عەوداڵـــــە بۆ شەهیدی

کێ خواویستە و خـوادەناسێ!
با هەڵمـــەت بەرێ و نەتاسێ

ڕاست بێتەوە لـــــە بەرانبەر
هێزی خوێنخۆری داگیرکـــەر

بــــە بـــــاوەڕ و ئیمانەوە
بێتە کۆڕی مـــەیدانـــــەوە

ڕاپەڕێ و بێتە ســــەرچۆکان
سەنگەر بگرێ، بێ پەشۆکان

هـــــەنگاو هەڵێنێ بەرەوپێش
گوێ نەدا بە ئـــــازار و ئێش

بـــازوو هەڵماڵێ گورج و گۆڵ
توێشووی ڕێ، بهاوێتە کـۆڵ

شێرانــە لەنێو ســەنگـــەرێ
زەندەقی دوژمنان بــــــەرێ

وەك بورکانێکی بــێ ئەمـــان
گڕ فڕێ دا، هـــەموو دەمـــان

شالاوی شێرانـــــەی ئــــەوی
دوژمن تخێل کا، لــــــە زەوی

هـەرکەس بگرێ ڕێی بانگەواز
دابیێتێ وەکو هـــەڵۆ و بـــاز

چەخماخەی شەوی دەیجوربێ
پشتی بــە (اللە) ئەستوور بێ

گیانی لەسەر لەپێ دەست بێ
ڕەزامەندی خوای مەبەست بێ

# راپەڕن[1]

٢ / ٥ / ١٩٨٧ تووەسوران

راپەڕن دەی راپەڕن، بێ پسانەوە
بە وریایی و دڵی پڕ ئیمانەوە

کۆمەکی یەکتر بکەن تاکو زووە
راپەڕن، کاتی پەلامار هاتووە

مسوڵمانان، دەڕابن، رامەوەستن!
هەمووتان یەک تەکان شێرانە هەستن

هێزێکی ئیسلامیی رێك خەن پوخت و پاك
هێزێکی قورئانیی بێ، چالاك و چاك

هێزێك بێ، خاوەن دەمار، خاوەن مەچەك
دەست بەقورئان، دەست بەسوننەت، دەست بەچەك

[1] ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن تیپی سروودی باوەڕەوەو بەدەنگی (عەبدولواحید باپیر)و کۆرسی پێشمەرگە، گوتراوە.

بە هاواری بەرزی (الله اکبر)
وەلەرزەخەن، گۆڕەپانی جەنگ و شەڕ

بەردەوام کورەی خەباتی باوەڕیی
جۆش بدەن، تا کڵپەدا تین و گڕی

سەنگەران بگرن لە زۆرداران هەموو
قەت مەدەن مۆڵەت بە زۆرداران بەموو

لەشکری خوێنخۆری تاغووتی بەزیو
زەندەقی چێ، لە پێشمەرگەی ڕاپەڕیو

بەردەوام بن لە جیهادی خودایی
تا دێتەبەر، داری داد و تەبایی

تا گەلانی مل لەژێر نیردا نەوی
ڕزگاریان بێ، لە سەرتاسەری زەوی

تا هەژار و ژێر چەپۆك و بێ بەشان
ڕزگاریان بێ، لە ژێر نیری دڵ ڕەشان

تا ئاوارە و نەداران و کەساسان
نەکەونە ژێر چەپۆکی خوانەناسان

تا هەموو کەس لە هەر ڕەنگ و زمانێ
بوونی ماف و نرخی بوونی بزانێ

هەتا لە ژێر سێبەری دینی خوادا
بژی ئینسان، لە ئازادیی و لە دادا

# إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلامُ[1]

١١ / ٤ / ١٩٨٧ تووەسوران

﴿جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ بِسَاطًا﴾[2] بـەلام ئـــەمـڕۆ زەمین لێژە
﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا﴾[3] کـــــەچی ئـــــەمـڕۆ لوغم ڕێژە !
﴿ ان هذا الْقُرْآنَ يَهـــــــــــــــــدِي لِلَّتــي هِــيَ أَقْوَمُ﴾[4]
کەچی ســــەیرە، دەڵێن: قورئان وتـەی شاعیر و بوویژە !
﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِــــي أَحْســـــــــــــنِ تَقْوِيمٍ﴾[5]
بـەلام ئـــەمڕۆ لە سای کـوفـرا، ئـادەمیزاد گومـڕا و گێژە
﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّــــمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِــيعاً﴾[6]
کەچی موسەخخەری ئینسان، بۆ ئـــەو شتانەی لەمێژە !
﴿وَلَا تَقْتُلـــــــــــوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْـــحَقِّ﴾[7]

---

[1] ال عمران – ١٩

[2] نوح – ١٩

[3] الملك – ١٥

[4] الاسراء –٩

[5] التين – ٤

[6] الجاثية – ١٣

[7] الاسراء – ٣٣

کەچی ئەمڕۆ لاشـــەی پاکان، خـوانی خۆراك و کاوێژە !

﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبـــــــــــــــــاً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾[1]

کەچی ئەمڕۆ شـــەڕی گـەلان، گوڵی کۆنفرانس و ڕاوێژە !

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَ،،نَعَ مَسَاجـــــــــــــــــدَ اللَّهِ﴾[2]

کەچی ئـــەمڕۆ وا دەزانرێ: (زاڵم) بـــە تەنها خوێن ڕێژە !

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا﴾[3] ئـــــەی ئـــــادەمیـــزاد !

کەچی ئەمڕۆ سك و باخەڵ، ڕووبـــەریان قوڵ و بەردرێژە !

﴿أَلَا بِذِكْـــــــــــــرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلـــــــوبُ﴾[4]

کەچی دڵنیایی تاغووتان، لای بنکـــەی بۆمبا هـــــاوێژە !

﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾[5] کـــەچی ئـەمڕۆ پێش برکـــێ یە

لە زانیاریی تەقـەمـــــەنی، کە کـوشتاری لەجێی نـوێژە !

ئـــــــــــادەمیـــــــزاد ! ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلَامُ﴾ !

کـــەوابوو ئیسلام ڕێگاتـــە، کـە پـڕ سەرکـەوتن و چێژە

ئـــەو ئیسلامـــــەی کـــە ڕاسترین بەرنامـــــەیە لە دنیادا

پـڕشنگـی زێڕینی ئیســلام، خۆرە، مانگـــە، گــەلاوێژە

---

[1] الحجرات — ١٣

[2] البقرة — ١١٤

[3] الاعراف — ٣١

[4] الرعد — ٢٨

[5] طه — ١١٤

ئیسلام پڕە لە سەربەستیی و پڕاوپڕ دڵنیابوونە
دەزووکە نەمامی باوەڕ، لە خاکی دڵتا بنێژە!
ئاشکرایە ژیان بەبێ بیروباوەڕی ئیسلامیی
سیل و سەرەتانی سەختە، کێماوی یە وەك سورێژە
بۆیە دەڵێم: ئادەمیزاد ئامێز بکە بە قورئانا
چی باوەڕی کوفر هەیە، لە زبڵدان هەڵی ڕێژە

# خەڵکینە دەزانن!

٨ / ١ / ١٩٨٩ سەردەشت

خەڵکینە دەزانن کـە بــاوەڕ بەچی دێ! ؟
باوەڕ بوون بە خوا، تەنها بەمل کەچی دێ
خۆ کردەوە سەنـگی مەحــەکی ئیمانـــــە
پێو وایە ئیماندارە، چاکــە، هــەچی دێ!
ئامادەبــە زانـــــا، مردن لــــە کەمینە !
چاکی، خــەراپی، تۆ بچی، یا نــەچی دێ
تاوان مەکـە تا مـــــاوی تەمـــەن تاوێکە
وریابـــە دەزانی لە دوای ئەوە چی دێ! ؟
ئـامــادەیـــە دۆزەخ، دۆزەخـی سـوتێنەر
ئـەو تینەی لەوی دێ، ئەو تینە لەچی دێ!
ئەمڕۆ، کـــە دەژی ئــەی ئادەمیزاد لێرە !
بڕوانـــە لەم ژینە ئاخۆ چ بـــەدی دێ! ؟
جێی تاقیکرانەوەیـــە، کێڵگەیــــــە دنیا
بـۆ ڕۆژێك کـــە ژیانێکی ئەبـــــــەدی دێ

# بێ باوەڕی

٢٥ / ١١ / ١٩٨٧ قەڵاتووکان

بێ بـــاوەڕی لە دڵ دا، وەرزێکی ســەخـت و تووشە
زستانێکــە، پڕ زوقم و زریـــــان و بـــــا و پڕووشە
خەرمانێکــە سەرلەبەر، سەرکوێزر و گورگێ و پووشە
چاوێکــــــە، ئــاخنراوە لـــە زیخ و وردە شووشە
زەلکاوێکــــە بۆگـــەنیو، سەرانگوێلکـــە و زبڵدان
ڕووخسارێکـی درێـوە، تـرش و تـــــاڵ و چەمووشە

سەراپـــــای بێ بـــاوەڕی، ژینێکــــە جانەوەریی
کەس ئۆخـــەی نایێتە دەم، لەژێر سایــە و سێبەری
چونکــــە ڕەوشت و بـاوەڕ، ئاسوودەیی و دادگەری
بە ڕەشەبای فەســـادیی، مۆخیان دەڕزێ و دەوەری
مێـــژوو شـــاهێدە ژینی، بێ بـــــاوەڕی چلۆنە !
چـــــەوت و چـــەوێڵ و ژان و ئـازارە، سەرلەبەری

هـــەرکاتێك بێ بـــاوەڕی، پەرەی سەند و هاتەگۆڕ
ئـەوا ژیـــان ســـەراپا، لێی دالێ تـــەلبـەند و تـۆڕ
ســـەیـری زۆر لـەوەدایـــە، جیهانێکـی پـان و پـۆڕ!
لەژێـر پێی ئـــــادەمیزاد، دەبێتە هـــەڵدێـر و گـۆڕ
بـە ڕاستیی نرخی مرۆڤ ، لــــە ئیسلامدا بـــــە تەنها
دەنـــا لـــە کوێرەڕێ یان، ئاژەڵـە و گێژ و سەرشۆڕ

وازبێنە مـرۆڤی ژیـر، لـە بــــاوەڕی بــەد و پیس!
وریابـــە نەکەویـــە نێـو، تـۆڕ و تـەلبەندی ئیبلیس
شەیتان لێت نەکا بەخوا، نەفسی سەرکێش و نەگریس
بەهەڵە نەچی ئەی ژیر، ژیریی خۆت نەدەی لە کیس!
زووکــــە ژیرانـــە ئـــامێز، بــە بـەژنی بـاوەڕ داکە
چونکە بەباوەڕ زیندوون، دڵ، دەروون، هەناوی سیس

بابای لە خـوا بێ خەبـەر، خوانـەناس و لە خوا دوور!
تۆ لـە گێـژی نــەزانین، ڕۆچوویتە خـوار، بـێ سـنوور
تۆ هـۆش و لێکدانـــەوەت، شێواوە و خانـــەخاپوور
سپیت لێ بووە بـــەڕەش، زەردت لێ بووە بـــە سوور
سەر هـــەڵبڕە ئەی گومڕا، ژیر بـــەو لێکدانەوەت بێ!
تەماشای بوونەوەرکـــە، سەرەوژێـر و ســــەرەوژوور

له بـوونـــەوەر وردبـــەوە، بـــەرز و بڵند و نـــەوی
تەماشـــــاکـــــە و ببینە، ئاسمان و ڕۆژ و زەوی
وا بــە تیشکی زانیاریـی، تـــەمـی نـــەزانین ڕەوی
کەچی تۆ هـــەر خەریکی، ئەفسانە و داڵغە و خەوی
ئـــەی گومڕا و سەرلێ شێواو، بۆلای قورئـــان بادەوە!
ئەگـــەر ئـــادەمیزادی و ئارەزووتە سەرکـــەوی!!

# لەبەر کەمرەی گوناهو زۆری تاوان

١١ / ١ / ١٩٩٠ خانێ

لەبــــەر کەمـرەی گـوناهـو زۆری تاوان
دلۆپێك ئــاو نی یە و نایێ، لــە چــاوان
دلّم وەك بــەردی ڕەق، سینەم سـەراپا
بۆگەنــــە و پیس، بــــەوێنەی گۆلەئاوان
ورێنە و دنـــــە و خــــەیالاتـی خــــالّی
دەروونیان داتـــــەپاندووم وەك کــەلاوان
بــــە تـــــاوانــی زمان و بیر و سینە
بــڕاوە ڕەونــــــەقی ڕووح و هــــــەناوان
ئەو پارچەگۆشتە گچکەی پێی دەلّێن دلّ
ڕەش و شینە وەکـو ئـــــــاوی زراوان
ڕەشی چی، وای بــە ئەندازێکی خەستە!
کــەمێکی ڕەش دەکا کۆلّێك پــــــەڕاوان
لــەژێـر بــــاری قورسی تــاوان و خەتا
چەمـــــاوە دلّ، بە وێنەی پشت چەماوان
ســــەلا لـەنــــەفس و دلّێکی ئــاوا پیس
کە بۆ شەیتان بوونــــە هێلانــــە و پــاوان

چ شەیتانێك هـــەر لە ڕۆژی (بـەرێ) وە!
بـــە داوا، دەوری داوە، دڵ بـــە داوان
خـواردوویە سوێند بـە زاتی خوا، کە لادا
لە ڕێگـــەی ڕاست، بە غەیری لێ بـڕاوان
دەسا خوایـــە پەنا و هـــاناما بۆ تۆ!
لە تاوان، کـــە تاوان، ئێمەیان تـــاوان
چەپاڵـــەندەی خودایـــە تۆ لە دۆزەخ!
کـــەوا دۆزەخ، نـەبێتە شوێن و مـــاوان

# میللەت کە خرۆشا

ڕانیە — ١٩٩١

میللـەت کـە خرۆشا و نـــاوی خودای هێنا
ڕاپسـکوت و ڕابـوو و کـاروانــی دەڕێ نـــا
هــــەر هێندە دەزانی، کـە روانیت دەبینی
ساتێکــــە، بەڵام نـــەك بێ ئەزیەت و سێنا
تــەخـت و دەســـــەڵاتـی زاڵـم و زۆرداریـی
مـاڵیوە بــە جـــاریێ و گشتی دەژێر پێ نـا
کـەللەی ســـەری هـــەر دیکتاتۆر و زوحاکی
هــارپیوە و تێکەڵــــە، دەگەڵ خۆڵ و خوێنا
نـــەك هــــەر ئەبووجەهل و هیتلەر و هۆلاکۆ
نـا ! بــەڵکو کێش دەستی گرتوون بە داوێنا
دەبینین هــــەر کـامێکیان بــە پـەلـەپرووزە
هـەڵدێ بـە ســەری شۆڕەوە و بـارگەی لێنا
بۆ ئـەم باســـەی کـە ڕابرد شـاهێدە مێژوو
ڕووی داوە گەلێك جـاران، لـە دەیان شوێنا
دیمان گـــەلــی کـوردی مسوڵمانی ئێمـەش
نەك هــەر لە ڕووی زۆریی، پاڵیتی دەگوێ نا
نا ! بەڵکو ڕاپەڕی و ڕاست بۆوە بەڵام چۆن !
شمشێری لە هـەنـــاوی بـەعسی گـڕوێ نـا

ڕۆی بوونە جەرگ و هەناوان و ڕایان هێشت
لاشەی بۆگــەنی بەعسیان لـەنێو دڕوێ نـا
هەر بەعسی بوو، کە لەبەر دەستی جەماوەر
سەرشۆڕو خەجاڵەت، ملی هێندەی موێ، نـا
بەعسی قڕانێك بوو، هـەر سەیر و عەجاییب!
لـە (ڕانیە)و (بـازیـان) وەك بـــەری دروێنــە
لـە (کەرکوك) و (هەولێر) و(سلێمانی)و(کۆ)
لـە(دهۆك) و (زاخۆ) جـا بێژم لـەکوێ نـا!
زۆربــــــەی زۆری ولآتـــــی کوردەواری
ئامێزی لـــە بـووکـی ئـــــازادیی وەرێنـا
مـەلی هیوای ڕزگاریی کـورد و کـوردســـتان
فڕی، تــا خۆی لــە هــــەوارێکی نوێ نــا
شــابـازی بـــەهێزی مـەتـــەرێزی شۆڕش
کوندەپەپووی شوومی، لـە ولآت وەدەرێ نـا
ئـەی خوایە، سوپاس و ستایشی زۆر بۆ تۆ!
کە بـەعسیت خستن و ئێمەت وەســـەرێ نـا
دەك خوایـــە لە تۆ بـەزیـادبێ ئـازادییمان!
ئـەم نیعمـەتـە بـاقی بێت و قـــــەدەرێ نـا

## پرسیار

١٩٩٣ رانیه

ئــــادەمیزاد، بیکـــــە حەکـــەم ویژدانت!
دەگـــــــەڵ تۆزێك ســــــەرنج و تێڕامانت

لە خۆت پرســـــە، ئـــەرێ کابرا ئەتۆ چی!؟
کێ تۆی هێنا، لە کوێ، بەرەوکوێ، بۆچی؟

من دڵنییام عــــەقڵ ڕێت نـــــــادا ئەلهەق
لێت ببێتە خـــــودا، مـــاددەی ڕەق و تەق

ئەگــــــەر بێ و دژ بـە عەقڵت ڕانەوەستی!
ئیمان دێنی و لــــــەوێڕا خواپــــــــەرستی

خوا نەکا گـــەر نکۆڵی لەو هەقـــەی کەی!
ناچار دەبم، بڵێم: تۆ کـــەی مرۆی، کەی!؟

# ئەی خوشکانی مسوڵمان

١٩٩٣ رانیە

ئەی خوشکانی مسوڵمانی خۆشـــەویست!
ئەی ئەوانـــــەی گەر نەفامیتان نەویست!

ئەی ئەوانەی چوونە نێو زانکۆی ڕەوشت!
ئەی ئەوانـــــەی ئابڕووی خۆتان نەڕشت!

ئەی ئەوانـــــەی بەرگی ڕێزتان کردەبەر!
ئێوە ئـــــازادن، بە ڕاستییش بەختەوەر

ئێوە جێی ڕێزی خـــودا و پێغـــــەمبەرن
ئێوە فێرگــــەی کۆمەڵن، هەق پەروەرن

ئێوە ڕێبــواری ڕێبازێـکـن، کــــــــەوا
هـــەر بە تەنها ئەو ڕەوایـــــە، ئەو ڕەوا!

تا لەسەر ئەم ڕێ یـە بن، ڕووسـوور دەبن
قەت نەکەن ئەم ڕێ یە بەردەن، تا هەبن

خوشکەکانم، بـــەرزە پایە و جێگەتان!
درك و داڵ و داوی زۆرە ڕێگـــــەتان

دەست بەکارین، کاتی کار و کۆششە
کـاری ئێوە، ڕاپـــەڕین و شـۆڕشە

شۆڕشێکە، خـــاوەنی توانـــا و بڕشت
پەیامێکـە، بـــاوەڕ و ڕاستیی و ڕەوشت

# مەشخەڵی رزگاریی

مانگی ٧ی ١٩٩٤/ سالارە

بـــــاوەڕ و دڵسۆزیی و لێبڕان و ڕاهێنان
مەشخـــەڵی ڕزگاریین، بنچینەی داهێنان

ڕێگە دەبڕین، هـەرچـەند، ڕێ درك و داڵە
چاومانن خامە و چـەك و سەنگـــەر و ئاڵا

هـــەڵگـری پەیـــامێكی ڕۆشـن و پاكین
قەڵغانــی بیر و بڕوا و میللـــەت و خاكین

بەڵێ بۆ ئـــازادیی، بۆ داد و سەربەستیی
حاشا لە چەوسانەوە و ژینی ژێر دەستیی

وریابە ئـــــــادەمیزاد، بگرە ئەم ڕێ یە!
تەنها بەرنامەی خودا، بەختیاریی پێ یە

# باخی بێ پەرژین

١٤/٨/١٩٩٥ رانیە

باخێکی بێ پەرژینم دی
دەیان ئاژەڵی لەنێو بوو
پەل و پۆ شکاو، گەڵا وەریو
بێ ڕێز و ناز و پەشێو بوو
سیس و نابووت و بێ بایەخ
هەتا تێی ڕامابای دزێو بوو
تەنیا باخێك جوانە و سەنگین
کە پەرژینی وەکو کێو بوو
کوا، کەی، لە کوێ، رانەمەڕێك!؟
بێ هەبوونی شوان، بەخێو بوو!!

# ئاشتیی

١٩٩٤/١٠/٤ رانیه

بەخێربێیەوە ئـــاشتیی، هـــەی گوڵی من!
ئـاسۆی بەختیاریی، هەی چاو و دڵی من!

ناتوانم کـــە نەتگرمـــە ئـــــامێزی خۆم
من سەوداســـەری ڕووخسار و سیمای تۆم

چۆن دەکرێ تۆی بــــەرز و بڵند و هێژا!
بتلێیەوە، هـــەڵسوڕێـی لـەنـــــاو گێژا

نـــا، نـــا، وەرە دۆستـی لــــەمێـژینـــەم!
من هـــەلگـری بـــەیداخـی ئـــەو دینـەم

تۆی خستۆتە سەرسـەر و دەست و چاوان
شـــەڕانگێزیی و ئاژاوەش، لای وی تـــاوان

کەسێکیش نەگرێ ڕێی ئاشتیی بە خۆشی
نـاشێ کـــــەوا چـــــاوانی لێ بپۆشی!

کوتەك سەرمـەزەب، دەبێ وابێ و ناچاری

بە کوتەك، شـــەڕفرۆش بهێنیتە ژێر باری

(ابـن الحجر)[1] بـــــــە (ابن الخنجر)[2]یَ وە

تەواوە، نەك بەقسەی ڕووت و لەجێ وە ! !

---

[1] ابـن الحجـر العـسقلانی، زانایـەکی فەرموودەناسـی شـافیعی مەزەبـە و سـاڵی ١٣٢٢ لـە قاهیرەی میصر لە دایك بووە و ١٤٤٩ش هەر لەوێ وەفـاتی کـردووە و خـاوەنی چـەندان بەرهەمی نایابە، وەکو: الاصابە فی تمیز الصحابە، بلوغ المرام فی ادلە الاحکام.

[2] مەبەست لـە (ابـن الخنجـر) هـەبوونی هێـز و دەسـت و قـام و درێـشەیە، چـونکە کـورد گوتەنی: مست لە درێشە دەکشێتەوە.

# دووڕوو

۱۹۹۵/۱۲/٤ رانیه

بۆ زیـــــانی مسوڵمانان، مرۆڤـــی دووڕوو و مونافیق
تـــــەواوێك خـراپترە، لـــــە کـافـــــر و لـــــە زەنـدیق

چونکـــــە مونافیق بـــە زمان، لای مسوڵمانان دەڵێ:
منیش ئیمانم هـــــەیـــــە، ئیمانم هـــــەیـــــە بەڵێ!

بـــــەڵام لە هەقیقـــــەت دا، دڵی خـــاڵیی لـە ئیمان
جێی (فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ)[1] ە ئەگەر نەبێ پەشـــیمان

مسوڵمانان پێویستە، زۆر وریـــــا بن لـــــەو پێرە!
ئاگاتان لەخـــۆ نـــــەبێ، کارتـــــان تـــــەواوێك گێرە

قـەهــر و غەزەبی خـودا، بـــۆ مونافیق لـــــەوپەڕدا
لەبەرئـــــەوەی مونافیق، گورگـە و لە پێستی مەڕدا

---

[1] ئامارەیە بە ئایەتی (إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ...) النساء-١٤٥، واتـە: بەراستی دووڕووەکان لە خواری خوارەوەی ئاگری دۆزەخدان.

# جەژنی قوربان

٢٦/٤/١٩٩٦ رانیە

خەڵکینە وەرن جەژنــــــە و بە خۆشی گەڕایەوە!
سەدای بــــەرزی (لَبَّيكَ)ە هــات و دەنگی دایەوە

(لَبَّيكَ)ە، یانی خوایـــــــە، لـــە خزمەتی تۆ داین
شوێن کەوتووی پێغەمبەری، سەرکردە و پێشەواین

(خەلیلوڵڵا) کوڕی خۆی، کردە قوربـــــانی بۆ خوا
دە خەڵکینە سەرنج دەن، ڕاستیی ئەوەیـــە بڕوا!

ئەی جەژنی بەرزی قوربان، بەخێربێ یەوە، بەخێر!
دەبێ مسوڵمان لـــە تۆ، خواویستیی فێر ببێ، فێر!

جەژنت پیرۆزبێ ئەی گــەل، ئەی میللەتی مسوڵمان
خودایە بیکە بەیەك، بەم جەژنـــــە دەنگ و دڵمان

# پەیامی قوربان

٢٦/٤/١٩٩٦ رانیە

جەژنی قوربـــان، هێمای خۆبەخت کردن
قوربـــــان، یانی: بۆ خودا مان و مردن

ئەوەی خۆی کردە قوربانیی خودای خۆی
سەری بـــەرزە و بەهەشت ڕازاوەیە بۆی

واهاتەوە جەژنی قوربـــــان سەرلەنوێ
ئـەی خەڵکینە، لەگـــەڵ ئێمەدا دەدوێ!

وەك (ئیبراهیم) و(ئیسماعیل) و (هاجـەر)
کە هەرکام مامۆستا و سەرمەشقە و ڕابـەر

دە ئێوەش ئـەی باوك و دایك و ڕۆڵەکان!
خوداویست بن، فیدای خوابن، هـەمووتان

عەزیزان، جەژنتان پیرۆزبێ هـــەردەم!
خوایە لادەی، لە سەر هەموان بەلا و خەم

خوایـە، هەموو ڕۆژێکمان هـــەر جەژن بێ
بـەرزی بۆمـــە و شکست بەشی دوژمن بێ

# پەیامی خوشکان

١٩٩٦/٥/١٢ رانیە

مسوڵمانم، خـــواپـــــەرست و خوداناس
تیغی بڕوام زۆر تیژترە لـــە ئـــەڵماس

ڕێگای نوور و هیدایـــــەتم ڕێگایــــــە
ڕێگا دەبڕم، تـــا گیانم دەبـــەردایــــە

ڕێگام ڕۆشن، پاکە بیرو هەست و هۆش
سستی نانوێنم لــــە کـــار و کردوکۆش

باوەڕم خۆرە، بـــۆ شـــــەوی نەفامیی
مایەی بـــەرزیمــــە حیجابی ئیسلامیی

سڵ ناکەم لە تانــــە و تەشـــەر و لۆمە
تەنها ئیسلام زانکـــۆی ڕێــــز و شکۆمە

## خوشکم باوەڕ شادیی دڵ و دەروونە

٨/١١/١٩٩٦ رانیە

خوشکم، باوەڕ شادیی دڵ و دەروونە !
دەسا زێر بـەو ئافرەتێك بـە، نموونە
ژینت هەموو سات بە سات بۆ خودا بێ
بە خواناسین، ئاسۆی ژین دیار و ڕوونە
وریابـــە ! ژیرانـــە ژینت بەســـەر بە
چاك بزانە، کـــە دنیا هـات و چوونە !
بەڵێ عاقڵ کەسێکـــە خواپـەرست بێ
بەبێ باوەڕ، چی یە ئەم ژین و بوونە ! ؟
بە ڕاستیی هەرکەسێ لەم ڕێ یـە لادا !
لــە دنیا و مەحشەرا پەســت و زەبوونە

# ساڵی تازەی کۆچی

١٩٦/٥/١٩ ڕانیە

یاخوا بەخێربێیەوە، ئـــەی ساڵی تازەی کۆچی!
دە یاڕەببی لە سایـــەت، تەختی تاغووتان ڕۆچی

نەمێنن شەڕ و گرانی، باروبـــــارگـــەی وەپێچن
شـــەڕانگێـز و دنیاخـۆر، تـەفروتونا بـن، تێچن

ساڵی کۆچی! هیجرەت و جیهاد و بـــەردەوامیی!
وەرچەرخانێکی گرنگی، ئەتۆی مێژووی ئیسلامیی

پێغـــەمبەر و یارانی، هیجرەتیان کرد، تەماشا!
هیجرەت(لَبَّيكَ الله)یەو لە کوفر و زوڵمیش حـاشا

بـە هیجرەت و جیهادێ، کاری ئیسلام تـــەواوە
(وَالَّذِينَ هَاجَـرُواْ) ، (وَجـَـاهَدُوا)[1]ی بـــەدواوە!

---

[1] إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُوا...) البقرة–٢١٨

# پەیامی من

١٩٩٧/٥/٢٣ هەولێر

پەیـــــامی من ، پەیـــــامی دادی گشتە
پەیـــــامی مژدە بەخشی شـــــادیی گشتە
ئەگـــــەر عـــەودالّی ئـــــازادیین، بفەرموون
پەیـــــامی خـــوا، نیدای ئـــــازادیی گشتە
نەکـــەن هەرگیز گومان بەن ئەم پەیامـــە !
بـــــە فیتی ناحـــــەزان دەڕوا لـــە خشتە
نەخێر، هەرکـەس دژی ئەم دینە هەڵسیّ! !
شکاوە، دین هەقە و هــەق خوای لە پشتە!

# عەزمی من

١٩٩٧/٧/١٦ هەولێر

لەنێو دنیایەك پــەرستراو، خــودایەك
لەنێو ملیۆنــــان ڕێگــــادا، ڕێگایەك
ئەگەر خەڵکی گشت خۆدانێن بەڕێبەر
لەلای من هەر یەکە و هەر پێشەوایەك
ئاشکرایـــــە بیروڕای جۆربەجۆر هەن
بەڵام هی من، بڕوایەکـــــە، بڕوایەك!
خودایـــە! عەزمی من ئاوایە، ئەمما!
گونەهبارم، دەســـا لوتف و نیگایەك

# قوربان و قوربانی دان

١٩٩٨هەولێر

عـــەزیزان! قوربانـــە، قوربان، وا دەڵێ: ئامادەبن!

بۆ قوربانی دان لەپێناو، زاتی خوای گـــەورە و مەزن

قەت درێغیتان نەبێ بۆخوا خەبـــــات و خوێن و ماڵ

چەشنی مەرد، مەردانــە بۆ مـــــەیدانی جیهاد دابەزن

بە ڕاستیی هەق ئەو پەیـــــام و بانگ و نیدایەی ئەوە

بێ جیهاد، لای خواو و عالەم، شەرمـــەزارین، بێ وەزن

ئەو کەسانــە بۆ هــەمیشە ســـەربڵندن، بەختەوەر!

خـاوەنـــی بـڕوا و جیهادن، ناسـرەوێن و نابـــەزن

تاغووتان هــەردەم لـــە دژمان فێڵ و پیلانیان هەیــە

گەر نەبێ شمشێرو چەك،كوا، جەرگ و دڵیان ناتەزن!؟

ئێوە ئالاهـــەڵگرانـــی هـــەق، ئەگــــەر هێزتان نەبێ!

بێگـومان بـۆ گورگـــەكان لەوگـــۆڕە نێچیر و پەزن!!

# ئادەمیزاد

١٩٩٨/١/١٩ هەولێر

ئـــادەمیزاد، لەم دنیا کەم و کورتـــەدا مەبـــە مەغروور!
باوەڕت بێ و نەژی ژینێ، لە تـەك شەیتان و لە خوا دوور
خوانەکا گــەر لـــە خـــوا دووربی، لە تاریکاییدا دەژی
چونکە خوا سەرچاوەی ژینەو بۆ ئاسمانان و زەویش نوور
هاکا مەرگ، باروبارگـــەی پێچایتەوە و دنیات جێ هێشت
دەسا جۆرێك بژی لێرە، لە مەحشەر سەربەرز و ڕووسوور
ئیمان و کــردەوەی چاکـــە، وەسیلـەی وەدەستهێنانی
ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی، نەبڕاوە و پڕ کەیف و سروور

# رەمەزان و پێشوازی

١٩٩٨/١/٢٤ هەولێر

کاتێ تـــەشریفت هێنا، ســـەلامت کرد و ئێمـــەش
بەوپـــــــەڕی تامـــەزرۆیی و دڵ و دەروونێکی گـەش
گوتمان(علیك السلام) میوانـــی بـــەرز و ئـــــازیز
تۆ خێر و خۆشـــەویستیی و خۆری دڵی تـەڵخ و ڕەش
دەك بەخێربێی، تۆش یاڕەب، لە خوانی ئەو ڕەحمەتە!
گونەهبارێکی وەك مـــە، مەنێ بـــەلاوە و بێ بەش
یاریدەرمان بە خوایـــــــە، بـــۆ ئەنجامدانـی ڕۆژوو
ڕۆژوویەك دوور بێ لە ڕیـــا، لـە گوناهـو تاوان و غەش
تـا ڕزگاربین لـــــە ژان و دەهشەت و ســـامی ڕۆژێ
پاك تێیدا ســـــەربڵندە و تاوانباریش سەر بـە هەش

# بۆ (مامۆستای نوورەدینی)[1]

قەڵادزێ ١٩٩٨/١/٣٠

نووری دین بوو، مامـــۆستای نوورەدینی
فیدای دین بوو، ســــەراپـــا ژیان و ژینی
ئومێد وایـــە مامۆستای خۆشـــەویستمان
حـــــەبیبی زاتــــــــــی(رَبُّ العالمَین)ی
چلۆن ناتخەینە سەرچـاوان هــەموو دەم!

---

[1] موحەممەد عەلی یەحیا، ناسراو بە (مامۆستا مەلا موحەممەدی نوورەدینی) ساڵی(١٩٢٠) لە گوندی(هورێوە)ی سەر بەقەڵادزێ لەدایك بووە، بەڵام بەهۆی مەلایەتی کردن لە گوندی(نوورەدین)ی پشدەر بەو ناوەوە ناسراوە و ناوبانگی دەرکردووە، مامۆستا لە تەمەنی هەشت ساڵیەوە دەستی بەخوێندن و وەدەستهێنانی زانستەکان کردووە و بۆ ئەو مەبەستە چەندان شوێن گەڕاوە، تا راگواستنی پشدەر لە قەڵادزێ لە وێ بووە و دوای ئەوەش لە کۆمەڵگای خەبات نیشتەجێ بووە، دوای راپەڕین هاتۆتە رانیە و کراوە بەسەرۆکی لیژنەی باڵای فەتوا، کە لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوو لەو سنوورە دروستکرابوو، سەرەنجام لە سەعات ٣ی شەوی ٢٨/٢٩/)ی رەمەزانی ١٤١٨ی ك –٢٨/١/٢٩ ١٩٩٨ن) بەهۆی نەخۆشیەوە لە هەولێر وەفاتی کرد و دوا وەسیەتی بۆ زانایان ئەوەبوو،کە: (خۆفرۆش مەبن)! (خۆفرۆش مەبن)! رۆژی دواتر ١/٢٩ لە مەراسیمێکی شکۆداردا لە قەڵادزێ بەخاك سپێردراو رۆژی١/٣٠یش بەیەکەم رۆژی پرسەکەی دانرا، شایانی باسە مامۆستای ناوبراو یەکێك بوو لە مامۆستا پایەبەرز و شارەزاکانی کوردستان بەگشتی و ناوچەی پشدەر و بیتوێن بە تایبەتی و کەسێکی چاکەخواز و خاکی و بێ فیز بوو، ساغ بوو لەگەڵ ئایین و گەل و نیشتیمانەکەیدا.

شایانی باسە ئەم شیعرەشم لەگەڵ شیعرێکی تردا بەناوی (هاتووم دەڵێم) هەر لە یەکەم رۆژی کۆڕی پرسەی مامۆستادا لە مزگەوتی گەورەی قەڵادزێ خوێندەوە.

میراتگـــری (ئەنبیا) و (مورسـەلین)ی
بــە ڕاستی وەرع و زانیارییت گــەلێك بوو
دەبێ کێ بێ، بەرزیی و پایەت نەبینی ؟!
خزمەتکاری شەریعـەت بووی شەو و ڕۆژ
(ئینشائـــەڵڵا) لــە (ئەعـلا عیللیین)ی
ئــاهـا چەندە بـەڕێزی، لێرە، لەولاش!
میوانی (خـوا) و (موحەممەدول ئەمین)ی
دەزانن هۆی چی یـە ئـەم ڕێز و پایە؟!
خـواپـــەرستییە و بیروبـڕوای ئایینیی
یەك ڕێ هەیە، بۆ بــەرزی و ســەربڵندی
ئەویش هەقە و پاپەندبوونـــە و ناسینیی
پەنا بەخـــوا ئــــەوی لـــەو ڕێ یە لادا
مسـۆگـــــەرە ڕیسـوایـــی و داڕزینیی
خودایـــە! ئەو زاتە بــەرزەی کە ئێستا
ئــامادەیین لــە کـــۆڕی ماتـەمینیی!
بیخەیتە ژێر ڕەهێڵـەی ڕەحمــەتی خۆت
ئەتۆش بەخشندە و سەرچاوەی بەخشیی
شیفاش دەی بەنووری قورئان گەلی کورد
تــــەوای دەرد و ناکـۆکـــی و برینیی
بە جۆرێکی بژی سەربـــەرز و ئـــازاد
ئـــاوەدان بـێ، نیشتیمانی ڕەنگینیی
شەکـاوەبێ، ئـــاڵای ئیسلام لەمـەولا
لەنێو دڵ و لەســەر خـــاك و زەمینیی

# فه تحی مه‌ککه

هه‌ولێر ۱۹۹۷

خۆشه‌ویستان! یادی (فه‌تحی مه‌ککه)یه
فه‌تحی مه‌ککه بایـــــه‌خی زۆری هه‌یـه
ئایـــه‌تـــی(انـا فتحنا)[۱] شـــــاهیده
کـــه فه‌تحێکی موبین و بێ پـــه‌رده‌یه
(نصـــــــرمـــــن الله وفتـح قريب)[۲]
بۆ هـــه‌میشه، بۆ ئه‌هلی هـــه‌ق موژده‌یه

[۱] (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا) الفتح – ۱

[۲] (...واخرى تحبونها نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قريب وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ) الصف – ۱۳

# هەق

بـــە دەست زوڵمی (ئەبوجەهل)انی خـوێنخۆر
سێزدەســـــالآن لە مەككـــــە ژان و ناسۆر

کەچی دوای هیجرەت و جیهادی هەشت ساڵ
(بیلال) فــــەرمووی لە کەعبە، بانگی زوڵاڵ

هـــــــەق بڵنـد و شکستیش بـــاتـڵ و بت
بە هەق، هەر هەق هەقە و غەیری ئەوی فت!

# هێز

١٣/٢/١٩٩٨ هەولێر

لە دنیا مەنتیقی هێز زاڵـــــە هـــــەردەم
خوانەکا بێ و منیش دەست لە هێز بەردەم!
ئـــــەوا حاڵم بــــە جۆرێکـــی دەشێوێ
دەبێ چەوســـاوەبم گشت سات و سەردەم
(أعدُّوا)[1] ئــــەمـری(الله)یـــــە مسوڵمان!
ناشێ هەتبێ لە دڵدا شك، لـە چـــــاو تەم!
چ بوونێکە، ئەگـــەر بـێ و هـــەر زەلیل بم!؟
ئەگەر نیم، نیم، ئەگەر هەم، دەرکـەوێ هەم!
دەبێ ســـەربـــەرز و ڕووسـوور بێ، ئیماندار
قبـوڵ نییە کۆیلـــەیی بۆئــــەو و ئـــەم
عیززەت بۆ(خــوا و ڕەســـول و موئمینین)ە[2]
پەنا بە خـــوا، لە قەهری، کە ژێر دەستەم!

---

[1] *(وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّة وَمِنْ رِبَاط الْخَيْل...)* الانفال – ٦٠

[2] ئاماژەیـە بـۆ ئایـەتی *(وَلِلّـهِ الْعِـزَّةُ وَلِرَسُـولِه وَلِلْمُـؤْمِنِينَ وَلَكِـنَّ الْمُنَـافِقِينَ لَـا يَعْلَمُـونَ)* *المنافقون – ٨*

# لاوی مسوڵمان

لاوی خوێن گـــەرمی مسوڵمان، دەخیلە !
زەلیلـــی تـورپیدە و مـــرد کـــێ زەلیلە
مسوڵمان شێری نـــاو بێشەی ژیـــانە
شەرمـەزاریـــــە لەبۆ شێر، ساتێ دیلە
ئەوەت ڕێی ڕاست و ڕوون و شۆڕشی نوور
ببە پێشـــەنگ، بۆ کاروانــی ئـەم جیلە
بزانـــە بۆ بـــــەرزی دنیا و دوارۆژت!
هـــــەر بڕوا و جیهاد، وەسیلـە و کلیلە

# جەژن تەشریفی هێنا

١٩٩٨/٤/٧ هەولێر

خــوا بــە لوتفی خۆی سۆز و میهرەبانیی دەڕێ نا
چاو و دڵت ڕوون میللــەت، جــەژن تەشریفی هێنا !
ئۆخــەی تۆش لە پێشوازیی وەستاوی دەستە و نەزەر
دەستەملانی یەکتر بوون، لە هــەموو جێگە و شوێنا
جەژن و جەژنــــە پیرۆزە و دیدار و چــاك و چۆنیی
ســـارد و ســڕی نێوانــی دڵانیان لـــەژێر پێ نا
خوایـــــە ! لە میهرەبانیت بەزیاد بێ، هەموو ساتێ
دڵ هێشان و عــاجــزی، نەمان بارگــــــەیان لێ نا
چ نیعمەتەو هەرکەسیش شوکری نیعمەتی خوای کرد !
ژیرە و بێگومان بــــــەڕەی، خۆی لە ئــاوێ دەرێنا

# جەژنە و بەخێری بێنن

٨/٤/١٩٩٨ هەولێر

عەزیزان، خۆشەویستان، پیران و گـەنج و لاوان!
جەژنەو بەخێری بێنن، سەر سەرو هەردوو چاوان
جەژنـەتان لێ پیرۆز بێ و لە خواش دەپاڕێینەوە
هەموومان سەرفراز و پاك کاتـــــەوە لە تاوان
زیارەتی (کەعبەتوڵڵا و حەج)مان بکا بە قسمەت
بێ شك بۆ وان ئاگرمان بەربۆتــە نێو هــەناوان

# هاتەوە جەژنی قوربان

٨/٤/١٩٩٨ هەولێر

هاتەوە جەژنی قوربـــان، جەژنی قوربان هاتەوە
بە مزگێنی و جەژنـــانە و پەیـــام و خەڵاتەوە
لایـــەك دەنگی(لَبَّیكَ)ەو، لایـــەك جەژنە پیرۆزە
لە هـەرلاوە گوێ بگری، ئـــەوا دەنگ دەداتەوە
سوپاس بۆ خـوا کـە لێرە، لـەم زێد و نیشتیمانە
خۆشحاڵیی و پیرۆزبـاییە، لـــە گشت لای وڵاتەوە
ئەمەش مژدەیە بۆمان، گـەلی کوردی مسوڵمان!
کـــە دروشمەکانی خوا، گـــەورەبن بە لاتەوە
دەخیلە رۆژ بـۆ رۆژێ، چاکتر رێزیـــان لێ بگرە
چونکە کێ رێزیان لێ نێ، تەنها ئەو دەیباتەوە!

# جەژنە پیرۆزە

١٩٩٨/٤/٨ هەولێر

که بۆ جەژنە پیرۆزە، دەستمان دەخەینە نێو دەست
با پڕ بێ، لە نیازی خێر، ئومێد و هیوا و مەبــــەست
بەڵێ، گەر بەڕاستیی بێ، تۆقــــە و جەژنــــــەپیرۆزە
وەك مێوو ڕۆنی لێ دێ، دڵی ڕەق و عاسێ و پــەست
حەماســــــــە دەسازێنێ، دیدار و خۆشــــــەویستیی
لەنێـو دڵ و دەروون و بیر و زەین و هـۆش و هـەست
توخوا با هــەموو لامان، دڵپاك بین، یـەك ڕیز و ڕێك!
پەیوەندی توندوتۆڵ و تۆكمــە و قوڵ و چڕو خەست
چونكە كاتێ گەل لەگەڵ، خوا و خۆی پاك و دڵسۆزە
مانای كاریگەرترین، چــەكــــی لە دوژمن دابــەست!

# سەلام لە ( پشدەرە ڕەقە )[1]

١٩٩٨/٤/١٢ دووگۆمان

بە ناوی خوا و سوپـــاس بۆ ئەو
سەلامی خواش بـــە ڕۆژ و شەو

وەكو بارانـــی بەهـــــــــاریّ
بۆ سەر (خۆشەویست) دابـــاریّ

ئـــەمجار شوێنێك هـــەڵداوێـرم
ســـــەلامـــانی بـــــۆ دەنێرم

ئەویش (پشدەرە ڕەقە) یـــــە
كە كۆمـــــەڵێك گوندی هـەیـە

ســـــەلام (گـــــەڵوی ماخۆبزن)
یاخـوا ناحــــــــــەزت داڕزن!

---

[1] ناوچەیەكە دەكەوێتە باكوری شاروچكەی سەنگەسەر و بەهۆی ڕەقـەنی و بـێ ئـاوی و دێمەكارییەوە وای پـێ دەگوترێ و خەڵكەكەی بەپلەی یەكەم بە ئاژەڵداریی و ڕەوەنـدیی و گەرمێن و كوێستانەوە خەریكن.

سەلامــون عـــەلێك (دووگۆمان)
ئومێدی دوێنێ و ئـــــەمڕۆمان

سەلامون عەلێك ئەی (زەنگڵان)
بە ڕاستیی کەوتوویە نێو دڵان!

ئەی (مەمکان) سەلامـت لێ بێ
وریابە هـەر ڕێی خوات ڕێ بێ!

ئـــەی (جەلك) سەلامون عەلێك
لای مـــە خۆشەویستیی گـەلێك

ســــەلامون عــەلێك (پیرانان)
دانــەبڕێی لـــــــە قارەمانان!

(گرتك) ســەلامی خوا لـە تۆش
تۆش ئیسلام نەکەی فـەرامۆش

(ڕەسواجیان)[1]ی سەر بەزەنگڵ

[1] گوندەکانی ناوچەی پشدەرە رەقەن،کە لەپێش راپەرینی ئازاری ١٩٩١دا کاتێك بنکـە و بارەگاکـانی هێـزی(حـەمزە)ی بزووتنـەوەی ئیـسلامیی ئـەوکات لـە بنـاری قەنـدیل و

سەلام لە تۆش، بەدڵ، بـەکوڵ!

پێو دەڵێن: پشـــدەرە ڕەقـــە
دڵتان نەرمــــە ماڵم هــەقـــە

بـــە ناوبانگن لــــــەم دەژەرە
بە (ئاکۆ) و بـــە (مەندەمەرە)

ئێــوە لــــە ڕۆژانـــــی دژوار
بـــــە خۆتـــان و وڵاخ و بـــار

لـــــە خزمەتـــی ئیسلامدا بوون
پشتیوانـــــی دینی خـــوا بوون

(قـــــــەڵاتووکان)مان لـە بیرە
وەفـــا پیشەی مـــەرد و ژیرە

---

قەڵاتووکان بوون، زۆر لێبڕاوانە و بەسەرو ماڵ لە خزمەت دابوون، بە تایبەتی هەنـدێکیان بەردەوام کاروانیان لە ڕێ دابوو بۆ قەڵاتووکان و قەنـدیل، بـە جۆرێـك بەعسیان تووشـی تەنگەتاوی کردبوو و تەنانەت پێشمەرگەی هەندێك لایەنیش لە ناوچـەکەدا بـەم خزمەتـە قەڵس و ناسەرسەنگ بوون و جارجارەش گرفتیان بۆ دروست دەکردن! !

پێشتریش پــــەرێزتان ڕوونە[1]
پیاو بـــەدڵ لێتان مـــەمنوونە

ئومێدمان وایـــــە هـــــەمیشە
خـــواویستیـــتان بێتــە پیشە

تـــاکـــــو لە ڕۆژی مـەحشەرا
لەژێر ئـــــــاڵای پێغـــەمبەرا

هەموو سـەربەرز و ڕووسوور بین
لـــــە ڕیسوایی و سزا دوور بین

[1] کاتێـک کـە مامۆسـتا(عـەلی بـاپیر) لـە ناوەراسـتی هەشـتاکان تـا ڕۆیـشتنی بـۆ پێشمەرگایەتی لە ساڵی ١٩٨٧، لەبەر زەبرو زەنگی بەعسییەکان لـەم ناوچـەیە و بـە تایبەتی لە گوندی(ماخۆبزنان) یاخود(گەڵوی ماخۆبزنان) نیشتە جێ ببـوو و گیرسـابۆوە و خۆی پەنا دابوو، ئەم ناوە ببوو بەمەکۆی ئیسلامخوازان و بە هەموو شێوەیەك لەلایـەن خەڵکی دەڤەرەکەوە پشتیوانی لێ دەکرا، بە پلەی یەکەم هەرئەو پەیوەندیە بـەهێزەش بوو، دواتر بوونە پشتیوانێکی بە هێز و دڵسۆزی کاری ئیسلامیی و هێـزی پێـشمەرگە لـە قەندیل و قەڵاتووکان و شوێنەکانی تریش.

## یادی ئیسڕا و میعراجە دەك بەخێریٚ

یادی ئیسڕا و میعراجـــە، دەك بەخێریٚ!
خوا خۆشەویست بۆ چ گەشتێك دەنێری!

بە ڕاستیی جێی سەرنج و دەرس و پەندە
ئـــای لەم ڕێزە خودا گرتی لەم بەندە!!

خوایـــــە بم کەی بە ڕێبوارێك هەتا هەم
پەیڕەوی کـــەم لە ڕێ و ڕێبازی خـاتەم

ئیسڕا، (ئەقسا)م دێنێتەوە یـاد، دیسان
کە کەوتۆتە ژێردەست دڵ ڕەش و پیسان

خوایــە! ئەقسای قیبلەگای ئەووەڵی من
ڕزگاری کــەی لەژێر پێ و دەستی دوژمن

جارێکی تر چەخماخـــەی نەصری تۆ بێ
بۆ هـــەق خۆشی و بۆ باتڵ شین و ڕۆ بێ

# گەلی کوردم

گەلی کوردم هۆشیاربە، دەی دەبا گشت!
لەگـــەڵ یەکتر برابین، یـــاوەر و پشت
فەرمـــانی خودا و پێغـــەمبەر وەهـــایە
ڕاست و تێکەڵکێش، وەکـو دیوار و خشت
خودایـــــــە! تەفروتونا بن ئەوانـــەی
تۆوی ناکۆکیان لەنێو ئـــەم خەڵکە ڕشت
خەجاڵەت، هەرکەسێ دژ بێ، بە وەحدەت
مەردە ئـــەوەی میکرۆبی ناکۆکی کوشت
بیر و بڕوا و برایـــــەتی ئیسلامیی یـــە
یەکێتی و یەکبوون و یـــەکڕیزیی و برشت
با هەڵگری مەشخـــەڵی ڕێی خـــودا بین
لە کوردستان، ورد و دشت، وریا و وشت!

# چوارین

ئەگــــەر ڕاستە ڕێزی ئەو زاتە دەگرن!
فەرموون لەســەر ڕێی ئەو بژین و بمرن!
ڕێزگرتنی، پابەندبوونـــە و شوێن کەوتن
کەسانێ وانـــەزانن، گێژ و هـــــەوتن

ئەگــەر بۆ خوا بژی و بۆ ئەو بێ بوونت
بەپێی شەرعی خودا بێ، هات و چوونت
مسۆگـــــەر بەختەوەر خۆتی و کەوابێ!
با مـــــەرگ و ژینت لەپێناو خودا بێ!

ئەحـــەد ئەحـــەدی (ببلال)م دێتە گوێ
پەیامێکــە و لەگــــــەڵ ئێمەدا دەدوێ
ئیمان قایم، ورە بــــــەرز و ڕاوەستاو!
ڕۆژان ڕۆژی لـــە دوایە، دێ ڕۆژی نوێ

سەیرکـــەن پایـــەی پێغەمبەری خوا
چـــەنـدە بڵندە و بۆ بـــەرزی دەڕوا!
ئەگــــەر حەزدەکــــەن لە بەرزی دابن
بفەرموون بـــەنـــدە و دڵسۆزی خوا بن

ئیسرا و میعراجی ڕەسولی ئەکرەمـــە
ئەو خۆشەویستمە و پێشڕەوی ڕێگەمـە
ڕێگای دەگرم، لە ڕێگەی ئەو لانـادەم
پشت بەخودا، خاوەن پەیمان و وادەم

بژی هـــەرکـەس بەرز ڕابگـــرێ ئالا
بمرێ ئـــەوەی ئیسلام دەکا بــە کالا
کەسێکی دین بۆ دنیای خــۆ دەکار با
سەرەنگرێ یە لە سـەد هـەڵدێر و چالا

فەرمانی خوایە لەبیرتان بێ، هەموو دەمێ
نە ستەمکاربن، نە گەردن کەچی، ستەمێ
ئەوی لەم فەرمانەیە بە هـــەر لادا، لادا!
لاڕێ یە و لاڕێش هیچە لە تەرازووی خوادا

سەرکـــەوتن بۆ هەقە و هەر هەقە ڕووسوور
قـــــەڵای زوڵم و ستەم، وێرانـــە و خاپوور
ئەتۆ ڕێی ڕاستی خۆت بگرە و لەمـــــــەولا
لە تۆ هەوڵ و (فەتح و نەصر)یش لە (مەولا)!

ڕۆژ و شـــــەوی تێدا دنیا، دنیا ڕۆژ و شـــەوی یە
کەسێ دنیا پەرستە، کـــە عەقڵی نزم و نـــەوی یە
بەختەوەر کەسێکە، کە خوا دەپەرستێ و چیدی نـا
دڵی ئاسوودە و شـــادە مسوڵمان، بەڵام ئیدی نـا!

# دەمە تەقێی نێوان (دڵ و شاعیر)

١٩٨٧ قەڵاتووکان

لێرەدا دڵ وەکو دڵێکی کرمێ و نەخۆش و
نەفسی(أمَّارَةَ بِاسُّوءْ)[1] دەدوێ

**شاعیر:**

هۆ دڵ چی یە ســـەر لەبەر
لە خوێن بـەر و خـوێن هێنەر
خوێناوت لـــێ دێتـــەدەر
ها، کرمت کەوتۆتــە سەر! ؟

هۆ دڵ چی یە ئـــــازارت
ناڵە و نرکـــە و هـــــاوارت
بــــە حاڵــی ناڵەبـــارت
شین و گریانـــــە کارت! ؟

هۆ دڵ چی یە هـــەموو کات
وا بـــــە ژانـــــە لەرزوتات
چی یە و کامـــــەیە داوات
سـا هـــەڵرێژە سکاڵات! ؟

[1] (وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ) يوسف – ٥٣

**دڵ:**

ئـــــەی شاعیری ناکامڵ ‌ ‌ ‌ لـــــە دنیای خۆشیی غافڵ
پێم تـــــا دەڕۆیە ژێر گڵ ‌ ‌ ‌ کەڕی لە ئاست خۆشیی دڵ!

شاعیر چیت بۆ هـــــەڵڕێژم ‌ ‌ ‌ دوژمنـی ڕۆژوو و نـوێـــژم
ڕاستیـت دەوێ پێت بێــژم ‌ ‌ ‌ لە داخت شێت و گێـــژم!

سکاڵای چی بکـــەم شاعیر ‌ ‌ ‌ خۆ تۆ گـــەنجی و ڕۆشنبیر
شتی وام دەخـــــەیە بیر ‌ ‌ ‌ دەمکەیت بـــە لاتێکی پیر

دەی شـــاعیر وریابـــەوە ‌ ‌ ‌ بێداربـــەوە لەم خـــەوە
لـــە عیبادەت دوورکـــەوە ‌ ‌ ‌ بـۆلای نـــەفست بـــادەوە

برۆ شـــــایی و سەیرانان ‌ ‌ ‌ بـــۆ دیدار و جێ ژوانــــان
لێرەو لـــەوێ و مـــەیخانان ‌ ‌ ‌ تێکەڵ بە، لەگەڵ جوانـــان!

**شاعیر:**

ئەی دڵ وادیــــارە کرمێی ‌ ‌ ‌ هـــا، نـــازانی دڵی کێی!؟
بـــە ڕاستی چێشتی بێ خوێی ‌ ‌ ‌ بۆگـــە و گەندەڵ و گرۆێی

تـــەمـــاشـــا! وشـەی وشك ‌ ‌ ‌ دڕکـــاوی وەکـــو ژشك
وەك ئـــەژدیها و دووپشك ‌ ‌ ‌ دەقـــرتێنـی وەك مشـــك

ئەی دڵ! کـەی ئەوە داوان	وەك پڵتـــۆخ و گـــــڵاوان
سەرت گەرمــە بۆ تــــاوان	سەیرم دێ یە پێش چاوان!

نەفامانـــە هــــاتیە گـــۆ	دالغـــە و خەیــــالاتی تۆ
لە ســــەدا ســـەد و بێ درۆ	شـــەیتانیین، بـــێ گفتوگۆ

**دڵ:**

ئای ئای شـــاعیری نەزان!	خۆ جـــەرگی منت تـــەزان
گوێ بگرە لــــە من قوربان	با قسەت شیرن بێت و جوان!

ئای شاعیر لەم زەمەت چی!	لەقسەی بێجێ و گەمەت چی
لەم زمان و دەمـــــەت چی!	بێژە، ئاخـۆ لەمــــەت چی!

**شاعیر:**

نا نا، دڵــــەی کەم هۆشم!	کــــە ئـــــاوا سینەجۆشم
بۆ دەردی تــــۆ نـــەخۆشم	بە هــــەق بۆت بە پەرۆشم!

سەیرە لەگـــەڵ تۆمــە دڵ	چۆن لە خودا ناکەی سڵ!؟
سبــــەی دەچیەوە ژێر گڵ	دەخرێ یـــــە نێو گڕ و کڵ

زۆر چـــاکت تێگـــەیشتووم	لە مەبـــەستت حـالّی بووم
لەگـــەڵ تۆمە دڵەی شووم!	هــــا، بێدارم نەخــەوتووم!

بووی به شەیتان و شۆفار    دنەم دەدەی ئەی غەددار
بۆ لای ڕێی هەڵەت و خوار    بۆ دنیا و کۆشك و تەلار

**دڵ:**

ئەی شاعیر دەك دەمت خۆش    وا لە من گەیشتی تۆش
ئێ، بڕۆ بادەی کە نۆش    واکەی ژیری و خاوەن هۆش

بەڵام شاعیر نازانم    بۆ وا ڕەقی باوانم
هەر لەبەر داواکانم    ئەمن خاوەن تاوانم!

شاعیر نەمزانی تۆ وای    بۆ من ئازار و بەڵای
وامزانی دوڕ و تەڵای    لە هەڵوێستا ناڕەوای!

**شاعیر:**

ناڕوای چی دڵەی پیس    نەزانی بەد و نەگریس!
لێم دەکەی بە خوری، ڕیس    باوەڕم دەدەی لە کیس

هەناسێك، کە دەژی و هەی    بەدووچار خۆشیی و ئۆخەی
دەتەوێ کافرم کەی    توشی نێو ئاگرم کەی!

ئەی دڵ تۆ نالەباری    ڕەش هەڵگەڕاو و تاری
پێت وایە بە بەدکاریی    دەکەویە نێو بەختیاریی!

دڵان تـــەنها بـــە یـادی، خودا دەکەونـــە شـــادی
(سن)ن پیسی و فەســادی بۆ بـــەختیاریی و ئـــازادی

**دڵ:**

ئەی شاعیر ئەم قسانـە چین ئەمن چیم داوە لــــە دین!
بزانــــە تا هـــەم لـە ژین لێت دادەگـــــرم ڕق و قین

ویستم بــــە کـەیفیَ من بی لە نێو شـــادیی دا، ون بی
عـــــەودالـــی دنیاو ژن بی نەك بـــەو شێوەم دوژمن بی

گویَ نـــەدەی بە ئەم و ئەو بـــە درێژایی ڕۆژ و شــــەو
بـــەردەوام بیت و نـــەسرەو یارت هـەبیَ و بادە و خـەو

بۆ دەردی کـەس زۆر و کەم لــــە نێو دڵت مـــاویَ خەم
لەخەم خۆت بە، هەموو دەم خەڵکیش جارِبەجەهەننەم!!

**شاعیر:**

بـەه، لـــەم بیرە عەنتیکە! دڵ لەگــــــەڵ چی خەریکە
پیاح! چەند لە خوا تـەریکە غافڵ، کــــەشکت فەریکە!

ئای ئای، دڵ ئـــەوە چیتە! هــــەرچی زانین بـــیَ، نیتە
نیشانـــــەی بـــەدڕەویتە بوویـــــە زوڕنـــا و فیتفیتە

دڵــــــەی بەستەزمانی کەڕ — هەی دوور لە نووری بـاوەڕ
سیس و هـــەڵقرچـاو و لەڕ — تامەزرۆی تـــاوان و شـــەڕ

ئـــــاخ و داخم لـــە ڕێتا — بیرم نـەچووە بـــە گوێتا
شـــاعیر شێت بوو لە سوێتا — کەچی قسـەی لـەژێر پێتا

**دڵ:**

شـــاعیر چما من هەڵـــەم! — لێت تاوداومـــەتێ قەڵـــەم
ئەمن ژیر و ژیکـــەڵـــــەم — پوخت و پـــاك و بێ پەڵـەم

**شاعیر:**

ئەی دڵ ئەم قسانە کەی وان — ناڕاستن لــە هـــەموو ڕوان
پێچەوانـــەی دینی خـوان — من خەنیم، تۆ پاك بی و جوان

من لـــە خواش داواکـــارم — بە هەست و زمـــان و زارم
ئەی دڵــــەی خەتابـــارم — ببیە جێی ئیفتیخـــــــارم

بە دەقــی ئایـــەتی خــوا — تێتدا (فجــوڕ) و (تــەقوا)[1]
ڕووسوور، گــەر خاوەن بڕوا — ڕووسیا، ئەگــــەر تەلاسا

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئایەتی{وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا (١٠)} الشمس – ٧و٨و٩و١٠

دەخیل دڵ تـــــەقوادار بە	مل کـــەچی کردگار بــــە
دەست بەرداری ڕێی خوار بە	پایز مەبـــــە و بەهار بـــە

**دڵ:**

شـــاعیر بەسە تەسلیم بووم	بە دم بەدمە و کەمی خووم
بـــە قەرەچـــەناغی شووم	هـــــاوار بۆ ئابڕووی چووم!

خوایــــــە گیان، پەشیمانم	لـــــە هـــــەموو کارەکانم
ئـــەوەندەی مـــاوە ژیانم	خـــــــاوەن بڕوا و ئیمانم!

خوایـــە، دەپـــــاڕێمەوە	ئـــەو ژەنگـــەی کە پێمەوە
بـــــە تـــاوان و کێمەوە	تـــوڕی بـــدە لێمـــــــەوە

**شاعیر:**

دەك لە منت کەوێ ئەی دڵ!	دڕك بووی خۆت کرد بە گوڵ
بە جورئـــــەت و بە بێ سڵ	تۆبـــــەت کرد و هاتیە کوڵ

تۆبــــە، لوتف و نیعمـــەتە	شوکری خوای کە، گەر هەتە
دڵ بێ تۆبـــــە، لەت لەتە	تۆبـــــە، بـــەرزی قیامەتە

کەسێك بە هەق تۆبـەی کرد	تـــــاوانی پێشـــووی ڕابرد
تێڕامێنە جـــــــوان و ورد	تۆبـــە، چرایـــە، بوار و پرد

**دڵ:**

بژی، بژی، ئـــــەی شاعیر ئـــەی هۆشمەندی ڕۆشنبیر
شــــــارەزا و هۆشیار و ژیر دەکـــــەیتەوە بە گەنج، پیر

شـــــــاعیر دەبەرت دەمرم پـــەندم دادە و گوێ دەگرم
باسی قیامــــــــەت و قەبرم تا زیـــادبێ، تەقوا و سەبرم

**شاعیر:**

بەسەر چــــــاوان دڵی خۆم ئـــــەی دڵی لەکوڵـــی خۆم
کـــــە من مشوورخۆری تۆم ئەتۆش چاك گوێ بگرە بۆم

ســــــەرەتاو یەکـــەم دەبێ بیر و بــــــاوەڕت هـــــەبێ
گـــــەر دنیات لێت تورە بێ غـــــەیری خوات تێدا نـــەبێ

دەبێ کاسەی بـــــــاوەڕ بی بە بـــــاوەڕ فێنك و تەڕ بی
هـــــەر بە بـــاوەڕ لەگەڕ بی جێگـــای(اللّه)ی (أكْبَرْ) بی

بــــــا بیرت لـــــە جێ دابێ ســـەرت هـــــەر لە ڕێ دابێ
لێك لێك تـــەزووت پێـــدا بێ تـــرســـــی خـــودات تێدا بێ

نابێ تــــــەریك بی و خۆبوێر کوێرانــــــە وەکو تـــــــاوێر
وەتـــــەل کـــــەوی سەرەوژێر خەڵکی برســـی و ئـــەتۆ تێر!

نالّـــه و نرکـــەت لێوە بێ    کـــاروانت بـــــەرێوە بێ
لاشـــەت خـــوێنی پێوە بێ    پـــەیمانت یـــەك شێوە بێ

پتـەویت وەك سپـەر بـــێ    چی گـــەدا و دەربەدەر بێ
چی دیل و دەستبەســەر بێ    خەمی وانت لەبـــــەر بێ!

بۆ مزگـــــەوتانی ڕوخـــاو    بۆ گشت قورئـــانی سووتاو
بۆ دایك و بـاوکی تاســـاو    بۆ خوێنی بـە ناهـــەق ڕژاو

بۆ شـــــار و گوندی خاپوور    هـــــەتیوی لــە خۆشی دوور
منداڵی لــــــە خوێندا سوور    هەقخوراوی، بێ جێ ومشوور

بۆ ئـــاوارە و بـــەندکراوان    بـــۆ کیمیایـــــی لێدراوان
بـــۆ مـاڵـــــە ڕاگـــوێزراوان    خوێنت بێ، لــــە هـەناوان!

دەبێ خــــــاوەن شەرم بی    لــە ڕووی دۆستان نـەرم بی
شـــــەیدای (پێغەمبەر)م بی    وەکو کورەی گـــــەرم بی

پەروانـــەی دەوری هەق بی    لـــــە ڕووی کوفردا ڕەق بی
مـــژدەدەری شــەفـــەق بی    نەکەی لەخێر قەلـــــەق بی

ڕق و کینەت هـــەمــوو کات	زورداران وەلــــــەرزە خات
بۆ خوا و چـەوساوان خەبات	تاقـــــە هیوا بێ، لــــــەلات

جــا دڵ هـــەرکاتێك وابووی	تامـــەزرۆی لیقای خوا بووی
خاوەن چاکــە و تەقوا بووی	ئەوکاتـــــە دەڵێم زیندووی!

ئـــەوکات بـــەبێ گومـــانی	ئـۆبــاڵكێشم بــــە جـوانی
دەڵێم دڵ و دیــوانـــــــــی	شـــاعیری مسـولمانـــــی

# دەمە تەقێی نێوان( شاعیر و ئازادی )

۱۹۹۱/٦/۲٤ رانیە

**شاعیر:**

سەلاموون عــــەلێك ئازادی ئــــــەوە بۆ وا بێ مرادی! ؟
دەتبیـــــــــنم زەرد و لاوازی دالّــــە و ڕەقەڵە و نــــاڕازی
هەرچەند ڕووی خۆشت دەدەمێ تــۆ بۆم پێ ناکــەنی کەمێ!
لەو کارە ســــەرم ســــوڕماوە دەی تا گیانم لەبــــــەرماوە
بفەرموو لەبۆم روون کـــــەوە شەوەزەنگێ ڕۆشن کـــــەوە

**ئازادی:**

(وەعەلەیکەسسەلام) شــاعیر گەر دەپرسی لە منی ئەسیر
گــوێ بگــرە بۆت بێمــە وەڵام وەڵام دەدەمـــــەوە، بەڵام!
چما تۆ لــــە حاڵم ناگـــــــەی! بۆ نایی بە حاڵم ڕاگـــــەی!
وەرە بۆم بــــــە، پشت و پەنا دۆستی خۆشـــەویستم، دەنا
دەمخەنــــە ژێر تەم و هــەوران نامدۆزنەوە دەیـان دەوران!

**شاعیر:**

ئـــــازادیی، دەك نەمێنم بۆت! وادیارە پێت کەوتۆتـــە کۆت
ڕووت حەشـــــاردراوە بە تەمان لێوت لێوا و لێو بە خـــەمان
چۆن ون دەبی و حەشــاردەدرێی! بۆ تۆش بەتۆڕو داو دەگرێی؟!

**ئازادی:**

مەگەر نازانی حاڵ چۆنە !     ئازادیی لەخۆڕا مۆنە ؟ !
هەرچی لەولاوە ڕاست بۆوە     دێ و دەڵێ لەبەرێ خۆوە
ئازادیی تەنیا لای منە     لەمن وەولای کەوێ، ونە !
ئاخر دەی منیش دەزانم     ئەگەر بەوشێوەی بێ، مانم
لە خەڵکی دەشێردرێمەوە     دەترسم هەر بتوێمەوە
ناشمەوێ ئەستۆم بۆ نێران     وەچەمێ وەك پشتی پیران
من مادام خۆری ئاسۆ بم     نامەوێ زەرد و نامۆ بم
دەمەوێ هەموو مێرخاسێ     ڕاستیی ناس بێت و بم ناسێ

**شاعیر:**

جا قوربان ئازادیی ئێستێ     دەتەوێ دەرخەی هەڵوێستێ
بەو شێوەی کە دەروون توێ توێی     بەو هەستە گەمەوە دەدوێی ! ؟

**ئازادی:**

بەڵێ بە هەموان دەبێژم     هەستی دەروون دەرداوێژم
ئاخۆ من چیم و لە کوێ دام     کێ بوو کەئەو پایەی پێدام ؟
من تینووی خوێنی زۆرداریم     بۆ ژین نەسیمی بەهاریم
تاج و خەزێنەی زۆرداران     کوتك و کێرد و گازی هاران
زەوی ژێر پێ و ئەولولایان     بە میرات دەگرم تێکڕایان
نیری زوڵم و چەوسانەوە     بەسەر ئەستۆی ئینسانەوە
توڕی دەدەم و دەیشکێنم     لەنێو خۆڵیی دەگەوزێنم
بەڵام ها، ئەم ئازادی یە !     کە بۆ ئادەمیزادی یە

ئـــازادیی دیـن و دنیایـــــه
ئەلهەق ئازادیی ئاوایــــــه !

کە بشلێن جـــا تۆ لە کوێ دای
لەنێو کام بەرنامەو ڕێ دای !

بـــە بـێ سڵـەمینەوە دەڵێم
ناگونجی ئەو ڕاستیەی نەڵێم

منـی ڕەوا و ڕاستــــەقینـــە
نەك هی فێڵ و بۆیە و پینە !

لـــە دڵ و دەریـــای (بڕوا)دام
تەنها لە بەرنامەی(خوا)دام !

کـــە بشپرسن، ئــەوە کێ بوو
ئەم بەهرە گەورەیەی پێبوو؟

دەڵێم ئــــەوە خوای گەورەیە
بەخشندەی ئا ئـەم بەهرەیە

ئـەو، بەهرە و بوونی ئـــازادی
ئــــــــازادیی ئادەمیزادی

زۆر وەستایانــــە و ڕوون و ورد
ئاوێتەی نێو قورئـــانیّ کرد

قورئـــانی بە پێغــەمبەر سپارد
تێرو تەســــەلی بەودا نارد

ئەویش بـــە دنیای ڕاگــەیاند
بێ پەردە ئـــازادیی ڕانواند

**شاعیر:**

دەك بـژی ئـــازادیی، بــژی !
تۆ کە لەنێو تــــەم و مژی

ئـــازادانــــە چوویە سەرچۆك
بـــۆ ساختەچیانی ترسنۆك

کەنگێ ئـــازادی لای وانـــە ؟ !
فێڵە، ئـەوەی کە ڕای وانە !

بـــەڕەت لەســـەر هـــەتیو لادا
تازە فێڵ دادی وان نـــادا

بـۆ هـەموو کـەسێك روون بۆوە
ئیتر هیچ ژیرێك لـەمــــرۆوە

فـریــووی داوی وان نـــاخـــ وا
بە فیتووی وان نایە و نـاڕوا

بـــەڵکو ئـــــەوەی ئیدیعا کا
ڕاوی دەنێن، دەبــــێ ڕاکا

## شاعیر و ئازادی:

دەســـا بزانن ئـەی خەڵكینە !
کـــە ئازادیـــی ڕاستەقینە

تەنها لـــەنێو ئیسلام دایـــە
(ئیسلام)یش بەرنامەی خوایە

ئینسان لـــە ئیسلامدا شـــادە
وابەستەی کەس نیە و ئازادە

چونکـە بێجگە لە خوا بۆ کەس
سەرنەوی ناکاو بەرزیش دەس

هــــەر خوا بـــە لایق دەزانێ
سەری بۆ لەعـــەرزێ دانێ

بـەڵێ، بـەڵێ، خوشك و برایان !
هــەر خالیق، لاییقە و شایان

گەردەن کـەچی بۆ دروستکراوان !
جەهالـــەتە و زوڵم و تاوان

هـــاوارە ئـــازادیخوازان !
نەکــــەونە داوی فێڵبازان

ئەگـــەر بە هــــەق گەرەکتانە
عیززەت و ژینی مـــەردانە !

بە ئـــــازادی بژین، بمرن !
فەرموون ڕێگای ئیسلام بگرن

# دەمە تەقێی نێوان( هەژار و حکومەتی هەرێم )

١٩٩٥/١١/٢٥ رانیه

**هەژار:**

هـــاوارە دیسان زستان هـــاتـــــەوە !
کێ دەرووی خێرم لێ دەکــــاتـــەوە ! ؟
چـــارم ناچـــارە و وا چاکـــــە و دەڵێم
سکاڵا بەرمـــــە لای، حوکمـــەتی هەرێم !
حوکمەتی خۆمــــــە، حوکمـــەتی خۆمان !
تۆ بڵێی لوتفی نـــەبێ لــــــە بۆمان ! !
حوکمـــــەتی هـــەرێم ! ســـەلاموون عەلێك
عـــەرزی ســـەلامم بۆ تۆیـــە گــــەلێك

**حکومەتی هەرێم:**

سەلام، هـــا کابرا ! ئیشت بـــە کێ یە ! ؟
چی یە سەرماتــــە وا لـــەرزت لێ یە ! ؟
(لەبەر خۆوە):
ڕاستی مام سۆبە ئـــەوجــــار حەیاتی
ئـــەمن چیم داوە لـــــە هـــاوولاتی !

**هەژار:**

قوربـــــان دەزانی زستانە ئـــــەوجار
دەسا چـــــارەیەك بۆ منی هـــــەژار
ئێستا جەنابت بۆمـــــــە وەك بـــابی
بـــابـی بێ مشوور، کو دەبی، نـابی!
بێ سووتەمـــــەنی و سەرما و ســـــەهۆڵە
خەمێکی گرانــــە و قورسە ئــەو کۆڵە
نە نەوتم هـــەیــــــە و نـــە دوو بڕکەدار
گیرفـــــان و باخـــەڵ، خاڵی لە دینار
ساڵێك و دوو ساڵ، سێ ساڵ، (تەپـــاڵە)
گوزەران نی یـــــە و کوا ئەوە حـــاڵە!؟
کـۆڵێك منداڵم بـــــــە کۆڵـــــــــەوەیە
دوای قـــاپــــی خـــودا، ئومێد ئێـوەیە

**حکومەتی هەرێم:**

لە بێ خەبـــــــەران کەشکەك سەلاوات!
هەی فەقیر لای کێ دەکـــەی سکالات!؟
نەوت و داری چی، ئەوە چی دەڵێی!؟
لاچـــۆ شتی وا، لــــــە لای مـن نــــەڵێی!

**هەژار:**

ئاغای حکومەت! !

توخواکەی کـــەنگێ ئــــەوە وەڵامە!

ئــــای لەو وەڵامـــــــە پوچ و بێ تامە!

جەنابت کوێخا و حـــاکم و گــــــەورەی

لای خۆ دەسکەوتی خەبات و سەورەی! !

بــــە ئینتیفازە هاتیە ســــەر کورسی!

لــــە حاڵی ڕووت و برسیش نــاپرسی! ؟

**حکومەتی هەرێم:**

کوڕە لێم گەڕێ، لێم بووی بـــە حـاکم!

مەحکـــەمەم دەکا جەنــــــابی کاکم!

هەژاری زمان درێژ، هــەی ڕووتی برسی!

تۆ لەکوێ دەژی، لـــە چی دەپرسی! ؟

ئەدی نازانی شــــــــەڕی کورد کوژی

تــــــەواوێك خوێنی لاشــــــەمی مژی!

بـــەم شەڕە منیان بـــە دەردێك بردووە

(بـــا) بە دەواری شڕی نـــەکردووە!

نەسومعە مــــاوە، نــــە مــاڵ و سامان

ئابڕوومان تکا، هـــــەی داد و ئامان! !

**هەژار:**

جەنابی حوکمەت، ئـەی چارە چی یە ! ؟
بۆ هەرلا دەچین هـــــەر دەڵێن نی یە !
کاتی خۆی هـەموو مەسئول و مەنسول !
دابەزین شڕ و بێ پــــــارە و بێ پول
کەچی ئـــەوان پڕ، ئێستا و خەڵکیش قڕ
سەیرە ئەم خەڵکە هــــەروا کپە و کڕ! !
کوڕە کــــەسێکیش ترسی خوای نەبێ !
مەحـــاڵە بۆ گـــەل هیچ وەفـای هەبێ!
سەرباری گرانییش، ئەم شــــەڕ و شۆڕە
بـــە ڕاستی بۆ کورد، بـــە گشتی گۆڕە
ڕاست دەکەی سومعەو مومعە هەموو فت!
بەڵام تــــاوانی کێ یــــە کت و مت! ؟
داد لەدەست گرانی، داد لەدەست شەڕێ!
خوایە! موسەببیب تەختی وەرگــــەڕێ

**حکومەتی هەرێم:**

هەژار چیت پێ بڵێم، چارەســـەر مەگەر
بـــە نەمـــانـی شــــەڕ، ببێ مسۆگەر
دەنا تا شـــــەڕ و هـــــەرا لـە گۆڕ بێ
دەبێ گـەل برسی و سەریشی شۆڕ بێ!
بۆیـــە وا چاکـــە و پێویستە بـــەڵکو
میللـــەت یەکپارچـــە، ســـەراپا هەموو

له شــــــهڕ نـاڕازیی و داوای ئاشتیی کا

چــی بـــۆ برایـــهتیی ڕهوایـــه بیکا

ئهگـــــهر وانهکریّ و ئهگـــــهر وانهبیّ!

نــه مــن وجــود و تۆش وهزعت دهبیّ

جــا کاکــی هـــــهژار، دهبیّ من و تۆ!

بـۆ یــهکتر بکــــــهین شیوهن و ڕۆڕۆ!

**ههژار:**

هـــهقی خۆیـــهتی شـــــهڕ ترۆ بکریّ

شـــــهڕ و شـــهڕانگێز، لهناو گۆڕ بنریّ

ئهمما جهنـــــابی حوکمـــهتی ههرێم!

حاکمی بـیّ حـوکم، نــاچــــارم بڵێم

من هـــهر پێم دهکریّ، شیوهنی خۆ کهم

له خۆم بێزارم، جا چ لــــه تۆ کهم!؟

گهر چیت لیّ ماوه و تــهواو نهمردووی!

نهفرهت لهوهی که، که وای لیّ کردووی!

بێگـــومان منیش گـــهرهکمـــه بژیم

قهت دهستبهرداری هـــهقـی خۆشم نیم

وهره مام حـوکمـــهت، وێکـــڕا نیدایهك

بڵاوبکـــهینهوه، بـۆ هـــــــهموو لایهك

بهخصوص ئـــهوانهی تۆیان کـهوڵ کرد

حهیــــای شۆڕش و کوردایهتییان برد!!

## هەژار و حکومەتی هەرێم:

هۆ ئـــەی خەڵکینە، بــــەلای خۆ، ئێوە
مسوڵمانن، ئـــەی، تاکەی بەم شێوە ! ؟
هـــــەر یەکتر دەخۆن، بۆچی یەك ناگرن
کـــەی ژینە تێیدان، چـــاکترە بمرن؟ !
ناکۆکی بەسـە و دەست خەنە ناودەست
چەندین ڕووبارتان بە خوێنێ هەڵبەست !
دەی بــــــە کوێرایی چـــــاوی زۆرداران
بــۆ خاتری خــودا و برسی و هـــەژاران
دوژمنایــــــەتــی و نــاکــۆکــی لادەن
بـــــەرەو برایـــــەتیی، سوکانی بادەن ! !
هەموو ناوی خوای لێ بێنن و یەك دەنگ
ئەوسا گەل شـــاد و شۆڕشیش بە سەنگ
ئاواش ئیرادەی کـــــورد پـــارێــــزراوە
بــــــەرەی خۆی لەنێو، ئاو دەرهێناوە !

# دەمە تەقێی نێوان( ڕا پەڕین و بەعس )

١٩٩٦/٣/٥ ڕانیە

**ڕا پەڕین:**

من ڕاپـــــەڕینم، سەرکـەوتووم　　وەکو خۆر لەکەل دەرکەوتووم
خودا هـــــەلی بـۆ ڕەخساندم　　ئای لـەو ئازایەتییەی نواندم!
بەگـــــژ تـۆی بەعسا چوومەوە　　هەر چۆکت شکان لەڕوومـەوە
بـــە جۆرێکی وام پـــەند دادای　　لە بیرتە تا لـــە دنیادای!!

**بەعس:**

ڕاپـــــــەڕین، ناهــەقت ناگرم　　دەبێ ئـەمڕۆ گوێت بۆ ڕاگرم
من خـــوا غـــــەزەبی لێگرتم　　کە، ڕە(کوێت)م ماشت و گرتم
دەنا ئـــــەگــــەر ئەوە نەبا　　بـا پیاو بایت و نێوت هــەبا!

**ڕا پەڕین:**

ئـەوە دەڵێی چی بەعسی پیس!؟　　ئەی بەعسی زۆردار و نەگریس!
تۆ پێت وایە ڕۆژ هەر هی تۆن!　　ئـــــەو ڕۆژانە دێن و دەڕۆن
خوا دەستاو دەستیان پێ دەکات　　دەگۆڕێ هێز و دەســـــەڵات
بێ هێز بـە هێز دەکا و بە هێز　　نــزم و لاواز دەکا و بێ ڕێز!
پێشان ئەتۆ هێزت هـــــەبوو　　ئێستاش ملت بووە بـەموو!!

**بەعس:**

من هەر بەعسم، لای خۆم گـــەورە | دەست بەکێبڵ و کوتك و تـەورە
عەرەب، قەومەو کورد، ئەقەلیات | تۆ خزمـەتکارمی لـــــە وڵات
هەتاکـو ئـــەو ڕۆژەی دەژیم | ئەمن گـــەورە و ئەتۆ خادیم
بـــەســـــــە ئیـتر لێببڕەوە | پاشگەزبـەوە و خۆ بکڕەوە!

**ڕاپەڕین:**

هەی نەفام، کوا کەی تۆ گەورەی!؟ | جێی گاڵتەجاڕی ئەم دەورەی
ئەقەلیاتی چی، هـەی ڕیسوا! | منیش قەومم بە ویستی خوا
نەخێـــر ئـــەتـــــۆ لێببڕەوە | خوا کردوومی بـــە نەتەوە
بەعس، گــەر شاخان داپاچی! | کورد گەلەو گەل لەنێو ناچی
پەشیمانیش نیم لــــەم گوڕزە | لەو گورزەی لێی بڕی فرزە
من دژ بـــە زۆرداریی هەستام | دژیشمی تا لــــــە دنیادام

**بەعس:**

عەیبە هێندە خـــۆ هــەڵمەنێ | کورد گۆڕت بۆ هـــەڵدەکەنێ
کورد لە نێوخۆ پێك وەربوو ون | ئاها بـە چ دەردێك چوو ون!
بۆ هەڵگـــــەڕانــــەوە لە من | بە فیتی بێگانـە و دوژمن؟!
ئـــــەی ئەهلی شیمالی وەتـەن! | بۆ باوەشی من بــــاوەدەن
(سَیِّدُ الرَّئیس) گــوتوویـــــــە | عافواتەو هەمووی عەفوویە!

## راپەڕین:

بەیارمەتی خوا، هەی سەرشۆڕ! ... من تۆم هاویشتە چاڵ و گۆڕ
شەڕی نێوخۆییش بـەم پێ یە ... هەر گۆڕبـەگۆڕبوونی ڕێ یە
خـوا پشتیوان بێ، نـامێنێ ... ئاشتیی شکست بەشەڕ دێنێ
بشـزانـە ڕاپـــەڕینی من ... هەڵقوڵاوی گەلە، نەك دوژمن
عافواتـی چـی! گێژەی گەلحۆ ... خۆ دەبێ من عەفوو کەم تۆ!
دەزانی چیت لەگــەڵ کردین ... چونکە مسوڵمان و کوردین!
خەریکی قڕانمان بووی غەشیم ... بۆیــە منیش لێت ڕاپەڕیم
بە کوێرایی هــەرچـی زاڵمە ... ئەوێستا چەندەمین ساڵمە!

## هاواری ڕاپەڕین:

کــوردینە ڕووم لــە ئێوەیە! ... ڕووم پەڵــەی ڕەشی پێوەیە
پەڵـەی ڕەش شەڕ و ئاشووبە ... دەسا میللــەت خێرا و زووبە!
بــا ئـاشتیی بێتەدی و ئیدی ... بەس بێ، شەرمەزاریی چیدی!
چەنگتان لــە خوێنی یەك ناوە ... کورد شڕ، کوردســتان کەلاوە
دڵنیابن گـــــەر وازنەهێنن ... من فت، ئێوەش هەرەس دێنن
جا تا دەرفــەت بە دەستەوە ... گشت بە جورئـەت و هەستەوە
کارامـە و خێرا و دەست و برد ... لەســەر بنەمــای ئایینی کورد
ســازدەن ڕاپـــەڕینێکی تر ... ناکۆکیش وەك بەعسی کافــر
دەگــەڵ نرکــەی پەلاماریێ ... بە عەرزێ دا بەرنــەخواریێ!

# دەمە تەقێی نێوان( بەعس و هەڵەبجە )

١٩٩٦/٣/١٧ رانیە

**بەعس:**

من بەعسم، نــــــەفووراتم ‌ ‌ ‌ گــــەورەی گــــەل و وڵاتم
هــــەرکەسێ خــەتــێ خوارکا ‌ ‌ ‌ دەبێ لــــەم خاکـــە بارکا!
ئەگەر کەسێك، ئەگــەر گەل ‌ ‌ ‌ لـــــە ڕووی مندا بڵـێ: لەل
هــەڵی دەکوتمە ســـــەرێ ‌ ‌ ‌ چـــــاوی دەهێنمە دەرێ!
دەسەیری هـــەڵەبجــە کەن ‌ ‌ ‌ هــەمووتان سەرنجی دەن!
چـۆن کیمیاییم پێــدا ڕشت ‌ ‌ ‌ هـــەزارانم تێدا کـوشت!!

**هەڵەبجە:**

ئەی بەعسی هــــار و زاڵم! ‌ ‌ ‌ ڕاستە بــــە خوێن شەلاڵم
کیمیاییـت پێـدا ڕشـــــتم ‌ ‌ ‌ هــــــەزارانت لـــێ کوشتم
بـە ناپاڵمیش(حەفتاو چوار) ‌ ‌ ‌ خستمتە شیـــوەن و زار
بـــەلام مـن بـــە تۆی کافر ‌ ‌ ‌ بە زەبــر و زەنگ و ئـاگر
لــــەم خاکـــــە ناسڕێمەوە ‌ ‌ ‌ مەحـــــاڵـــە بتوێمەوە!

**بەعس:**

ئاها ها لە هەڵەبجە!!
ئــەمن بـــەو دەردەم بـردوە ‌ ‌ ‌ خــەڵتانی خوێنم کـردوە
کەچی زۆر سـەیـرە ئێستاش ‌ ‌ ‌ تەمبێ نەبووە کوڕی باش!

**هەڵەبجە :**

ئــەوە دەڵێی چــی بەعس!     هەی بەدڕەفتاری نەخس!
من (بــاوەڕ) م ، (شنروێ)م     مــەڵبەنـدی ڕابوونــی نوێم
چیای (ســووریێن)ی ڕۆچووم     من ڕاپـــــەڕیووم، ڕابووم
بـــــە کیمیایـــی و ناپـــاڵم     نا، ناتوێمــــــەوە زاڵم!

**بەعس:**

ئاهــا هــا، لەو زمان درێژە !     بــڕۆ تەرمــەکان بنێژە !
تــۆ مســوڵمان و کــوردی     بۆیە بــەو دەردەم بردی
بە تەنیاش نەبووم ئەو دەم     گــــەورەهێزانی سەردەم
هـــەموویان لــە پشتم بوون     بۆ قڕانێ کوردی چەتوون
کـوا ڕێکخراوی مافی مرۆڤ؟!     لەبۆت گریاو گوتی ئۆف!
ئـــــەوان کیمیاییان دامـــێ     ئەویش بۆ چەند مـەرامێ
تا تۆش لـە خوێنا سوورکەم     تەواوێکت خــــاپوورکەم

**هەڵەبجە :**

ئەی بەعسی چەنگ بەخوێن سوور!     منت پێ نــەکرا خاپوور
تۆ لەگــەڵ گـــەورە هێزان     لەگـــــەڵ زۆردار و دێزان
بـــــە بـــەرچـــاوی دنیاوە     بــە گشت هێز و تواناوە
ئێوەی خـــوێن خۆری دوژمن     ڕۆبوونـــە بـــەرۆکی من
ئێوە هـــەمـــوو کلك و گوێن     هەمووتان تینوون بۆخوێن
هــــەمـــــوو زاڵم و زۆردارن     هەمووتان ســەگی هارن
ڕۆچـــوون لــــە زوڵم و تاوان     بوونە ملۆزمی چەوساوان
دەك خوا لـــە ناوتان بەرێ!     جەرگ و دڵتان هەڵوەرێ!

**بەعس:**

| | |
|---|---|
| هەی لەو تووك و دوعایە ! | چەندی ڕق لە دڵدایە ! |
| من ڕشتم کیمیایی خۆم | تۆباسی چی دەکەی بۆم! |
| لە پێش تۆدا زۆرم کرد | بۆ قڕانی میللەتی کورد |
| بە ڕاگوێزان و ئەنفال | شرم کردن لە شیمال!! |

**هەڵەبجە:**

| | |
|---|---|
| ئەگەر تۆ کیمیاییت ڕشت | هەزارانت لە من کوشت! |
| پێشتریش بە ڕاگوێزان | کوردت شڕکرد، داتهێزان! |
| بە ناوی ئەنفال، زۆردار! | کوشتنت دەیان هەزار |
| کە تۆ جەرگمت سووتاند! | منیش گورزی خۆم وەشاند |
| لێت ڕاپەڕیم، ڕاوم نای | مشتی تۆڵەم لە دەم دای |
| خوا هەلی ڕەخساند بۆ کورد | بەعسی قڕانم دەست پێکرد |
| لە هەموو کوردستانا | پێم لەسەر سەرت دانا |
| سەرەنجامی زۆرداریی | شکستە و شەرمەزاریی! |
| ئێستاش ئەمن ئازادم | ئاوەدان و دڵشادم |
| تۆش ئەی بەعس، خەجاڵەت! | ڕووڕەشی دنیاو قیامەت! |
| نەمێنی لە پێش چاوان | هەی زبڵدانی تاوان!! |

# مەشخەڵی بەرەنگاری



(مەشخەڵی بەرەنگاری) یەکەمین بەرهەمی سەربەخۆی شیعری چاپکراومە لە ڕۆژانی پێشمەرگایەتیم لە پێش ڕاپەڕیندا، ساڵی ١٩٨٩ لە (چاپخانەی شەهیدانی گردی ڕەمکان)[1] چاپ و بڵاوکرایەوە و لە تایپ و دیزاینی (عومەر مەحەممەد مەحەممەد– عومەری ئیعلام) و خەتی (عەبدوڵڵا عەبدولکەریم هەولێری–عەبدوڵڵای ئیعلام) بوو، لە (٧٤) لاپەڕە و پێشەکەش بێ و پێشەکیەك و(٣٠) پارچە شیعر و ناوەرۆك پێکهاتبوو و (٦٠٠) فلس نرخی لەسەر نووسرابوو و ئەم چوارینەیەش لە بەرگی دواوەیدا بڵاوکرابۆوە:

(لەجێی شێران لە مەیدانێ یە ڕێوی
گورگ ئەمڕۆ هەق و ناهەق دەپێوی
بڵێ: گەر بەهیوان حوکمی خوداکەن!
دەبێ شێر بێنە پێشێ و خۆ فیداکەن!!)

---

[1] ئەم چاپخانەیە یەکەمجار لە ساڵی١٩٨٧ لەلایەن هێزی (حەمزە)ی بزووتنەوەی ئیسلامیی جاران، لە قەڵاتووکان بە ناوی چاپخانەی (حەسەن بەننا) دامەزرێندرا، دوای داستانی قەڵاتووکان و شەهیدبوونی چوار پێشمەرگەی قارەمانی هێزەکە لە ڕۆژی ١٩٨٨/٧/٢٢ لەسەر گردی ڕەمکان، ناوی چاپخانەکە بۆ (شەهیدانی گردی ڕەمکان) گۆڕدرا تا ١٩٨٩ و لە ١٩٩٠یش کرایە چاپخانەی (شەهیدان)، بەگشتیش لەو ماوەیەدا لە شاخ، چەندان بەرهەمی مامۆستا عەلی باپیر و نامیلکەیەکی مامۆستا مەحەممەد زەرزی بەناوی (شەڕی پارتیزانی) و نامیلکەی شیعری (مەشخەڵی بەرەنگاری)ی بەندەی تێدا چاپ و بڵاوکرانەوە.

شایەنی باسە هەرکام لە برایان (عومەر محەمەد محەمەد ـ عومەری ئیعلام، عیزەدین محەمەد ـ حاجی ڕزگار، عەبدوڵڵا عەبدولکەریم ـ عەبدوڵڵای ئیعلام، شەهید عەلی دێرەیی، مەلا حەمەد ئەمین ـ جیهاد) ئیشیان تێدا دەکرد

لەبەشـی خوارەوەشـیدا نووسـرابوو: لـە بڵاوکراوەکـانی بزووتنـەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق دا.

شایانی باسە شیعرەکانی نێو (مەشخەڵی بەرەنگاری) لـە سـاڵی ١٩٩٨ لە نێو (مەدالیای کوردستان)دا چاپکرانەوە و لـەم دیوانەشـدا لـەریزی ئـەودا هێنراونەوە، بۆیە لێرەدا لـە باسـی (مەشـخەڵی بـەرەنگاری)دا تـەنها کورتـە باسی ناساندن و پێشکەش بێ و پێشەکیەکەم هێناوەتەوە.

## پێشکەش بێ:

* به سەرکردەی موجاهیدان (محمد المصطفي)
صلی الله علیه و سلم.
* به گیانی هەموو شەهیدان.
* بەو هەموو بڕوادارانەی کە لێبڕاون، هەڵستاون، چەکی ئیسلامیان لە شانە و داشی نانێن هەتا ماون.
* بەو دایکە خۆشەویستانەی، کە رۆڵەکانیان بەتەنێ پێشمەرگەی خوان، ئەگەر کوڕێکیان شەهید بوو، پێیان خۆشە ببن بە دوان.

# پێشەکی

**بەناوی خودای بە بەزەیی بەخشندە**

سوپاس و ستایش و شوکری بێ بڕانەوە، بۆ خودای تاقە یاوەری بڕواداران، بۆ لە ڕیشەدەرهێنەری تێکڕای تەختی ستەمکاران، بۆ خوای بەدیهێنەری بوونەوەر، دروود و سڵاوی ئەویش، داباریتە سەر گیانی پاکی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) مەردی میحراب و نێو سەنگەر، شمشێروەشێنی جەنگاوەر، خودە لەسەر، زریێ لەبەر، ئەوجار بۆسەر کەسوکار و یارانی تێکۆشەری ئەو، کە بۆ خزمەت بەدینی خوا، شەویان دەخستە سەر ڕۆژ و ڕۆژیشیان دەخستە سەر شەو، ئینجا بۆ سەر شوێنکەوتوانی کاروانی ڕێبازی خوایی، بە تێکڕایی، هەتا دوایی.

**خوێنەرانی ئازیز:**

لەوکاتەوە شەووڕۆژ دێن و ڕادەبرێن، بەهۆی وان مانگ و ساڵ پێك دێن، وەك چۆن دەنێو شەو و ڕۆژان گەلێك دەمرن، گەلێکیش زیندوون و دەژیێن، حەشامات و ئۆردو زۆرە، لێیان مەپرسن ئاخۆ کێن!؟ کە دەتانەوێ بیانناسن، داخوا ئەوان بێ باوەڕن، یان خواناسن، تەماشای کارەکانیان کەن، دەستەوستان دامەمێنن، ئاخۆ هەتا چ ئەندازێك دەگەڵ قوڕئان و

سوونن‌ه‌تدا پێك هه‌ڵده‌كه‌ن، چه‌نده‌ش له‌ بێ فه‌رمانی خوا داوه‌ڵ ده‌كه‌ن!
ئه‌وه‌ لایه‌ك، ئه‌وانی دیش كه‌ ده‌نووسن، خامه‌ به‌ده‌ست، زمان لوسن، زۆر به‌وردی ده‌بێ رسته‌ و وته‌كانیان موتاڵاكه‌ن، هه‌موو لایان ئاوه‌ڵا كه‌ن، چاوانیان چڕ لێ دابگرن، سه‌ریان زۆر له‌سه‌ر رابگرن، به‌ پیشكی بیر و زه‌ین و هۆش، هه‌ڵیان كۆڵن، داخوا چه‌نده‌یان خاوێن و چه‌نده‌شیان پیس و كرمۆڵن، هێنده‌یان لێ وردببنه‌وه‌، گومان له‌وه‌دا نه‌مێنێ، چیان ده‌نێودا و چیان له‌بنه‌وه‌! خۆشه‌ویستان! له‌ دوای ئه‌وه‌، ئه‌و رستانه‌ی كه‌ پاك ده‌رچوون، تێكه‌ڵاوی خڵته‌ و خاڵ و چه‌وه‌ڵ نه‌بوون، ده‌بێ ورد بین، كار به‌وه‌نده‌ ته‌واو نابێ، رسته‌ و دێڕی نووسراوه‌كان، وشه‌ی زل زلیان تێدا بێ! ده‌بێ ئه‌وجار، به‌ڵام هۆشیار! ئاورێكی به‌خێر ده‌ینه‌وه‌، بۆ نووسه‌ری ئه‌و نووسراوه‌، داخوا ئه‌وه‌ی نووسیویه‌تی، ده‌گه‌ڵ كرداری ته‌واوه‌! پێك دێنه‌وه‌ و وه‌كو یه‌ك وان! هه‌ردوو به‌ پێی به‌رنامه‌ی خوان! یان وانین و كورد گوته‌نی: نێوانیان ئاسمانه‌ و رێسمان!

دوباره‌ روو له‌ خوێنه‌رانی خۆشه‌ویست ده‌كه‌مه‌وه‌، له‌ زه‌نگی بێداربوونه‌وه‌ ده‌ده‌مه‌وه‌، زۆر نێزیكه‌ برنه‌وهاوێژێك به‌ئێوه‌ نه‌گه‌مه‌وه‌، مه‌به‌ستم له‌مه‌ ئه‌وه‌یه‌: ئێوه‌ی نیم خۆ به‌چاك دانێم، به‌ڵام ده‌بێ ئه‌وه‌ش بزانن، ناتوانم بێ ده‌نگ دانیشم، خۆ وه‌لانێم!

وه‌ك له‌دیوی ده‌رێی ئه‌م چه‌ند په‌ڕه‌، ره‌شكه‌ و پێشكێكم نووسیوه‌، له‌ ژوورێی جێ نه‌بۆته‌وه‌، له‌ ده‌رێی خۆ هه‌ڵواسیوه‌! وه‌كو تێیدا: ئێمه‌ خۆ به‌شێر ده‌زانین، شێریش ئه‌مڕۆ له‌ كه‌ناران ناویان ده‌نێو ناواندا نین! رێوی له‌ جێیان دانیشتوون، چوونه‌ به‌رگی شێرانه‌وه‌، ته‌نانه‌ت شێریشیان كوشتوون! ده‌زانم به‌وه‌ش نابنه‌ شێر، بێجگه‌ له‌رووی كه‌سانێكی سینه‌پیس و چاو و دڵ كوێر، به‌ڵێ ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ، ئه‌و رێویانه‌ وه‌لانێین، شێرانیان

لەجیّ دانێیین، ئاشکرایە ڕێوی قەت بە ڕێویان ناڕۆن، کورد گوتەنی: برای یەکترن و کەشك و دۆن، کەواتە بەکورتی دەبێ: ڕێوی بەهۆی شێران لاچن، لاشم روونە، ئەگەر بێت و شێر لە بێشان بێنەدەریّ، پەلاماریان بەرنە سەریّ، کتوپڕ دایان دەپاچن، هەرچەندێکی ڕێوی هەبن، باریّ بنەوەیان پیّ دەبڕیّ و هەموو تەفروتونا دەبن.

خۆشەویستان: وامەزانن هەر لەخۆڕا، لەو باسانە دەکۆڵمەوە، توربێن و تێلەکە و توێشووی، قسەی بیّ بەڵگە بەکۆڵمەوە! کەسێکیش کە ئەو راستیانەی ناچنە دەگویّ، لێم قەڵسە و دانم لیّ دەسویّ، خوای لیّ خۆش بیّ، هەروەك گوتم: بەڵگەم پێیە و بیّ بەڵگە نیم، خوا دەفەرمویّ (وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا)[1].

جا خوێنەرە ئازیزەکان: ئەو کارەش بەشێوێك دەکریّ و بناغەی دیواری ئەو کۆشکە دادەڕێژریّ، کە یەك دڵ و ئامانج و ریز، بەمەبەستی رامالّینی تەڵە و تەپکە و تەل و تامان، پالّ وێکدەین هەموو لامان، خوا لە وەسفی کەسانێکی ئاوەهادا فەرموویەتی (بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ)[2]، بۆیە دەبیّ ئێمە وابین، وەك وێچواندنی خودا بین، دەست لەنێو دەست و پشت لە پشت، توێشووی ریّ بهاوێینە کۆلّ، دەکارخەین هێز و بڕشت، ئەوجار ڕێگا بگرینەبەر، بەرەو ئەو لوتکە بڵندەی، کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بیّ) پێی دەفەرمویّ (ذروة السنام)[3]، کە بەرزترین لوتکەیە لەنێو ئیسلام.

---

[1] الاسراء – ٨١

[2] (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ) الصف – ٤

[3] وَذِرْوَةُ سنامه اَلْجِهادُ) ترمزی گێڕاویەتەوە، واتە: لوتکەی هەرەبەرزی ئیسلام، جیهاد و تێکۆشانە.

منیش ئێستا کە لێرەدا، هەشت نۆدە شیعرم نووسیون، نالێم ئی واتان نەدیون، بەڵام زۆریشم پێ خۆشە، کە وشە و پیتی شیرینی زمانی کوردی، کە لەمەوپێش بۆ خزمەتی بیر و باوەڕی بێگانان، یەکێك بەرەو روسیا بردی! یەکێك بەرەو شوێنێکی دی! سوپاس بۆ خوا، وەك دەزانن ئەمڕۆ کارێك بەدەستەوە، کە چی دی ئابڕووی نەڕوا ئەو زمانە خۆشەویستە، بەهۆی خامەی نۆکەرانی وابەستەوە، ئەمنیش وەك قوتابیەکی بچوك، وەك گەلێك لە خواناسانی بێداری رابردوو و ئێستا، ئەو نەختە هۆش و هەستەی خوا پێی بەخشیووم، قوربان وەك ئەسپی رمبازیان، کەوتە حیلە و رانەوێستا، ئەوجار مەیلەو بەشەرمەوە، بەڵام بەناخ و نیازێکی، یەکجار لە کوڵ و گەرمەوە، کاتێك کە پڕ لە ئاوات داوێستا، کەم تاکورتێك، پاڵی دا بەخەمخۆرانی ئیسلامەوە، لەهەڵوێستا.

عەزیزانم: جا ئەوەی لەبەردەستانە ئەوەندۆکە، چ بڵێم! کوردان گوتویانە: دیاری شوانی ئاڵەکۆکە.

لە کۆتایی: خوایەگیان دەپاڕێمەوە، تەنها بەمەبەستی رەزای تۆ نووسرابێ، تەنها بۆ تۆ ئەو هەوڵ و رەنجە کێشرابێ.

خوێنەرە خۆشەویستەکان! یەك داوام لێتانە لێرە، بەڵام توخوا لەبیرتان بێ، ئەویش پاڕانەوەی خێرە.

**واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين**

**وەرزێر**

**١٩٨٩/٣/٢٠**

# فەرهەنگۆك

## ئـ

ئاوابوونەوە: ئاوەدان بوونەوە.

ئاین و ئۆین: فرت وفێڵ، قۆرت و قولاپ، کەینوبەین.

ئەتوار: ئاکار، هەڵس و کەوت، خووخدە، رەفتار.

ئەستێ و بەرد: (پارچە ئاسن و بەردێکە و بە لێکدران،(پووشوو)یان پێ ئاگر دراوە) زوو بۆ ئاگرکرنەوە بەکارهێنراوە.

ئەشخەڵ: دەوەن، تەڕاش، داری گچکەی دێمەکار.

ئەلەوێڕا: لەوێڕا، لەوێوە.

ئۆردوو: لەشکر، هێز، سوپا.

ئیختیفا: خۆحەشاردان، خۆپەنادان، خۆشاردنەوە لەترسی دوژمن.

## ب

باراش: ئەو گەنم و جۆیەی بۆ لێکردن دەبرێ بۆ ئاش.

بایەقوش: کوند، کوندەپەپوو.

باوێ: بهاوێ، باوێژێ، تێبگرێ.

بارانی شەست لەسەر: شەستە باران، بە خوڕزەم، بەڕێژنە، بەتەوژم.

باشوو: باشووکە (باڵندەیەکە لە ئاسمانەوە پەلاماری چۆلەکە و پاساری دەدات).

بابۆڵە: لەفە، نانی لوول دراو کە پێخۆرێکی تێکرابێ.

بەستەزمان: فەقیرحاڵ، بێ ئاگا، سەلامەت و بێ وەی.

بەردەباز: ئەو بەردانەن لەنێو ئاودا بۆ بەسەردا پەڕینەوە دادەنرێن.

بەرپاچ: ڕەزکێڵان. کێڵانی زەوی بە پاچ و بێڵ.

بەلاوەدەنێین: لادەبەین، لەبیرخۆ دەبەینەوە.

بەردی زاری (کانی): بەربەست، ڕێگر، بۆتە بەردی زاری کانی، واتە: نەخۆی ئاودەخواتەوە و نە دێڵێ کەس ئاو لە کانیەکە بخواتەوە.

بەسەرنا: بەسەرماندا.

بەربینگ پێگرتن: یەخەپێگرتن، گێچەڵ، بەربینگی پێ گرت: پێشی پێ گرت، شەڕی پێ فرۆشت.

بەفروشۆ: شڵێوە، پێکەوە بارینی بەفر و باران، شڵتوشۆ.

بەرێ: سەرەتا، پێشێ، بیدایەت.

بەری دروێنە: ئەو ڕووبەرەیە کە پاڵە(دروێنەوان) بۆ دروونەوە ملی دەبەر دەنێ.

بەندەن: کەژوکێو، شاخ و کێو. بەندەن: لەش، بەدەن (بەندەنت هەلا هەلا بێ).

بەدی کردن: بینین، چاوپێکەوتن.

بۆخۆ: بۆ خۆم، بۆ من، بۆ خۆمان، بۆ خۆتان.

بۆسۆ: بۆن سۆ، بۆنی شتی سوتاو، ماستی بۆسۆ لێهاتوو: بەزۆرکوڵاندنی شیرەکە و سووتانی بە بنی مەنجەڵەوە دروست دەبێ.

بوودەڵە: سووکەڵە، بێ شەخسیەت، کەودەن، گێل، بۆرە، نابووت.

بۆمە: بۆ ئێمە.

بۆگە: بۆزووت، بۆژۆ، گەچڵاو، ئەو گیایەی لەبەر پێ پەستکران و وەنێوکەوتن، ماڵات نایخوات، چەوەڵ.

بۆم بە: بۆم ببە.

بۆرە: سوکەڵە، بۆرەپیاو.

بوخچە: چارەکە، پارچە قوماشێکی چوارگۆشەیە، جل وجۆری تێدەنرێ، گوتراوە: (بوخچەی بووکێنی، بوخچەی نەکراوە: ئافرەتێك کە شوی نەکردبێ و کوڕێك کە ژنی نەهێنابێ).

بوومێ: دروست بووم.

بێ چەندوچوون: بێ سێو و دوو، بێ مشت ومڕ، بەبێ لەسەر ڕۆیشتن، بەبێ قسە، بێ ئەم لاولا.

بێڕەزا: زل، زەبەلاح، گەورە، نەفورات، فیلەتەن.

بێ مەسکەنی: بێ خانوویی، بێ جێگەو ڕێگەیی، بێ شوێنی نیشتەجێبوون.

بێ سەلا: بێ دەرەتان، بێ وەزع و حاڵ.

بێگار: سۆغرە، ئیش پێ کردنی بەتۆبزی بەبێ کرێ.

بژیو: رزق وڕۆزی.

بناهوون: قوژبن، ئەوسەری، کونج، سیلە، گۆشە.

بناوان: شوێنی لێوەهەڵبەستنی ئاو لەسەروچاوەوە.

بنژیل: ئەو وردە گەنم و خشتوخۆڵەی لە بێژینگ دەکەوێتەخوار.

بڕستیان لێ بڕی: هێزیان لێ بڕی، بێ تاقەتیان کرد.

بلوور: بلوێر، شمشاڵ.

## پ

پان و پۆڕ: فرەوان، بەرین، هەراو.

پاڵیت، پەڵتە، ئەو شتەیە کە دەئاخنرێتە کونێکەوە(پاڵیتی پاش مێشان) بەکەسێك دەگوترێ کە وەلانرابێ و پشتگوێ خرابێ.

پەرێز: شوێنی گەنم و جۆی درواوە، شوێنەوار.

پەز: مەڕ.

پەلەپڕووزە: ، تالّووکە، پەلەپەل.

پەلی لەکراس دەرێنێت: دەست لەخۆی بشوات، هیچ ئومێدێکی نەمێنێ.

پۆخ: چڕۆ بەر لە پشکوتن.

پوچەڵ: پووچ، بێ ناوك، قرپۆك، بەتاڵ.

پواز: وەرە، هۆرە، (دار هۆرەی لەخۆی نەبێ ناقەڵشێ) پەند.

پێڕ: دەستە، تاقم، گرووپ.

پێکۆڵ دەکا: لەشەڕە، ولاخ کە پێیەکانی پێشەوەی لە زەوی دەدات.

پێ دەکا: هەڵدەکا، دادەگیرسێنێ.

پێچوو: پێی لەناو چوو، پێیەوە فەوتا .

پێی تێچی: پێی لەناوچی، پێی بدۆڕێی.

پێخۆر: هەر شتێك کە لەگەڵ نان بخورێت، وەك: ماست و هێلکە و پەنیر...

پێو وایە: پێتان وایە، وادەزانن.

پیاو بی: مەردبی، ئازابی، عاقڵ بی. واتە: ئەگەر پیاوێکی رەشید بی. بەهەمان شێوە دەتوانین بڵێین: ئەگەر ژن بی، واتە، ئەگەر ژنێکی رەشید بی.

پڕپۆڵە: ئەو هەویرەی ورد ورد دەکرێ و دەدرێتە جووجکە مریشك و...

پڵتۆخ: پیس، چڵکن و بێ موبالات و کەمتەرخەم.

پشتیر: بنەبان، خۆڵکە، هۆڵکە، شوێنی تێکردنی مالآت لەماڵەوە لەناو خانوودا.

پڕشکی ئاگر: پڕیشك، پڕنچکی ئاگر.

پڕووشە: ئەو کلوە بەفرانەن کە لەسەرەتای بەفر باریندا دەبارن.

# ت

تا سەر: هەتا سەر، تا هەتایە، هەمیشەیی، یەکجاریی.

تاپڕ: جۆرە چەکێکی ڕاوە، وەکو: ساچمەزەن.

تاومان دەدات: دەمان بات.

تاوێر: بەردی گەورە کە لەتەلان گلۆر دەبێ (تاوێری لابەلا).

تەڵخی: ناڕۆشنی، لێڵی.

تەپکە: کەرەسەیەکی ڕاوەکەوە لە تەختە دروستدەکرێ و لەسەر قوڵتێك دەنرێتەوە.

تەپۆلکە: گردۆلکە.

تەی دەکا: دەیبڕێت.

تەلسمەبەرد: پڕنچکە بەرد، پارچە بەرد. تەلسم: پارچە، جادوو، سیحر.

تەنی: تەنیەوە، گرتەوە.

تەلاسابوو: لایدا، کەوت، راقەنا، راهات.

تەما: هیوا، ئومێد.

تۆغیان: هەڕەت، کات، وەخت، جەنگە.

تۆسن: تووڕە، قەڵس.

تۆقی ئاسمان: تەشقی ئاسمان، ئەوپەڕی بەرزایی ئاسمان، پەڕ پەڕۆچکەی ئاسمان.

توێشوو: زاد، زەخیرە، نان و پێخۆر.( توێشوو چ لە زگ و چ لە پشت) پەند.

تووش: تۆف، سەخت.

تووڕدەین: فڕێ دەین، وەلانێین.

تێناوەستن: راناوەستن، گوێ پێنادەن، بێباکانە ئیشەکەیان پێ دەکرێ.

تێكنا: پێچایەوە، خڕكردەوە.

تێهەڵدەچمەوە: دەست پێدەكەمەوە، تێڕادەچمەوە.

تێچوون: لەناوچوون، نەمان، فەوتان، تێداچوون.

تێچن: لەنێوچن، نەمێنن، بفەوتێن، تێداچن.

تێدەكشێین: دەڕۆیین.

تێ بوەستی: راوەستی، نەتوانێ بڕوا، بڕنەكا.

تێدەچێ: لەناودەچێ، دەفەوتێ.

تێلەكەو تووربێن: ئەو توورەكە، یا چارەكەیە، كە شتیان تێدەكرێ و بەكۆڵدا دەدرێن، یا لەشان دەكرێن، یا لەقەد دەبەسترێن.

تریقانەوە: پێكەنینی بەدەنگ.

تڕۆ: دەنگدان، دەركردنێكی بێ رێزانە، كەسێك لەنێو جەماعەتێك دەربكرێ، دەڵێن: تڕۆكرا.

تیكەیەك نان: پاروە نانێك.

تلانەوە: خووسانەوە، توانەوە.

تیاح: پیاح، بۆ سەرسوڕمانی گەورەیە.(تیاح لەو سروشتە جوانەی كوردستان !!) پەككو!.

تخێڵیان كرد: خستیان، رایان قەناند، تخێڵ: كەسێك لەبەر زۆر ماندووبوون، یا نەخۆشی و بێ هۆشی و مردن، تەخت لەسەر زەوی راكشابێت و گرێی لێ بڕابێت.

تخێڵم كا: بمخات، لە زەویم بدات.

تخوون: توخن، نزیك، قەمچ.تخوونی كەوێ: نزیكی بێتەوە.

## ج

چاوپێچك: ئەو شتەی چاوی پێ دەبەسترێ.

چاومان بەیەك هەڵێناوە: بەیەکەوە لەدایکبووین، پێکەوە هاتووین.

چاتر: چاکتر.

چەکەرە: چەقەرە، چقروزە، تۆمە کەتازە سەردێنێتەدەرێ، سەرەتای ڕوان.

چەکچەکیلە: شەمشەمەکوێرە.

چەپلەك: دەستەوستان، دەست و پێ سپی، کۆڵەوار، کارنادروست.

چەپاڵەندەی، بمانپارێزێ.

چەپەلۆك: چاپەلۆك، ڕاوەشاندنی دەست بەبلاوی (چاپەلۆکێکی لێدا)، چەمووڵە.

چۆوە: نەما، کۆتایی هات، ڕۆیشت، بەسەرچوو، توایەوە.

چوومێ: بۆی چووم، بۆی ڕۆیشتم.

چڕەدووکەڵ: دوکەڵی چڕوپڕ و داوەستاو.

چخورد: بیشەڵێن، بیشە. دار و لێڕەوار و زێ و زاڵی چڕوپڕ.

چش: هیچ.

## ح

حەجمینی لێبڕا: هاواری لێ هەستا، ئۆقرەی نەما.

## خ

خاشەبڕ بێ: لەنێو ببرێ، نەمێنێ، لەبەین چێ، قڕانێ بکات.

خاراو: ڕاهاتوو، لەگڵ دەرهاتوو: (دەڵێی هەمبانێ خاراوی) چەختی.

خەڕەند: خڕندۆلّ، زەندۆلّ، دۆلّێکی قولّی بەشاخ دەورەدراو، (خەڕەندی ڕەواندزێ).

خەلّفازۆ: نەشونما، زیادکردن، گەورەبوون، چرۆوگەلّا دەرکروو.

خەمساردی: بێ خەمی، بێ موبالاتی، بێ مشووری، گوێ پێ نەدان، کەمتەرخەمی.

خەلّەفاو: تێکچوو، عەقلّ لەسەرخۆ نەبوو، تووشی وڕێنە بوون، فریودراو، خەرفاو.

خەنی: زۆرخۆشحالّ، شاگەشکە. گەشکە: لەخۆبوونەوە لە خۆشیان.

خەرتەل: دالّ، بالّدارێکی گۆشت خۆری زۆر گەورە و بەتوانایە.

خۆت لەقەرەدا: ، لەئاقاری ڕا چووی، خۆت لێدا، لەراستی ڕا چووی، دەبەری ڕاچووی.

خۆشڕۆ: تیژڕەو، خێرا.

خۆرکە: داخوران، بە هۆی ژەنگی زۆرەوە بێ، یاخود کرم و مۆرانەوە.

خۆ: خۆی.

خۆهەتلّەکەم: خۆلادەم، خۆببوێرم.

خۆن: خۆمان.

خوررزەم: ڕێژنە، شەست لەسەر، بەتەوژم، بەخوڕ، بە لێزمە.

خمخانە: ئەو شوێنەیە جل و بەرگ و شتی دیکەیان لێ لە خم ناوەو رەنگیان کردووەو بەزۆری رەنگی رەش بەکارهاتووە، بۆ کەسێك باوەڕ بەقسەکەی نەکراوە، گوتراوە(لە کوپەلّێ خمیت نێم) واتە: رووت رەش بێ.

داناچڵەکێی: راناچڵەکێی، تێك هەڵناگلێی.

داوەڵ ناکەن: سڵ ناکەن، ناگەڕێنەوە. داوەڵان ناکا: بەو پاڵەیەی بەپوختی دروێنە دەکات ،دەگوترێ.

دادەبێژت: کون کون دەکرد، دەبێژتەوە.

داهۆڵ: داوەڵ. چەندپەڕۆ و پاتاڵێکە لەشێوەی ئینسان، یان دەعبا، لەنێو دەغڵ و بێستان و حەوشێدا بۆ ترساندن و رەواندنەوەی باڵندە و شتی دیکە دەچەقێنرێت.

داویشت: دەهاویشت.

دافەتاو: هیچ لەباراندا نەماو ، هەڵوەشاو ، لەپەڕو پۆ بوو، تەواو سووتاو.

داڵە: رەقەڵە، کز.

داهێزان: بێ تاقەتی، بڕشت لێبڕان.

دابیێتێ: پەلاماری بدا، رۆی بێتێ، پڕی بداتێ، تاوی داتێ، لێی بنەوێت.

دەشێ: دەگونجێ، دەبێت، رێی تێدەچێ، دەکرێ.

دەروو بڕ: ئازایەك سەختیەکان ببڕێت.

دەروو: شوێنی تەم تەم و سەختی شاخ، دەروی لێکرایەوە: رێگای لێ کرایەوەو دەرگای بۆ ئاوەلا بوو، بۆی ئاسان بوو، واتە: لە ناڕەحەتی رزگاری بوو.

دەمڕاست: قسە رۆیشتوو، ریش سپی، پیاوماقووڵ، بڕیار بەدەست.

دەستەپاچە: کۆڵەوار، دەست و پێ سپی، هیچ لەباراندا نەبوو، چەپلەك.

دەست لە ئەژنۆ وەرێنێت: نائومێد بێت، تەمابڕاو بێت، بێ هیوابێت.

دەرێ ناوە: وەرێ خستوە، بەرێ کردوە، خستۆتەرێ.

دەستە خوشك: هاورێ، ئافرەتی هاورێ.

دەستەویەخەم: رووبەڕووم.

دەبڕێمەوە: نامێنم، لەنێودەچم.

دەڕۆستی نایەت: پێی ناوێرێ، دەرەقەتی نایەت.

دەخورێ: دەنازێ، لەخۆڕا دەبینێ.

دەگرێ: دەسووتێ.

دەستەونەزەر: دەست لەسەر سنگ، حازرو ئامادە، (وەك تای بەر تەورداسێ).

دەتارێنێ: ڕاودەنێ، دەرەوێنێتەوە.

دەرێنین: دەربهێنین، هەڵکێشین.

دەسووژن نێم: بپشکنم، کوناوکون بگەڕێم، هەموی راوکەم، بەوردی سۆراغی بکەم.

دەم دەمی: فیفی، پێت پێتوکە، حول حولی، لەسەر بارێك نەبوو، وازی وازی.

دەرێنێ: دەربێنێ.

دە: دەی، ئادەی.

دەرداوێژم: دەردەبرم، وەدەرێ دەنێم.

دەڕێنا: بەڕێ کرد، نارد.

دەرێنا: دەرهێنا.

دەقەومێ: ڕوودەدات، قەوما: ڕوودانی ڕووداوی ناخۆش.

دەستەواو: ئیش و کارێك، بە ئیش و کارێکی وەك خۆی پاداشت بدرێتەوە. (شایی و شین دەستەواون) پەند.

دۆش دامان: سەروەئەژنۆ کردن، لیچ داژەنین، بێ تاقەت بوون و سەر دەقالان نان.

دێزە: کەسێك، یان شتێك، لە ڕقی خەڵك و خاوەنی، زیان بەخۆی بگەیێنێ.
دێمەکار: پشتاو، قاقڕ، بێ ئاو، شوێنێك بەراو نەبێ و تەنها بە ئاوی بارانە بدێرێ.
دێوجامە: لە کەوڵی ڕێوی و لبادو... دروست دەکرێت.
راوکەر بۆ هەڵخەڵەتاندنی نێچیر، بەبەر چاویەوە دەگرێت.
دڕ بەتاریکی شەو دەدەم: تاریکی شەو دەبڕم، دەردەچم.
درەو: دروێنە.
دنە: دنەدان، هاندان، پاڵدان بۆ شتی خراپ.

## ڕ

ڕانێ: نیشان بدات، خۆ نمایش بکات.
ڕادەنوێنرێ: نیشان دەدرێ، پیشان دەدرێ، دەردەخرێ.
ڕادەچڵەکاند: وەخەبەر دێنا، وەئاگا دێنا، رادەپەڕاند.
ڕاسێ: بیەوێ شاڵاوی بۆ بەرێ، بیەوێ پەلاماری بدات، دەست بۆ لێدان بەرزکاتەوە.
ڕاستبۆوە: هەستایە سەرپێ، ڕاپەڕی، راپسکووت.
ڕانێین: ، رانوێنین، جێ بەجێ بکەین.
ڕادەقەنێی: دەکەوی، دەڕووخێی، بەلادادێی، بەردەبیەوە.
ڕانا: نیشاندا، ئەنجامدا، کرد، خست، کەواند.
ڕاپسکووت: بە هەموو توانای هەوڵی دا هەستێ و دەرچێ، بەپەلە دەرچوون بۆ کارێك، خۆی ڕاپسکاند.
ڕایان هێشت: تخێڵیان کرد، خستیان، لە عەرزێیان دا، کەواندیان.
ڕابێ: راپەڕێ.

ڕەژوو: رەژی، خەڵووز.

ڕەش بوونەوە: نەمان، کۆتاییان پێ هات.

ڕەپێچەك دان: لێك هاڵاندن، تێکەوە پێچان، خڕکردنەوە.

ڕەند: مەرد، چاك.

ڕەوە: پۆل (رەوە کەو، رەوە کۆتر).

ڕەوەند: کۆچەر، ئەوکەسەی گەرمێن و کوێستان دەکات.

ڕەشکە: لە مووی بزن دروست دەکرێ و (کا)ی تێدەکرێ و کون کونە، ڕەشکە: تۆمەیەکی دەنك ڕەشە.

ڕۆچوو: نقوم بوو، نغرۆ بوو: رۆیشتەخوارێ.

ڕۆنەنیشێ: دانەنیشێ، دانەسەکنێ.

ڕۆیناوم: داینا‌وم، نیشتەجێی کردووم، خستوومیەسەر.

ڕۆنیشتن: دانیشتن.

ڕۆی بوونێ: رۆی هاتنێ، دای هاتنێ، پەلاماریان دا.

ڕۆچێ: نقوم بێ، بە عەرزێدا بچێتە خوارێ.

ڕووشان: دروستبوونی شوێنەوار لەسەر پێست.

ڕێچکە: کوێرەڕێ، رێچکەڵە.

ڕێ دەکەم: رێگا دەبڕم، دەڕۆم.

ڕێکدا: پێچایەوە، لووشدا.

ڕێ دەکا: رێگا دەبڕێ، دەڕوا، دەبات.

ڕێم ماشت: پەلامارم دا، ئامبازی بووم، هەڵمکوتایە سەرێ، رامالْم بۆ برد، شالاوم بۆ برد.

ڕشت بێ: مکوڕبێ، دەست گەرم بێ.

## ز

زەقەی چاوانیان بووە: تەماشایان دەکرد، چاوەڕوان بوون. چاوەڕوانیەکی تا ئەوپەڕی بێدەسەڵاتی.

زەروو: ، زێروو، گیاندارێکی خوێنمژە، لەهەندێك ئاودا هەیە.

زەردەپەڕ: گزنگ، سەرەتای خۆرهەڵاتن، سەرەتای خۆرئاوابوون.

زەرگ: شیش، ئاسنێکی نووك تیژە.

زەندۆڵ: دۆڵ، شیوی قوڵ، خەڕەند، .

زەنگاڵ: پووزەوانە، ساق.

زەنگوڵ: زەنگڵ، بە ملی بزن و مەڕەوە دەخرێ و دەنگێکی خۆشی هەیە.

زەڕێ دا: زەرەرێ دا، زیان بدات (ماڵات کە چۆ نێو کشتوکاڵ و زیانی لێ دا، دەڵێن: زەڕی کردووە).

زێلوو: زاڵوو، هەزار پێ.

زیتەڵ: زرینگ، زیرەك، وریا، وشت.

زیزانە: گیایەکی تاڵ و بێ کەڵکە لەنێو دەغڵان دەڕوێ.

زیوان: بەهەموو ئەو تۆمە زیادانەی ناو دانەوێڵە دەگوترێ.

## ژ

ژوار: ئازار، ژان.

## س

ساو: هەساو، ساماڵ، ئاسمانی شین و بێ هەور.

ساتۆر: جۆرە چەقۆیەکە  نانوشتێتەوە، کێرد، چەپەجاخ.

سەڕاب: تراویلکە.

سەرانگوێلك: سەرگوێلك، سەرگوفك، زبڵدان، گوفەك.

سەرکوێزر: ئەوەیە کە لەکاتی دابێژرانی دانەوێڵەدا دەمێنێتەوە.

سەپانی پووشیێ: دەست بەتاڵ، مایە پووچ، هیچ پێ نەبڕاو.

سهرهخهر: سەرەڕۆ، بێ عەقڵ، لاسار، ملهوڕ.

سەراسوێ: سۆراغ کردن، چاولێگێڕان و لێڕوانین لە شوێنی بەرزەوە.

سوعبەت: گەمە، گاڵتە.

سووربوون: مکوڕبوون، پێداگری کردن.

سووت و سوێ: بریسکە کردنی برین، ئازار و ناڕەحەتی، ژوار.

سوورێژە، سۆرکە، سووژە، سیرۆژە.

سووکەڵە: بێ سەنگ و ڕێز، بوودەڵە.

سێرە: جاسووس، سێرەلێگرتن، جاسووس لێگرتن، چاوخستنەسەر

سێ بەندە: بەشی خوارەوەی بڕبڕەی پشت.

سێنا: سانا، ئاسان.

سروێك: سروەیەك، شنەیەك، (شنەبا)، هەست و خوستێك.

ستار دەگرێ: قەرار دەگرێ، ڕادەوەستێ.

سپات نەبنەوە، کاڵ نەبنەوە، رەنگیان نەڕوا، سپی نەبنەوە.

سپات نابێتەوە، کاڵ نابێتەوە، رەنگی ناڕوات، سپی نابێتەوە.

جاسووسی چەك بۆ لێدانی نیشانە و ئامانج.

سن: زیندەوەرێکی باڵداری بۆن ناخۆشە، زیانی زۆر بەگەڵیشەی گەنم و جۆ دەگەیەنێ.

## ش

شادە: شەهادە، گەواهی، شایەتمان.

شاگەشکە: لەخۆبوونەوە لە خۆشیان، زۆر خۆشحاڵ.

شەقار شەقار: دابڕ دابڕ، بەش بەش، قەڵش قەڵش.

شەمزاندن: گەچلاندن، تێکدان و شێواندن.

شەوی ئەنگوستەچاو: شەوەزەنگ، شەوی دەیجوور، تاریك و تەڵەم، لەبەر تاریکی چاو چاوی نەبینێ.

شەپ و گوپ: خواردن و بەولاولا دادان، جووڵانەوەی بەحەز و ئارەزوو و بێ لێپێچانەوە، تەخشان و پەخشان.

شەوچەرە: شەوچەلە، ئەو شتانەی وەکو گوێز و مێووژ کە شەوانە دەخورێن.

شەپرێو: پەرپووت، بێ حاڵ و باڵ، لەبەرێك هەڵوەشاو.

شۆفار: ناحەز، دوژمن، (شەیتان و شۆفار) شۆفاری کردن: شەیتانی کردن، دووزمان.

شرم کردن: شەپرێوم کردن، بەدەردێکی خراپم بردن، خراپم پێ کردن، خراپم بەسەر هێنان، کەوڵم کردن.

شینایی: شیناورد، کشتوکاڵ، زەراعەت.

## ع

عاسێ: سەخت، ئەستەم.

عەزازیل: ڕووحی شەڕانی و پیس، کەسی زۆر ئاشووبگێڕ و فێڵباز، بەمانای شەیتانیش هاتووە.

## غ

غەوغا: دەنگەدەنگ، غەڵبە غەڵب، قەڵەقەڵ.

## ف

فاك و فيك: هاش و هوش.

فەرهود: تالآن و برۆ.

فەل: نەپێچراوە، هەڵەڕژاو، پێچەوانەی سەرمۆر.

فس فس پاڵەوان: خۆ بەپاڵەوان زان، کەسێك قسەی گەورە گەورە و کەش و فشی زۆر دەکات و واش نییە، پێی دەڵێن: فس فس پاڵەوان، فسۆس پاڵەوان.

فیراریی: راکردن ، قوچاندن، هەڵاتن، خۆدەربازکردن لە سەربازیی.

فیتوو: (فیتوولێدان) دەنگێکە بە لێوان دەردەبڕدرێت ( فیتوو بەبرالەی بێ لێو ناسپێرێ)! پەند.

فت: رۆیی، لەدەست چوو، تەرك، فت کرا: لابرا.

## ق

قەڵداسوو: داسوو، بە گوڵی گەنم و جۆوەیە و درە.

قەڵس: تووڕە، عاجز، زیز.

قەلۆش: مایەپووچ.

قەرسیل: دەغڵی تازە شین بوو، (قەرسیلی هێناوەتە پشتێندێ)! پەند.

قەرەچەناغ: چەنەباز، بێ عار، زۆر بلێ.

قوژبن: گۆشە، بناهوون، سیلە.

قوشقی: قولاغ، لەسەر هەست.

قیت بێتەوە: راست بێتەوە، هەستێ.

کاولەخانوو: خانووی روخاو، کەلاوە، وێرانە.

کالان: کیفی خەنجەر و شمشێر و تیغ (تیغی رەسەن خۆ لەکالانێ دا راناگری) پەند.

کامووسك: کامووس، کابووس، (ترسان و حاڵەتێکی زۆر ناخۆشە لەخەودا).

کاوێژ: هێنانەوە و جوینەوەی خواردنی قوتدراو لەلایەن ماڵاتەوە.

کەرسەك: کەستەك، سندەگڵ، گڵی بەیەکەوە نووساو.

کەڕەگەڵ: گەڵ و گاش، گەڵای وەریوی دار و درەخت.

کەتن: تاوان، قەباحەت.

کەروێشکەی گەنم: ئەوکاتەی بای لێدەدات و شەپۆل دەدات.

کەڵەگەت: باڵابەرز، بڵند.

کەڕەمسۆ: بێ گوێ، نەبیستی بە ئەنقەست.

کەزی: پرچی وەنراوە، پرچ، ئەگریجە.

کەنوو: پێکەنین، خەنین.

کەویی: ماڵی، دەستەمۆ، ڕام.

کەودەن: سووکەڵە، گێل.

کەمرە: چڵك و گوناه، یاخود ریخی ماڵات کە زۆر کەوتە سەریەك، پێی دەگوترێ (کەمرە)(کەمرەی بەستووە).

کۆساران: شاخان، نێو چیایان.

کێرد: ساتۆر، جۆرێکە لەچەقۆ کە نانوشتێتەوە.

کت و مت: دەقاو دەق، تیبقەل ئەسڵ، وەك خۆی، عەینەن شت.

کریا: کرا، ئەنجامدرا. جێ بەجێ کرا.

کڕ: بێدەنگ، بێ هەست. (مریشك لەسەر هێلکە کڕ دەبێ).

## گ

گەماڵ: (سەگ، کسۆك، سە)ی نێر، گۆڵە سەگ.

گەڕیدە: گەڕۆك، گەشتیار، گەڕاو(لەزۆر گەڕاوان بپرسە نەك لەزۆر ژیاوان)پەند.

گەلحۆ: گێل، هێڕ.

گەشکە دەگرم: ئەوپەڕی خۆشحاڵ دەبم.

گەڕ: گێچەڵ.

گەنی: ڕزی، بۆگە بوو، بۆگەن بوو.

گۆشن: پەروەردەن، گەورەکراون.

گوێ لەمست: نۆکەر، بەکرێ گیراو.

گورگەمێش: سەگێك کە بزن و مێگەلەکەی خۆی دەخوات.

گورگێ: گرگوێ،کلکوێ، گیایەکی بەر تاڵە و لەنێو دەغڵاندا دەڕوێ.

گۆنگەڵ: سەیرو سوعبەت و بەزمی کۆمەڵە خەڵکێك، بەزم و هەرا و ئاژاوە، فلیم و فەرتەنە، ئاڵۆزی، گۆڵمەز.

گێڕ: خوار و خێچ، شەپرێو.

گڕوگاڵ: غڵدە غڵد، منداڵ کەتازە دەکەوێتە دەنگ.

گیاکەڵە: گورگە، ئەو گیایەی لەنێو شینایبدا دەڕوێ و زیانی لێ دەداو لەنێوی دەبات.

## ل

لەگەروێ نا: لە بینێ نا، لە قوڕگێ نا: لە گەردنێ نا، لە ئەوکێ نا.

لەسەروبەندی: لەسەروحەدی، لە کات و ساتی.

لەیەك ئانا: لەیەك کاتا، لەیەك ساتا.

له هه‌رادان:  لیّ له‌هه‌ریادان، لیّ له‌هه‌ڵلآدان، ده‌هۆڵ له‌دوو کوتان، ده‌نگ لیّ هێنان.

له‌خۆم ڕا: له‌خۆمه‌وه‌، له‌منه‌وه‌.

له‌به‌ریّ خۆوه‌: له‌به‌رخۆوه‌، خودبه‌خود، لای خۆیه‌وه‌، له‌خۆڕا.

له‌سه‌ر سه‌ری تۆ ده‌گه‌ڕێم: خۆمت فیدا ده‌که‌م، ده‌بمه‌ به‌لآگێڕت، له‌ ده‌ورت ده‌گه‌ڕێم، قوربانت ده‌بم.

له‌بره‌وه‌: له‌پێشه‌، له‌ فراژوو بووندایه‌، له‌ نه‌شونما دایه‌.

له‌دوودان: له‌دووچوون، له‌سه‌رگوتن، له‌سه‌ر رۆیشتن، درێژه‌دان به‌باسکردنی شتێك.

له‌وگۆڕه‌: له‌ جێوه‌، له‌ومه‌یدانه‌، به‌ئاشکرا.

له‌منت که‌ویّ: له‌ رووحی منت که‌ویّ، بۆ هاندان به‌کار ده‌هێنریّ.

له‌سه‌رێك که‌ڵه‌که‌بوون: که‌وتنه‌سه‌رێك.

له‌کن: له‌لا.

لوێچ: گرتنه‌وه‌ی ناو له‌پی ده‌ستێك (لوێچێك ئارد).

لێڕه‌وار: دارستان.

لێك هه‌لآوێره‌: ، لێك هه‌لآوێژه‌، لێك جیابکه‌وه‌.

لێکرۆژت: لێوی لیّ کرۆژت، کینایه‌یه‌ له‌زۆر قه‌ڵس بوونی که‌سێك له‌ که‌سێکی دیکه‌.

لێخن: لێڵ، قوڕاو، لیّ بخه‌ن، لابه‌ن.

لێواولێو: لێوان لێو، لێوڕێژ، پڕاوپڕ.

لینگه‌ و قووچ: سه‌ره‌وبن، ئاوه‌ژوو.

لیچ داژه‌نین: سه‌رده‌به‌رخۆنان، سه‌رده‌قالان نان، دۆش دامان.

## م

ماك: سەرچاوە، بنەڕەت.

مالّم هەقە: بەراستی، ئینسان هەقیّ بلّیّ، بە هەقیقەت.

ماوا: جێگا، شوێن، مەئوا.

مەسخەرە: مایەی پیّ رابواردن، مایەی قومار پێکردن، گالّتەجاڕ.

مە: ئێمە.

مەیسەر بیّ: حاسلّ بیّ، وەدەست بیّ، بێتەدی، بەردەست بیّ.

مەلّۆ: سوالّە، هەندێك دەغلّ یان گیای درواوی لەسەر یەك دانراو.

مەشکە: لە پێستی مەڕ و بزن دروست دەکریّ و دۆی تێدا دەژێنریّ.

مەلّۆ مەلّۆ: کۆ کۆ،کۆمەلّ کۆمەلّ.

مێو و ڕۆن: نەرم و نۆلّ، نەرم و نیان.

مێگەل: ڕان، ڕانە مەڕ و ڕانە بزن.

مۆن: مۆن و مرچ، گرژ، ڕووترش، ڕەزاگران.

مڕ بوو ون: مەست بوو ون.

مرۆ: مرۆڤ، ئادەمیزاد.

ملۆزم: داوێن گیر، لەیەخە نەبوونەوە، بوونە دڕوو، لێم بۆتە ملۆزم: (لێم بۆتە دڕکی مەم وزینان)، لەزگە.

## ن

نەداونیّ: پیّ نەداون.

نەمپێکابیّ: نەم ئەنگاوتبیّ، لێم نەدابیّ.

نەخسی: نالەباریی، چەمووشیی، ناڕەسەنیی، شوومیی، خراپیی.

نەتاسیّ: سەرسام نەبیّ، واقی وڕنەمێنیّ.

نەپژێ: گۆنەکات، نەیەتە قسە.

نەخس: نەگبەت، نالەبار، ناڕەسەن، شووم، خراپ.

نەلەخشێ: نەخلیسکێ، نەخزێ.

نەفوورات: بێڕەزا، کەسێك کە لەشتێکدا تێی پەڕاندبێ.

نووتەك: تاریك.

نوێڵ: لەنگە، باریە. پارچە ئاسنێکی قایمی درێژە بۆ بەرد هەڵکەندن بەکار دێ.

نسار: نسێ، سێبەر.

نقورچە: سیخورمە، پەنجەدان لە کەلەکە.

نیسکی بێ بەر و پشت: بێ بەندوبار، نەگونجاو، چەتوون.

نیهان: شاراوە، پەنهان، بزر، ون.

نیخەنیخ: پشووسواری و هاشەهاش لێ هاتن لەبەر ماندووبوون، یان نەخۆشی.

## هـ

هات و نەهات: دڵنیانەبوون لە قازانج و خێر، لە سەرەنجام. (ڕێی هات و نەهاتی گرتۆتە بەر).

هاتەگۆڕ: سەری هەڵدا، پەیدابوو.

هاڵاو: هەڵمەتووك، دانەوەی تینی گەرما.

هەڵەنگووتن: ساتمەبردن.

هەڵمان نەلووشێ: قووتمان نەدا.

هەڵکورماوە: هەڵنیشتوە.

هەربوو: ئەزەلی، بێ سەرەتا.

هەڵنەگەڕێ: هەڵنەبزرکێت. شیر کە هەڵگەڕا نابێتە ماست.

هەتڵە نەبێ: لاڕێ نەبێ، لانەدا، تێنەپەڕێت.

هەڵەت: سەخت و هەڵدێر.

هەرێ لەبرێ ناکاتەوە: هیچ لەهیچ نازانێ، سەری لێ دەرناچێ.

هەڵا: هەرا، ئاڵۆزیی ، بێ سەرو بەریی، فەوزا، هاتوهاوار، ئاژاوە.

هەراش و شڕ: پیس و شڕ، بەرەڵا.

هەچی دێ: هەرچی دێ.

هەوت: گێژ، وڕ، کاس.

هەگبە: کۆڵ، تێلەکە.

هێڕ: هەوت، گێژ، تاساو.

هروژم: شاڵاو، پەلامار.

هڕۆڵ: بنکۆڵ کراو، شیرازە تێکچوو.

## و

وادە: کات، وەخت، دەم.

وان: ئەوان. وان: دەریاچە و شارێکە لە باکوری کوردستان.

واقی وڕماوە: سەری سوڕماوە، حەپەساوە.

وادە: پەیمان، بەڵێن.

وەرێنێ: وەربێنێ، لێ بئاڵێنێ.

وەتاوێن: بتوێنەوە.

وەپێچن: تێکەوە پێچن، خڕبکەنەوە، لێ نێن.

وە: ئێوە.

وەرد: زەوی کێڵراو.

وێك نا: پێکەوەنا، داخستەوە.

وڕێنە: قسە بزرکاندن، خەیاڵ پڵاو، بزران.

وڕبوون: هێڕبوون، تاسان.

وەرێناوە: لێداوە، لیٚ ئاڵاندووە. وەرێنا: ئامێزی لیٚ وەرێنا، باوەشی لێدا.

وشکارۆ: تینوو، بیٚ ئاو، دێمەکار.

ونجڕ، ونجڕ: پارچە پارچە، هەپرون بە هەپرون، هەلا هەلا، ئەنجن ئەنجن.

## ی

یەک دەست: یەک دەنگ، بەیەکەوە، پێکەوە.

# ناوەرۆك

## قەڵادزێ و تراژیدیا و هەرەسی دیکتاتۆریەت



## خۆشەویستی خۆشەویست

## مەدالیای کودستان

## مەشخەڵی بەرەنگاری



هەر نیشتمانێ، هەر شوێنێ
دەستی ستەم
کارەساتی بەسەر دێنێ
شوێنی منە
یاخود هەر دڵۆپە خوێنێ
دەستی ستەم
لە هەر مەزلومێك دەیڕژێنێ
خوێنی منە
دەیلێمەوە...
زمانم سروود و پەیامی،
چەوساوەکان دەڵێتەوە
گەر وانەبووم...!
ئەی نیشتمان!!
حاشام لێ کەو
سەرم بخە ژێرپێتەوە.

# SHARIF WARZERS COLLECTIVE WORKS OF A POET

SHVAN Printing House

نرخ: 12000 هەزار